زنجیرە دەرسی

# ئیمان وعەقیدەی ئیسلامی

## لەبەر ڕۆشنایی قورئان وسوننەتدا

بەرگی یەکەم

## ئیمان وعەقیدەی ئیسلامی

## چی یە وچۆنە ؟!

**- 1**

عەلی باپیر



بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

| | |
|---|---|
| ناوی کتێـــب: | زنجیرە دەرسی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا - ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی چیەو چۆنە ؟! |
| نـوســـــەر: | علی باپیر |
| بـڵاوکردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر |
| خـــــە ت: | نەوزاد کۆیی |
| بـــــەرگ : | أمین مخلص |
| نۆرە و ساڵی چاپ: | یەکەم 1427ك – 2006ز |
| چـاپکـــردن: | چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر |
| تـــــیراژ: | 3000 دانە |

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (468) ی ساڵی 2006 دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

زنجیـــرە دەرسی

# ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی
# لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا

## بەرگی یەکـــەم

## ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی چی یە و چۆنە؟!

1 تـــا 12



1427ك 2006ز



**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَ رَسُـولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَـابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمْ الصَّادِقُونَ.**

**(الحجرات 15)**

# پێشکەش بێ

بەو مسوڵمانانەی کە هەمیشە هەوڵی وەدەست هێنانی ئیمان و عەقیدەی کامڵتر دەدەن بەهۆی بیر کردنەوەی قووڵتر وزیکری بەردەوام تر و کردەوەی چاکتر و پارێزکردنی زیاترەوە.

# پێشـەکی ئەم زنجیرە دەرسە

**الحمد لله رب العالمين وصلى الله تعالى على سيدنا محمد واله اجمعين من الصّحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان الى يوم الدين.**

بەڕێزان !

ئەم کتێبـەی بەردەستان بەرگی یەکەمە لە زنجیرە وانـەی : (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا) کە لە ساڵی 1421ك/ 2000 ز لە یەکێك لە مزگەوتەکانی شاری هەڵەبجەدا گوتراون و سەرجەم پەنجا وانەیە

جا ئەم بەرگی یەکەمە بەشی یەکەمی ئەو زنجیرە دەرسەی گرتۆتە خۆی بە ناوونیشـانی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چی‌یە وچۆنە ؟!)، کە سەرجەم دوازدە دەرسەو، خوا یار بێ بەشەکانی دیکەش لە بەرگەکانی داهاتوودا بەڕیز بە دوای یەکدا دێن و چاپ دەکرێن.

جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە ژێر ناوونیشانی:(ڕێ خۆشکردنێکی گشتی) و (چەند ڕوونکردنەوەیەکی پێویست)دا تا ڕادەیەکی باش پێناسەی ئەم زنجیرە دەرسەمان کردوە و باسی نێوەڕۆکەکەیمان کردوە، لێرەدا بە پێویستی نازانم لەو بارەوە بدوێم، بەڵام هەر بە کورتی دەڵێم:

سوپاس بۆ خوای بەخشـەر و لـێی بەزیـاد بێت ئێستاکە کۆمەڵگای کوردستانمان کە خوای دەرووکەرەوە ساڵانێکە لە گەلێك ڕووەوە دەرووی خێری

لـێکردۆتەوە، شێلگیرانە سەرگەرمی هەوڵ و کۆششە - بە تایبەتی چینی گەنج و تازە پێگەیشتووی - بۆ لێتێگەیشتنی ئیسلام و پێوەپابەند بوونی بە شێوەیەکی زانستی یانە و هۆشیارانە و دوور لە لاساکردنەوە و شوێنکەوتنی کوێرانە، ئاشکراشە کە ئیمان بناغەی کردەوەی چاك (العمل الصالح)ەو، عەقیدە بنەڕەتی شەریعەتە، بۆیە پێویستە هەرچی زیاتر هەوڵی پێناسە کردن و خستنە ڕووی ئیمان و عەقیدەی ڕاست و دروستی ئیسلامی بدەین بۆ ئەوەی خوا پشتیوان بێ تاکەکانی کۆمەڵگاکەمان لەسەر بناغەی ئیمان دیواری کردەوە باشەکانی هەڵچنن و، کۆمەڵگاکەشمان بە گشتی و بە تێکڕا و وێکڕا کۆشکی جێبەجێ کردنی شەریعەت (تطبيق الشريعة) لەسەر بناغەی عەقیدە بنیات بنێن و بەرز بکەنەوە و سەرەنجام بەختەوەری و عیززەتمەندیی ئەم دنیایە و سەرفرازیی و ڕزگاریی دوا ڕۆژیش بۆ خۆمان مسۆگەر بکەین.

ئومێدیشم وایە ئەم زنجیرە دەرسە بە هەموو بەشەکانییەوە بتوانێ ڕۆڵێکی گەورە وکاریگەر لەو بوارەدا بگێڕێ وببێتە مایەی زیاتر بەرچاو ڕوونکردنەوەی مسوڵمانانی کوردستان بە گشتی و گەنج و لاوو تازە پێگەیشتووەکانمان - بە کوڕ و کچەوە - بە تایبەت. لە بواری ناسین و شارەزا بوونی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییان کە بناغە و ڕەگ و ڕیشەی مسوڵمانەتی و دینداریيانە.

دڵنیاشم کە هەر کەسێك بتوانێ ئەم زنجیرە دەرسە پەنجا ئاڵقەییە وەك خۆیان فام بکات وهەزم بکات، تێگەیشتنێکی ڕاســـت و دروستی دەربارەی ئیمان و عەقیدە دەســـتگیـــر دەبێ و، بە ئەندازەی تەفاعول کردنیشی لەگەڵ نێوەڕۆکەکەیان داو، لە خۆدا کردنە حاڵی حاڵیبوونەکەیشی، خوا پشتیوان بێ بناغە و بنەڕەتێکی قایم و مەحکەمی مسوڵمانەتیی بۆ خۆی دادەڕێژێ.

**خوایە تۆ دەوڵەمەندی و ئێمەش نەدار، بەخششی تۆ بێ سنوورە و ئێمەش تا بڵێی ئاتاج، سا بە کەڕەم و لوتفی بێ وێنەی خۆت هێندەمان لە بەزەیی و بەخشش و بەرەکەتی خۆت بەسەردا بڕێژە تاکو لە غەیری خۆتمان بێ منەت و بێ نیاز دەکەی و، پڕ بە دڵ دەڵێین: ئۆخەی !**

16/صفر/1427

2006/3/16

**هەولێر**

# سوپاس و پێزانین

لەبەر ڕۆشنایی فەرمایشتی: (**لا یشکر الله من لا یشکر الناس**) رواه البیهقي. واتە: کەسێك سوپاسی خەڵکی نەکات سوپاسی خواش ناکات، وە فەرمایشتی : (**مَنْ أُبلي بلاءً فذكرَهُ فقد شكره وان كَتَمه فقد كَفَرَهُ**) دا ، رواه ابو داود و صححّه الالباني[1] واتە هەر کەسێك چاکەیەکی لەگەڵ کرا ئەگەر باسی کردو لە یادی بوو، ئەوە سوپاسی خاوەنەکەی کردوە، بەڵام ئەگەر شـــــاردیەوە و باسی نەکرد ئەوە سپڵەیی و بێ ئەمەگیی بەرانبەر کردوە، بە پێویستی دەزانم بەر لە هەر شـــــتێك لە ناخی دڵمەوە ســـوپاس و پێزانینـــی شایســـتە ئاڕاستەی هەموو ئەو برا دڵســـــۆزانە بکەم کە بە شێوەیەك لە شێوەکان هاوکارییان کردووم لە تۆمار کردن و ڕێکخستن و نووسینەوە و ئامادە کردنی ئەم زنجیرە دەرسەدا، بە تایبەتی ئەم پێنج برایە:

یەکەم: کاك (مەلا بلال پیرۆت قەڵادزەیی) کە وەك خۆی گوتوویەتی چەند مانگێك شەوو ڕۆژی پێکەوە گرێ داون تاکو سەرجەم ئەم پەنجا (50) دەرسەی لە کاسێتەوە هێناوەتە سەر ڤافەز و بگرە گەلێك جار خۆی بە داڕشتنەوە و ڕێکخستنی وشە و تەعبیرەکانیشەوە خەریك کردوە و تەنها بە نووسینەوەی ڕووت وازی نەهێناوە !

دووەم: کاك (محسن زمناکۆیی) کە سەرجەم ئەو پەنجا دەرسەی بێ پسانەوە بە کامێرایی ڤیدیۆ تۆمار کردوە و ئەرك و ماندوو بوونێکی زۆری کێشاوە.

---

(1) بڕوانە : (سلسلة الأحاديث الصحيحة) ي شيخ محمد ناصر الدين الألباني، ج2 ص 182.

سێیەم: کاك (نـەژاد احمد فتاح) کە وەك عادەتی هەمیشـەیی خۆی زۆر دڵسۆزانەو لێبڕاوانە وێڕای وەئەستۆ گرتنی تۆمار کردنی ئەم زنجیرە دەرسە بە تەسجیل "مُسَجِّل" مشـووری زۆربەی ئیش و کارەکـانی دیکەیشی خواردوە.

چوارەم: کاك (دڵشاد سـۆرانی) کە وەك نوێنەری مەکتەبی ڕێکخسـتن زۆر چالاکانە و لێزانانە مشووری ڕێکخسـتنی کاروباری خولەکە[2] و ڕێك و پێك کردنی ئامادەبووانی خوارد و ڕۆڵێکـی گرنگـی لە سەرکەوتووانە کۆتایی پێ هێنانی خولەکەدا گێڕا.

پێنجەم: کاك (ابراهیم باپیـر) کە هەموو ئەو پەنجا دەرسەی پاش ڕێکخستن و صاف کردن بە کۆمپیوتەر، لە کاسێتی ئاسایی (VHS) یەوە خستۆتە سەر کاسێتی سیدی (SVCD) وە نزیکەی چل (40) نوسخەی لەسەر حیسابی خۆی لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا لێ بڵاو کردۆتەوە.

خوا پاداشتی هەرە چاکی هەموویان بداتەوە و هەمیشە صالح و شاد و ساغ و سەربەرزیان بکات.

هەروەها لە خوای بەرز و مەزن و بەخشندە داواکارم کە بە چاکترین شێوە پاداشتی تێکڕای ئەو برا و خوشکە دڵسۆزانەمان بداتەوە کە بەهەر شێوەیەك لە شێوەکان دەست و دەوریان هەبووە و هەیە لە تۆمار کردن و چاپ و بڵاو کردنەوەی بەرهەمەکانم دا[3].

(2) ئەو خولە لە مزگەوتی (شەهیدان)ی هەڵەبجە کرایەوە و لە ڕۆژی (4ی صفری 1421) تا (6ی ربیع الاول 1421) بەرانبەر (2000/5/8) تا (2000/6/8)ی خایاند.

(3) بە تایبەت برای دڵسۆز و گورج و گۆڵ و خۆشەویست کاك بێستوون موحەممەد کە بە خۆی و کامێرا ڤیدیۆیی کەیەوە هەردەم بۆ تۆمار کردنی وتار و دەرس و کۆڕەکانم ئامادەیە.

دیسان ئەو دڵسۆز و مشوور خۆرانەی کە دریغییان نەکردوە و نایکەن لە خستنە ڕووی تێبینی و پێشنیار و ڕەخنەی دڵسۆزانەیان دا کە بێگومان ئەو کارەیان دەبێتە مایەی بەهێز و پێزتر کردنی بەرهەمەکانم و وەك پێشینانیش گوتوویانە: (هەر یەکێکە کە بە سەهوو ناچێ!) وە لێرەشەوە ڕای دەگەیەنم کە بە زیندوویی و مردوویی لە هەر هەڵە و کەم و کوورِی یەك پەشیمانم کە لە بەرهەمێکم دا هەبێ، ئاشکراشە کە ئێمە هەر چاکە و خێرێکمان هەبێ لە خوای بەخشەر و شەریعەتە تێر و تەواوەکەیەوەیەتی و هەر کەم و کوورِیی و هەڵە و پەڵەیەکیشمان هەبێ لە خودی خۆمانەوەیە و بە هەوی نەفس و شەیتانەوەیە و بەرنامەی تێروتەواوی خوا سبحانە و تعالی لێی بەرییە .

شایانی باسیشە کە لەمێژە زۆرێك لە برا و خوشکانی بەڕێزمان داوای هەرچی زووتر چاپ کردنی ئەو زنجیرە دەرسە لە بەندە دەکەن بۆ ئەوەی دەرفەتی زیاتری بەهرە لێوەرگرتنیان بۆ برەخسێ و منیش لەبەر زێدە سەرقاڵی بۆم نەلواوە بەڵام ستایش بۆ خوا سبحانە و تعالی ئەوە ئێستا ئەو هەلەمان بۆ ڕەخسا، والحمد لله الذي تتم الصالحات بنعمته.

# ڕێ خۆش کردنێکی گشتی

پێناسەی زنجیرە دەرسی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوونەت دا:

خوێنەرە بەڕێز و خۆشەویستەکان .

زنجیرە دەرسی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی ژمارەیان پەنجا (50) دەرسە و بۆ پێنج بەشی سەرەکی دابەش بوون بەو شێوەیەی خوارەوە:

## بەشی یەکــەم: ئیمـــان و عەقیدەی ئیسـلامـیی چییـە و چۆنە؟!

جا ئەم بەشی یەکەمە کە بە بناغەی بەشـــەکانی دیکە دادەنرێ، لەم دوازدە (12) دەرسە پێك دێ:

1- پێناسەی ئیمان و عەقیدە لە ڕوانگەی زمانەوە و لە زاراوەی شەرع دا.
2- هەڵسەنگاندنی پێناسەی ئەهلی سوننەت و ئەهلی بیدعەت بۆ ئیمان.
3- پەیوەندی و جیاوازی نێوان ئیمان و ئیسلام.
4- کەم کردن و زیاد کردنی ئیمان و هۆکارەکانیان.
5- شایەتمان دەروازەی هاتنە نێو ئیمان و ئیسلام و کلیلی دەرگای بەهەشتە، چۆن و بۆچی؟!
6- هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان و شایەتمان.
7- هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان و شایەتمان.
8- هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام و شایەتمان.
9- گرنگی و کاریگەریی ئیمان و عەقیدە لە ژیانی ئینسان دا.
10- گرنگی و کاریگەریی ئیمان و عەقیدە لە ژیانی ئینسان دا.
11- کاریگەریی ئیمان و عەقیدە لە پێگەیاندن و بنیاتنـــانی کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی ساغ و تۆکمەدا.
12- کاریگەریی ئیمان و عەقیدە لە پێگەیاندن و بنیاتنـــانی کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی ساغ و تۆکمەدا.

کەواتە: ئەم دوازدە دەرســە سەرجەم تەرخان کراون بۆ توێژینەوە و ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای ئیمان و مەسەلە و بابەتە پەیوەندی دارەکانی.

## بەشی دووەم: خوا بە یەکگرتن و هاوبەش بۆ خوا دانان (التوحيد والشرك)

ئەم بەشەی دووەمەش کە گەورەترین وگرنگترین بەشی ئەم زنجیرە دەرسەیە سەرجەم بیست و چوار (24) دەرسە و هەرسێك جۆرەکانی خوا بە یەکگرتن (توحید)ی تێدا توێژراونەوە، کە بریتین لە :

أ- خوا بە یەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتیدا (توحيد الله في الخالقية والربوبية).

ب- خوا بە یەکگرتن لە ناو و سیفەتەکان دا (توحيد الله في الأسماء و الصفات) .

ت- خوا بە یەکگرتن لە پەرستراوێتیدا (توحيد الله في الألوهية) .

جا شایانی باسە کە پێنج دەرسی یەکەمی ئەم بەشی دووەمە لە بارەی: (ڕێباز و چۆنیەتی وەدەست هێنانی زانیاری و زانست)ەوەن، کە بە تیۆری زانست (نظرية المعرفة) یان (ئەبستمولۆژیا) ناو دەبرێ، حیکمەتی پێش خستنی ئەو بابەتەش ئەوە بوو کە سەرەتا پێویستە ئینسان تەرازوو و پێوەرێکی ڕاست و دروستی بەدەستەوە بێ ئەوجار بچێتە سەرباس و توێژینەوە لە بارەی پەروەردگارێتی و پەرستراوێتی و ناووسیفەتە بەرز و بێ وێنەکانی خوای پەروەردگار !

ناوونیشانی ئەو پێنج دەرسەش ئاوایە:

1- ڕێباز و چۆنیەتی وەدەست هێنانی زانیاری و زانست.
2- ڕێباز و چۆنیەتی وەدەست هێنانی زانیاری و زانست.
3- شت زانین و ناسینی مرۆڤ لە ڕوانگەی ئیسلامەوە.

4- وەحیی تەواوترین وڕاست ترین ڕێی وەدەست هێنانی زانیارییە بەگشتی و تاکە ڕێی ناسینی ئەو دیو سروشتە بە تایبەت.

5- ئایا ئیلهام و کەشـــف و خەون لە ئیسـلام دا تا چ ڕاددەیەك بۆ وەدەست هێنانی زانیاریی جێی متمانە و باوەڕن ؟!

پاشان دەرسی شەشەم وەك دەرسێکی سەربەخۆ تایبەت کراوە بە پێناسەی خوا بە یەککگرتن (التوحید) بە ناوو نیشانی :

6- خوا بە یەککگرتن بناغەی بەندایەتی بۆ خوا کردن و مسوڵمانەتییە و بێ دینایەتی وهاوبەش بۆ خوا دانان (الألحاد والشرك)یش پووچترین ئەفسانەو زلترین تاوانن.

ئینجا پاش ئەو شەش دەرسە کە وەك پێشەکی و ڕێ خۆشکردن وان بۆ ڕوون کردنەوەی خوا بە یەککگرتن بە گشتی بەهەرسێك جۆرەکانی یەوە ، ئەو جار نۆرە گەیشتۆتە سەر توێژینـەوەی جۆر و بەشـی یەکەمـی خوا بە یەککگرتن کە بریتییە لە: (خـوا بە یەککگرتن لە بەدیهێنـەرایەتی و پەروەردگاریێتیدا) کە سەرجەم هەشت (8) دەرسـی بۆ تەرخان کراون، چواریان بەم ناوونیشانە:

7- عەقڵ و زانسـت و فیتـرەت گەورەترین شـایەدی بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریێتی خوای بەرز و مەزنن.

أ- چۆنیەتی شایەدییدانی عەقڵ لەسەر بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریێتی خـوا.

8- ب- چۆنیەتی شـایەدیی دانی زانسـت لەسـەر بەدیهێنـەرایەتی و پەروەردگاریێتی خوا.

9- ج- چۆنیەتی شایەدیی دانی فیتڕەت لەسەر بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خوا.

10- چۆنیەتی شایەدیی دانی فیتڕەت لەسەر بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خوا.

پاشان چوار دەسەکەی دیکەشیان بەم ناوونیشانەن:

11- قورئان بەرزترین شێوازی ئیسپاتی بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خوای بێ وێنە و هاوتای تێدایە.

أ- قورئان لە ڕێی هەر کام لە پێنج هەستەکان و عەقڵ و فیترەتەوە ئینسان بەرەو خواناسیی دەجوولێنێ و زیادەی خۆیشی دەخاتە پاڵیان.

12- ب- قورئان هەمیشە پەروەردگارێتی خوا دەکاتە بەڵگەی تەنها پەرستراوێتی خوا.

13- ج- قورئان دەستی ئینسان دەگرێ ولەگەڵ دیاردە و دیمەنە واقیعییەکان دا ڕوو بە ڕووی دەکاتەوە.

14- د- قورئان دڵی مرۆڤ دەجوولێنێ و فیتڕەتی خەوتووی وەخەبەر دێنێ.

ئینجا نۆرەی توێژینەوەی جۆر و بەشی دووەمی خوا بەیەکگرتن هاتووە کە بریتییە لە : (خوا بە یەکگرتن لە ناوە هەرە چاکەکانی و سیفەتە هەرە بەرزەکانیدا) کە ئەمیش سەرجەم هەشت (8) دەرسی بۆ تەرخان کراون، کە چوار دەرسیان بەم ناوو نیشانانەی خوارەوەن و بە گشتی باسی ناووسیفەتەکانی خوای بێ وێنە و هاوەڵ دەکەن:

15- چۆنیەتی و گرنگیی ناسینی ناو و سیفەتە بەرز و بێ وێنەکانی خوا (جلّ جلاله) .

16- ده (10) تێبینی گرنگ دەربارەی ناو و سیفەتەكانی خوا (تبارك و تعالى).

17- بنچینەكانی عەقیدەی ئەهلی‌سوننەت لەبارەی ناوو سیفەتەكانی خواوە.

18- بنچینەكانی عەقیدەی ئەهلی‌سوننەت لە بارەی ناوو سیفەتەكانی خواوە.

ئینجا چوار دەرسیش لە ژێر ناوونیشانی گشتی:

(تەئویل كردنی هەندێك لە سیفەتەكانی خوا لە نێوان تێپەڕاندن و بەزایەدان دا) دا بەم ناوونیشانە هاتوون:

19- تەئویل چییە و كەی ڕەوایە و كەی ناڕەوایە ؟!

20- سیفەتە خەبەرییەكان لە نێوان تەئویل كران و بەرێ كران دا.

21- سیفەتە خەبەرییەكان چین و چەندن؟!

22- سێ جۆرە هەڵوێست لە بەرانبەر سیفەتە خەبەرییەكان دا.

ئینجا نۆرە گەیشتۆتە سەر ڕوونكردنەوەی جۆرو بەشی سێیەمی خوا بە یەككگرتن كە لە ڕاستیدا لە هەرسێك جۆر و بەشەكان گەورەترو گرنگترە و كێشە و تێك گیرانی پێغەمبەرانی خوا ﷺ و تاغووتەكان بە درێژایی مێژوو زیاتر و زیاتر لەسەر ئەم جۆر و بەشەی خوا بە یەككگرتن بووە، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە كە لە زۆربەی دەرسەكانی بەشی یەكەم داو لە گەلێك شوێنی دەرسەكانی دیكەش دا كەم و زۆر قسەی لێوە كراوە ئێمە لێرەدا هەروا بە كورتی و پوختی و لە دوو دەرسان دا باسی (خوا بە یەككگرتن لە پەرستراوێتیدا) مان كردوە بەم ناوونیشانە:

23- خوا بە یەككگرتن لە پەرستراوێتیدا (توحيد الله في الألوهية) .

24- هاوبەش بۆ خوا دانان (الإشراك بالله) .

لێرەش دا بەشـــی دووەمی زنجیرە دەرســـەکانی ئیمـــان و عەقیدەی ئیسلامیی کۆتایی پێ هاتووە و سەرەی بەشی سێیەم هاتووە.

## بەشی سـێیەم: فریشــتەکان وکتێبــەکان و پێغەمبــەران (علیهم الصلاة و السلام ) و قەزا و قەدەری خوا (تبارك و تعالى).

ئەم بەشی سێیەمەش لە پێنج دەرسان پێك هاتووە، بەم ناوونیشانانەی خـــوارەوە:

1- فریشتە چاك و پاك و بەڕێزەکانی خوا (تبارك و تعالى).

2- فریشتە چاك و پاك و بەڕێزەکان و کورتە پێناسەیەکی جند و شەیتان.

واتە ئەم دوو دەرسە تایبەتن بە باســـکردنی فریشـــتەکانەوە و، کورتـە پێناسەیەکی (جنّ) و(شـــیطان)یشـــیان ڕەگـــەڵ خراوە لە کۆتایی دەرسی دووەم دا.

دەرسی سێیەمی ئەم بەشەش تەرخان کراوە بۆ توێژینەوە لە بارەی کتێبە تێروتەواو و بێ هەڵەو پەڵەکانی خوای کاربەجـــێ و زانـــا و دادگـــەرەوە (سبحانه و تعالى) بە ناوو نیشانی:

3- کتێبە تێر و تەواوەکانی خوا چەندن و چۆنن و بۆچی نێرراونە خوار؟!

دەرسی چوارەمیش بۆ توێژینەوە لە بارەی پێغەمبەرانی پایە بەرزی خواوە ﷺ تەرخان کراوە بە ناوونیشانی:

4- پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) کێن وچەندن وبۆچی ڕەوانە کـــراون؟!

دەرسی پێنجەم و کۆتایی ئەم بەشی سێیەمەش بۆ ڕوونکردنەوەی قەزاو قەدەر تەرخان کراوە بە ناوونیشانی:

5- قەزاوقەدەری خوا(**جل جلاله**)چیە و چۆنە و پایەکانی ئیمان پێ هێنانی چەندن؟!

ئینجا سەرەی توێژینەوە گەیشتۆتە سەر بەشی چوارەم، کە بۆ لێکۆڵینەوە لە بارەی ڕۆژی دواییەوە تەرخان کراوە:

**بەشی چوارەم: ڕۆژی دوایی: پێشەکییەکانی، کارەساتەکانی**، سەرەنجامی

ئەم بەشەش لە پێنج دەرسان پێك هاتووە بەم ناوونیشانەی خوارەوە:

1- پێشەکییە تایبەتییەکانی ڕۆژی دوایی: مەرگ و گۆڕ و ژیانی بەرزەخ.
2- نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی:
   أ-  نیشانە بچووك و نزیکەکانی هاتنی قیامەت.
3- نیشانە گەورە و دوورەکانی هاتنی قیامەت.
4- کارەسات و ڕووداوەکانی ڕۆژی دوایی/ بەشی یەکەم.
5- کارەسات و ڕووداوەکانی ڕۆژی دوایی/ بەشی دووەم.

وە سەرەنجام نۆرەی بەشی پێنجەم و کۆتایی ئەم زنجیرە دەرسە هاتووە کە چەند نیشانەو تایبەتمەندیی گەورەو گرنگی عەقیدەیی و فیکریی مسوڵمانانی ڕەسەن و ڕاستەقینەی گرتوونە خۆی کە بە ئەهلی سوننەت و جەماعەت (أهل السنة والجماعة) شۆرەتیان دەرکردووەو شوێن پێی پێغەمبەری خوا ﷺ و چوار جێنشینە سەر ڕاستەکان (الخلفاء الراشدون الأربعة) و پێشینەی چاکیان هەڵگرتوە و هەڵدەگرن.

## بەشی پێنجەم: چەند تایبەتمەندییەکی عەقیدەیی و فیکریی مسوڵمانانی ڕاستەقینە.

ئەم بەشەش لە چوار دەرس پێك هاتووە، بەم ناوونیشانەی خوارەوە:

1- مسوڵمانانی ڕاستەقینە کۆمەڵێکی میانجی (وَسَطْ)ین لە نێوان تێپەڕاندن و بەزایەدان دا.
2- تەزکیەی نەفس و ڕێبازەکانی تەصەووف وهەڵسەنگاندنێکی دادگەرانە.
3- بە کافر دانان (التکفیر)بە بێ هاتنە دی مەرجەکان و لاچوونی پەرچەکانی (ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) دروست نیە.
4- پێنج درووشم و نیشانەی سەرەکیی ئەهلی سوننەت و جەماعەت.

بەم شێوەیەش کۆتایی بە زنجیرە دەرسی:
(ئیمان وعەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان وسوننەت دا) هاتووە.
بۆیەش بە پێویستم زانی کە بەر لەوەی بچینە سەر دەقی دەرسەکان و ئەو پێنج بەشەی کە پێکیان هێناون ئەم پێناسە گشتی یەیان بکەین، تاکو هەر لە بەراییەوە خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان بەرچاویان ڕوون بێت و بزانن کە ئەم زنجیرە پەنجا ئاڵقەییە چیەو چۆنەو لە کوێوە دەستی پێ کردوەو چۆن کۆتایی پێ هاتووە و چی وچی لە نێو خۆیەوە گرتوە !!
شایانی باسیشە کە ئەوەی لەم زنجیرە دەرسەدا هاتووە لە بارەی هەر مەسەلەو بابەتێکی ئیمان وعەقیدەوە، بە بۆچوون وتێگەیشتنی کۆتایی بەندە دادەنرێ و، لەهەر کتێب ونامیلکەو وتارێکی دیکەم دا شتێکی جیاواز لەوەی

ئێرەم گوتبێ‌و، نووسیبێ، پێویستە لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی ئێرەدا ڕاست بکرێتەوە[4].

## چەند ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

1- وەك پێشتریش ئاماژەمان پێ‌کردوە ئەم زنجیرە دەرسە کاتی خۆی بە هەردووك شێوەی ڤیدیۆیی و تەسجیلی تۆمار کراوە، ئێستاش لە خوای بەخشندە بەزیاد بێت ئەوە بەشێوەی سێیەمیش کە (چاپ)ە بڵاو دەکرێتەوە، کەواتە خوشك و برایانی بەڕێز دەتوانن بەهەر کام لەو سێ شێوەیە (بیستراو، بینراو، خوێنراوە) کە بۆیان مەیسەر دەبێ، لەو زنجیرە دەرسە بەهرەمەند ببن.

2- لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەم زنجیرە دەرسە کە پەنجا دەرسە و هەر کامێکیان سەعاتێکە بە چاپکراویی قەبارەیەکی گەورەیان دەبێ ئەگەر پێکەوە لە یەك کتێب دا چاپ بکرێن. هەروەها بۆ خوێنرانەوە و هەزم کردنیش بەسەریەکەوە زەحمەتە، وێڕای نرخی تێچوونی چاپ و پاشان کڕین و

(4) بۆ وێنە: لە کتێبی (مسوڵمانی کامڵ) بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسوڵمان،چاپی یەکەم 1997 لاپەڕە (313)دا هەروەها لە کتێبی (پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی) چاپی یەکەم 1996 – لاپەڕە (41)دا، لە کاتی پێناسە کردنی (ئیمان) دا کردەوەی ئەندامەکان (اعمال الجوارح) بە بەشێکی تەواوکەری ئیمان دانراوە نەك بە بەشێکی پێکهێنەری، بەڵام بێگومان ئەو ڕایە هەڵەیە و ڕای (مرجئة) کانیشە نەك هی ئەهلی سوننەت و سەلەفی صاڵحمان کە کردەوەیان بە مەرجی دروست بوون (شرط صحة) ی ئیمان و پێکهێنەرێکی بنەڕەتیی داناوە بەڵام سوپاس بۆ خوا لە کتێبی (خواناسی، ئایین، ئیمان)دا کە زۆریش لە پێش ئەو دوو کتێبەوە نووسیومە ڕای ڕاست و دروستی زانا و پێشەوایانی ئیسلامم لەو بارەوە پەسند کردوە، کە کردەوە بەشێکی پێکهێنەری ئیمانە.

فرۆشتنیش، بەڵێ لە سۆنگەی ئەو هۆکارانەوە بە پەسندم زانی کە لە چەند بەرگێك دا چاپی بکەین.

3- بۆ ئامادە کردنی ئەم زنجیرە دەرسە پشتم بە قورئان و سوننەت بەستوە و بۆ تێگەیشتنی ئایەتەکانی قورئانیش سوودم لە زۆربەی تەفسیرەکان - کە چنگم کەوتوون - وەرگرتوە، بە تایبەت:

1- (جامع البيان)ی الطبري.
2- (تفسير القرآن العظيم)ی ابن كثير.
3- (أحكام القرآن)ی القرطبي.
4- (فتح القدير)ی الشوكاني.
5- (محاسن التأويل)ی القاسمي.
6- (في ظلال القرآن)ی سيد قطب.
7- (الأساس في التفسير)ی سعيد حوى.
8- (أضواء البيان)ی الشَّنقيطي.

وە بۆ لێ تێگەیشتنی دەقەکانی سوننەتیش پشتم بە کتێبەکانی (شروح السنَّه) بەستوە بە تایبەت:

1- (فتح الباري)ی ابن حجر العسقلاني.
2- (شرح صحيح مسلم)ی النووي.
3- (شرح السنة)ی البغوي.
4- (العواصم والقواصم في الذبِّ عن سنة أبي القاسم)ی ابن الوزير اليماني.
5- (جامع العلوم والحكم)ی ابن رجب الحنبلي.
6- (سلسلة الأحاديث الصحيحة)ی الشيخ الألباني.

هەروەها کەم و زۆر کەڵکم لەم کتێب و سەرچاوانەش وەرگرتوە کە زۆربەیان تایبەتن بە توێژینەوە و خستنە ڕووی بابەت و مەسەلەکانی ئیمان و عەقیدەوە: [5]

1- (السُّنَّة)ی ابن أبي عاصم.
2- (الشريعة)ی الآجرِّي.
3- (شرح أصول إعتقاد اهل السنة والجماعة)ی اللاّلكائي.
4- (شرح العقيدة الطحاوية)ی ابن أبي العِزّ الحنفي.
5- (الأسماء والصفات)ی البيهقي.
6- (مجموع الفتاوى)ی ابن تيمية.
7- (الصّارم المسلول على شاتم الرسول)ی ابن تيمية.
8- (مدارج السالكين)ی ابن قيم الجوزية.
9- (العقيدة الإسلامية في القرآن الكريم ومناهج المتكلمين)ی د.محمد عياش الكبيسي.
10- (الصفات الخبرية بين المثبتين والمؤولين..)ی د.جابر زايد عيد السِّميري.
11- (نواقض الإيمان الإعتقادية)ی د.محمد بن عبدالله بن علي الوهيبي.
12- (معارج القبول)ی الحافظ الحكمي.
13- (ظاهرة الإرجاء في الفكر الإسلامي)ی د.سفر الحوالي.
14- (مصادر المعرفة في الفكر الديني والفلسفي دراسة نقدية في ضوء الإسلام)ی د.عبدالرحمن بن زيد .
15- (نظرية المعرفة بين القرآن والفلسفة)ی د.راجح عبدالحميد الكردي.

---

(5) دیارە کتێب و سەرچاوەی دیکەش هەن کە لێیان بەهرەمەند بووم و لە پەراوێزدا ئاماژەیان پێ کــــراوە.

16- (كلّيات رسائل النور)ی مەلا سەعیدی نۆرِسی.
17- (الطب محراب للإيمان)ی د. خالص جلبي كنجو.
18- (أسماء الله الحسنى)ی د. عمر سليمان الأشقر.

شایانی باسیشـــــە کە مەگەر چۆن دەنا هەر شتێکم بە شێوەیەکی تایبەت لە هەر کتێب و سەرچاوەیەك وەرگرتبێ ئاماژەم پێکردوە و ناوی کتێبەکە و نووسەرەکەی و بەرگ و لاپەڕەکەیشم دیاری کردوە.

4- بۆیە ئەم زنجیرە دەرسەم ناونا (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی) چونکە لە ڕاستیدا ئیمان و عەقیدە مادام ڕاستەوخۆ لە قورئان و سوننەت وەربگیرێ هیچ مەودای ڕاجیایی (إختلاف) تێدا نیە و پێشـــین و پاشـین (السَّلف و الخلف)یش ســـەرجەم یەك جۆرە ئیمان و عەقیدەیـــان بووە کە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییە بۆیە زیادکردنی هەر نازناوو ناو و نیشانێکی دیکە بۆ ئیمان و عەقیدە غەیری (ئیســـلامیی) شـــتێکی هەڵە و زیاد و بێ پاساوە.

حیکمەتی ئەوەش کە خوای کاربەجـــێ ئاییـــن و بەرنامەکەی خۆی وا هەڵخستوە کە لە بواری ئیمان وعەقیدەدا ڕاجیایی هەڵنەگرێ، بە پێچەوانەی لایەن و بوارەکانی دیکـــەوە، ئەوەیە کە ئیمان و عەقیدە ئەســـڵ و بنەڕەت و بناغەی ئیسلامە و پێویستە یەکجار ڕۆشن بێ و چەند و چوون و مشت و مڕ هەڵنەگرێ، هەر بۆیەش خوای کاربەجێ مەسەلەو بابەتە گەورە و گرنگەکانی ئیمان و عەقیدەی تەنانەت بۆ ســـــوننەتی پێغەمبەرەکەیشی ﷺ بەجێ نەهێشتوون و هەرچی لەو بارەوە پێویست بێ بگوترێ بۆ خۆی لە قورئانیدا زۆر بە ڕوونی وجەخـــت لەسەر کردنەوە فەرموویەتی و، بە شێوەیەك تیشکی خستۆتە سەر بابەت و مەسەلەکانی ئیمان و عەقیدە و نوختەی لەسەر پیت

داناوە کە پێویست بە قسە و ئیجتیهادی هیچ کەسێك نەکات و هەر بە ڕاستیش ئیمان و عەقیدە چونکە پەیوەندی بە خوای پەروەردگار و دوا ڕۆژ و باقی شتە پەنهان (غَیْب)ەکانەوە هەیە، بێجگە لە وەحی کە لە زانیاریی بێ سنووری خواوە سەرچاوە دەگرێ هیچ کەسی دیکە مافی قسە لە بارە کردنییەوە نیە.

ئەم ڕاستییەشم بۆیە خستە ڕوو تاکو هەموو لایەك بزانن کەوەسف کردنی ئیمان و عەقیدە جگە لە (ئیسلامیی) بەهەر وەسفێکی دیکە، وەك (سلفي)، (خلفي)، (أشعري)، (صوفي).... هتد هەڵەیە، چونکە ئیمان و عەقیدە کە بناغە و جەوهەری ئیسلامە وەك بابەت و مەسەلەکانی سیاسەتی شەرعیی و فیقهی هەڵس وکەوتەکان (فقه المعاملات) نیە کە ڕێگا و بواری ڕاجیایی و ئیجتیهاداتی جۆراو جۆری تێدا بێ و سەرەنجام وەك چۆن چەند جۆرە ئیجتیهادێکی فیقهیمان هەن ودەبن، وەك:(الأحناف)و(الشوافع)و(المالكيون)و(الحنابلة)و(الظاهريون). چەند جۆرە ئیمان و عەقیدەیەکیشمان هەبن بە ناوونیشانی جیا جیا و جۆرا و جۆرەوە !

به کورتی:

مادام مسوڵمانان ئیمان و عەقیدەکەیان تەنها لە سەرچاوەی ڕوون و بێ چەند و چوونی وەحییەوە وەربگرن - کە بێگومان لە قورئان و سوننەت دا کورت هەڵاتوە -، ئەوە هەموویان تەنها و تەنها یەك جۆرە ئیمان و عەقیدەیان دەبێ و هەمووشیان لەسەری ڕێك دەکەون، کە بریتییە لە (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی).

5- بەرگەکانی ئەم زنجیرە دەرسە :-

خوێنەری بەڕێز :

ئەم زنجیرە دەرسەی کە وەك پێشتر گوتمان بە گشتی دابەش دەبن بۆ پێنج بەشان، بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەیان دوای ئەوەی بەشی یەکەمی کتێبی (مسولْمانی کامڵ  بیروبڕوای مسولْمان) مان لەگەڵ تێکەڵ و ئاوێتە کردن[6] ، کردمانن بە شەش بەرگ بەم شێوەیەی خوارێ :

بەرگی یەکەم : ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چی یەو چۆنە ؟!

بەرگی دووەم : خوا بە یەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریێتی دا.

بەرگی سێیەم : خوا بە یەکگرتن لە ناو و سیفەتەکان و لە پەرستراوێتی دا.

بەرگی چوارەم : ئیمان بە فریشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەرانی خوا (عز و جل) .

بەرگی پێنجەم : ئیمان بە ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر.

بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدو بۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست.

شایانی باسیشە کە ئەم شەش بەرگە بە هەموویان لێکۆڵینەوەیەکی فراوان و خەست و خۆڵیان تێدایە دەربارەی سەرجەم باس و بابەتە بنەڕەتی یەکانی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی و تا ڕاددەیەکی زۆر خوێنەر بێنیاز دەکەن لەو بوارەدا.

---

(6) لە سۆنگەی ئەوەوە کە زۆر کەس داوایان دەکرد کە ئەم کتێبە چاپ بکرێتەوە و منیش سەرنجم دا کە زۆربەی هەرەزۆری باس و بابەتەکانی لەگەڵ ئەم زنجیرە دەرسەدا گونجاون بۆیە بە پەسندم زانی کە لە جیاتی دووبارە و سەربەخۆ چاپکردنەوە لەگەڵ ئەم زنجیرە دەرسەدا ئاوێتەی بکەین .

# پێشەکی ئەم بەرگە

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمد لله رب العالمین والصلاة والسلام علی النبـي الأمین محمد المبعوث رحمة للعالمین وآله أجمعین من الصَّحْبِ والأزواج والقرابة والتابعین لَهمْ بإحسانٍ الی یوم الدیِّن.

(رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا)

خوشك وبرایانی بەڕێز وخۆشەویست! خوا پشتیوان بێت زنجیرە دەرسێکتان پێشکەش دەکەم لە ژێر ناوونیشانی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر تیشکی قورئان و سوننەت دا) کە خوا یار بێ پەنجا (50) دەرس دەبن لە پێنج بەشدا.

بەشی یەکەم: لە ژێر ناوونیشانی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چییە و چۆنە؟)دا و ئەم بەشە دوانزە (12) دەرسە.

بەشی دووەم: (خوا بە یەکگرتن و هاوبەش بۆ خوا پەیدا کردن (التوحید و الشرك) ئەم بەشەش کە گەورەترین و گرنگترین بەشی ئەم زنجیرە دەرسەیە بیست و چوار (24) دەرسە.

بەشی سێیەم: (فریشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەران و قەزا و قەدەری خوا (جل جلالە) ئەم بەشەش لە پێنج دەرسدا پێشکەش دەکەین.

بەشی چوارەم: ﴿ڕۆژی دوایی: پێشـەکی یەکانی ، کارەساتەکانی، سەرەنجامی﴾ ئەمەش لە پێنج دەرسدا دەخەینە ڕوو.

بەشی پێنجەم: ﴿ چەند تایبەتمەندییـــەکی عەقیدەیی و فیکریی ئەهـــلی سوننەت و جەماعەت﴾ ئەم بەشە چوار دەرسە، وە لە ڕاستیدا ئەم بەشی پێنجەم و کۆتاییـیە بەشـــێکی گرنگە و پوختەی (خلاصـــة)ی زۆربەی دەرسەکانی ڕابردووی تێدایە، کەواتە وەك ئاماژەمان پێکرد بەم پێنج بەشە سەرجەم دەکاتە پەنجا (50) دەرس.

بەڕێزان و خۆشەویستان! لەم پێشـــەکییەدا پێم خۆشە هەروا بە کورتی ئاماژەیەك بکەم بۆ گرنگی ئیمان و عەقیدە لە ڕوانگەی ئیســـلامەوە، وە لە ژیانی ئینسانی مسولْماندا، ئەگەر ئیســـلام دابنێین بە کۆشکێك بێ گومان بناغەکەی ئیمان و عەقیدەیە، وە ئەگەر دینداریی و مســولْمانەتی دابنێین بە درەختێـــك ڕەگ و ڕیشـــەکەی ئیمان و عەقیدەیە، وە ئەگەر دینداریـــی و مسولْمانەتی وەکو جەستەی ئینسانێك سەیر بکەین ڕووحەکەی بریتییە لە ئیمان و عەقیدەکەی، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ **أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ ، تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا** ﴾[7] واتە: ﴿ئایا نابینی و سەرنج نادەی چۆن خوا وێنەیەکی هێناوەتەوە؟! وشەیەکی پاك و چاك و پڕ خێر و بەرەکـــەت وەکو درەختێکی پاك وچاك پڕ خێر وبەرەکەت وایە، کە ڕیشە و بناغەکەی چەسپاوە لە زەویدا، وە لق و پۆپەکـــەی بەرز بۆتـــەوە، هەموو کاتێـــك بە ئیزنـــی

(7) ابراهيم 24.

پەروەردگاری و بە فەرمانی خاوەن و مشوور گێڕ و سەرپەرشتیکەرەکەی میوە دەردەکات﴾.

لێرەدا خــوای پەروەردگار وێنەیەکمان[8] بۆ دێنێتەوە بۆ دەرخستنی حەقیقەتی وشەی پاك و چاك (الكلمة الطيبة) کە زۆربەی توێژەرەوانی قورئان - ئەگەر نەڵێم هەموویان - دەڵێن مەبەست لە (الكلمة الطيبة) بریتییە لە وشەی شایەتمان (أشهد ان لا إله إلا الله وأشهد ان محمداً رسول الله) یاخود مەبەست پێی وشەی خوا بەیەکگرتن (كلمة التوحيد)ە، کە بێگومان وشەی (لا اله الا الله) وشەی (محمد رسول الله) یشی هەر لە گەڵدایە چونکە بە بێ (محمد رسول الله) وشەی (لا اله الا الله) نە وەك پێویست فەهم و دەرك دەکرێ وە نە بەڕێوە دەبردرێ، بەڵێ ئێمە تەنها لە ڕێی پێغەمبەرمان (محمد)ﷺ ەوە پەی بە حەقیقەتی خوا بە یەکگرتن و پەی بە حەقیقەتی خوا پەرستیی و دینداریی دەبەین.

ئەوجار خوای پەروەردگــار فەرموویی : ﴿ كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ ﴾ وشەیەکی پاك و چاك و پڕ خێر و بەرەکەت وەکو درەختێکی پاك و چاك و پڕ خێر و بەرەکەت وایە، خوای پەروەردگار سێ شت لەو درەختە پاك و چاك و پڕ خێر و بەرەکەت و میوەدار و بەرهەمدارە باس دەکات:

یەکەم: ڕەگ و ڕیشە (أصل) دەفەرموێ: ﴿ أَصْلُهَا ثَابِتٌ ﴾ بناغە و بنك و ڕەگ و ڕیشەکەی چەسپاوە لە زەویدا.

---

(8) زۆر جار خوای پەروەردگار لە قورئاندا وێنە (مثال) دێنێتەوە بۆ ئەوەی مەبەستە مەعنەوییەکان لە قاڵبێکی بەرهەست و هەستپێکراو (محسوس)دا بخاتە ڕوو، تاکو ئینسان بە خەیاڵیش وە بە هەستەکانی دیکەش بتوانێ زیاتر دەرکی حەقیقەت بکات، وەکو (سيد قطب) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە کتێبی (التصوير الفنّي في القرآن الكريم) ئەو حەقیقەتەی جوان ڕوون کردۆتەوە.

دووەم: لق و پۆپ (فرع) دەفەرموێ: ﴿ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ ﴾ لق و پۆپ و گەڵاکەی بەرز بۆتەوە بەرەو سەرێ.

سێیەم: بەروبووم و میوە ﴿أُكُلَ﴾ دەفەرموێ: ﴿ تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا ﴾ هەموو کاتێك بە فەرمانی پەروەردگار و خاوەن و مشوور گێر و بەخێوکەر و سەرپەرشتیکەرەکەی میوە و بەروبووم دەردەکات.

کەواتە ڕیشە وئەسڵەکەی چەسپاوەو لەرزۆك نییە، ڕیشەیەکی مەحکەم و دامەزراوی هەیە، لق وپۆپەکانیشی شۆڕ نەبوونەتەوە بەڵکو بەرەو ئاسمان بەرز بوونەتەوە، مانای وایە درەختێکی ساغ و پڕ خێر و بەرەکەتە، چونکە لق و پۆپی زۆر و چڕوپڕی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە خاوەنی میوەی باش و بەتام و چێژە.

زانایان دەڵێن مەبەست لەم وشە پاك و چاك و پڕ خێر و بەرەکەتە (کلمة طیبة)یە ئیسلامەتییە، چونکە ئیسلامەتی[9] سێ بەشە:

یەکەم: ئیمان و عەقیدەیەکە کە دەبێ لە دڵ و عەقڵی ئینساندا بچەسپێ و دامەزراو بێ.

دووەم: عیبادەت و تاعەت و فەرمانبەریی و گەردن کەچییە، کە لە جێبەجێ کردنی فەرزەکان وسوننەتەکاندا وە لە خۆپاراستن لە قەدەغە کراو و شتە ناپەسندەکان دا خۆی دەنوێنێ.

سێیەم: ئەو هەڵس وکەوت ورەوشت ورەفتارە جوان و ئاکارە شیرین و خەسڵەتە پەسندانەیەن کە ئینسانی مسوڵمانیان پێ دەڕازێتەوە.

---

(9) واتە ئیسلامەتییەك کە بە ئینسان وەك تاك (فرد) ئەنجام دەدرێ.

جا هەروەك چۆن درەخت هەتا ڕەگ و ڕیشەی نەبێ، قەدو لق و پۆپی نابێ، وە هەتا ڕەگ و ڕیشە و قەدو لق و پۆپی نەبێ، ناتوانێ بەر و میوە دەر بكات، مسوڵمانەتییش هەتا ئیمان و عەقیدەی نەبێ، عیبادەت و تاعەت و فەرمانبەریی و گەردن كەچی نابێ، وە هەتا ئیمان و عەقیدە و عیبادەت و فەرمانبەریی نەبێ، ڕەوشتی بەرز و خەسڵەتە پەسندەكان لە ئینساندا نایەنە دی .

كەواتە ئێمەی مسوڵمان ئەگەر بمانەوێ خاوەنی دیندارییەكی باش و مسوڵمانەتییەكی پوخت بین، وە خاوەنی ئیسلامەتی و بەندایەتییەك بین بۆ خوا كە لای خوا جێگەی قبووڵ و پەسند بێ، دەبێ بەر لە هەموو شتێك خەمی ئیمان و عەقیدەكەمان بخۆین، وەك چۆن كەسێك بیەوێ كۆشكێك دروست بكات، بەر لە هەموو شتێك خەم لە بناغەكەی دەخوات و لە جێگایەكی باش وزەوییەكی پتەو بناغەیەكی قووڵ ومەحكەمی بۆ دادەڕێژێو هەڵدەكەنێ، بێگومان بناغەی مسوڵمانەتی و دینداریی و بەندایەتییش بۆ خوا بریتییە لە ئیمان و عەقیدە.

# بەشی یەکەم

# ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چی یە و چۆنە ؟!

**ئەم بەشـەو وتەیەکی پێویسـت :-**

یەکەم :- ئەم بەشی یەکەمە وەك لە ڕێ خۆشـــکردنیش دا ئاماژەم بۆ کردوە لە دوازدە (12) دەرس پێك هاتووە و هەوڵم داوە کە سەرجەم بابەت و مەسەلە گرنگەکانی ئیمانی تێدا بخەمە ڕوو، وەك:

پێناســـە و پێکهێنەرەکانی ئیمان و چۆنیەتـــی کەم و زیاد کردنـــی و هۆکارەکانیان و هەڵوەشێنەرەوەکانی و پەیوەندی و جیاوازی نێوان ئیمـــان و ئیسلام و بەرهەم و پەرێزی لە ژیانی تاك و کۆمەڵ دا...

بۆیە پێم وایە ئەم بەشـــە بە بناغە و بەشی هەرە گرنگی ئەم کتێـــبە دادەنرێ و پێویستە ئەوپەڕی ورد بوونەوەو ڕامان و ئارامیش بۆ لێتێگەیشتن و هەزم کردنی ڕەچاو بکرێ.

ئاشکراشە کە بەهەڵە لێتێگەیشتنی چەمك و واتای ئیمان و بچووك کردنەوەی وکورت هەڵهێنانی لە (تصدیق)دا وەك سەرجەم (علماء الکلام) ی پاشین (خَلَف) لەسەری پێکهاتوون گەورەترین دەوری سەلبـی هەبووە لە

بێڕووح و بێ جەوهەر کردنی مسوڵمانەتی و دینداریی مسوڵمانان دا و کەمتەرخەمی کردنی زۆریان لە بەرانبەر ئایینەکەیاندا و پشتگوێ خستنی ئەرك و فەرمانەکانی!

دیارە خاڵی وەرچەرخان و دەسپێکردنەوەی مسوڵمانەتی و دینداریيەکی ڕەسەن و جیددیش دیسان دەبێ هەر ئیمان و دوبارە ڕاست و دروست و قووڵ و فراوان و گشتگیرانە لێحاڵی بوونەوەی بێت. چونکە هەمیشە هەڵس وکەوت و کردەوەکانی ئینسان زادەو بەرهەم و ڕەنگدانەوەی بیرکردنەوەو هەست ونەست و قەناعەتەکانیەتی.

هیواداریشم ئەم کتێبە بتوانێ کاریگەری پێویستی لەو بوارەدا هەبێت و پشکێکی چاکی لەو وەرچەرخاندن و گۆڕانکارییەدا هەبێت.

دووەم : زانا و شارەزایانی ئیسلام چەند وشە و زاراوەیەکیان بەکارهێناون بۆ ناوونیشانی ئیمان و عەقیدە کە هەموویان تەعبیر لە یەك حەقیقەت دەکەن و ناوی یەك نێوەڕۆکن، بۆ وێنە هەموو ئەم ووشە و زاراوانەیان بەکارهێناون:

1- الإيمان کە چەند زانایەك بەو ناوەوە کتێبیان نووسیوە و یەکیان (شیخ الاسلام ابن تیمیة)یە کە لەگەڵ (مجموع الفتاوى) کەیدا چاپ کراوە.

2- العقيدة بۆ وێنە: (العقيدة الإسلامية)ی (سيد سابق)و (حسن حبنكة الميداني).

3- السُّنّة بۆ وێنە (السنّة) ی (ابن أبي عاصم) ی کە لە دوو بەرگ دا چاپ کراوە.

4- أصول الدين بۆ وێنە: (أصول الدين) ەکەی (الأسفرايني) و (الإبانة عن أصول الديانة) ی (أبو الحسن الأشعري).

5- الفقه الأكبر كه (أبو حنيفة) بەو ناوەوە کتێبێکی هەیە و (ملا علي القاري) شەرحی لەسەر کردوە.

6- الشريعة بۆ وێنە کتێبەکەی (الأجرّي) کە لە شەش بەرگ دا چاپ کراوە.

7- الإعتقاد بۆ وێنە : (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة) ی (اللاّلكائي) و (الإقتصاد في الإعتقاد)ی (أبو حامد الغزالي).

8- التوحيد بۆ وێنە: (كتاب التوحيد)ەکەی (محمد بن عبدالوهاب النَّجدي) کە شەرحی (فتح المجيد) ی بەسەرەوە کراوە.

9- العقائد بۆ وێنە (شرح العقائد) ەکەی (النَّسفي).

10- علم الكلام بەو ناوەشەوە کتێبی عەقیدەیی زۆر هەن، بۆ وێنە: (المواقف في علم الكلام) ی (عضدالدين الأيجي) و (إلجاء العوام عن علم الكلام) ی (الغزالي).

وەك ئاماژەشم پێ کرد سەرجەم ئەم ناوونیشانانە بۆ یەك ناوەڕۆك بەکار هاتوون کە بابەت و مەسەلەکانی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی بوون.

جا ئێمە بۆ ئەم زنجیرە دەرسەمان ئەم ناوونیشانەمان هەڵبژارد: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)، بەڵام ئایا بۆچی ئەم سێ وشەیەم بەکارهێناون؟! بەم چەند دێڕە حیکمەت و هۆی بەکارهێنانی ئەم ناوونیشانە ڕوون دەکەمەوە:

یەکەم: ئیمان (الإيمان) وشەیەکی قورئانی وسوننەتییە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، بۆ هەموو ئەو مەسەلە و بابەتانەی کە ئیماندار

دەبێ بە عەقڵ ودڵ و ئەندامەکانی بڕوا و قەناعەتی پێیان بێ و پێیانەوە پابەند بێ.

دووەم: وشەی عەقیدە (العقيدة) چونکە وشەیەکی پێشینەی صالح (السلف الصالح)مان بەکاریان هێناوە، وە زانایان و پێشەوایانی ئیسلام بەکاریان هێناوە بۆ هەموو ئەو مەسەلە و بابەتانەی کە هەر مسوڵمانێك دەبێ بڕوای پێیان بێت، ئەگەر بنچینە (أصل)ی دینیش نەبن، چونکە وەك لە بەشی پێنجەم و کۆتایی ئەم زنجیرە دەرسەدا دەیخەینە ڕوو بە ناوونیشانی (چەند تایبەتمەندییەکی عەقیدەیی و فیکریی ئەهلی سوننەت و جەماعەت) هەندێك مەسەلە و بابەت هەن وەکو: هەڵوێست دەربارەی ئەهل و بەیتی پێغەمبەر ﷺ، هەڵوێست دەربارەی هاوەڵان (أصحاب)ی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ، هەڵوێست دەربارەی دەستەڵاتداران، هەڵوێست دەربارەی تەصەووف و تەزکیەی نەفس، هەڵوێست دەربارەی دۆستایەتی و دوژمنایەتی (الموالاة والمعاداة) ، ئەوانە زانایانی دوایین (الخَلَفْ) لە: بازنە و جوغزی عەقیدە (العقيدة)دا خستوویاننە ڕوو، بۆیە ڕەنگە وشەی ئیمان نەیان گرێتەوە، بەڵام وشەی عەقیدە هەموویان دەگرێتەوە.

بە کورتی وشەی عەقیدە (العقيدة) هەم شەش پایەکانی ئیمان (أركان الإيمان) و هەم هەموو ئەو مەسەلانەی کە لە ئیمانەوە سەرچاوە دەگرن دەگرێتەوە، واتە هەموو ئەو مەسەلانەی کە زانا و پێشەوایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت پێیان وایە کە دەبێ مسوڵمانێك پێیانەوە پابەند بێ و بڕوای پێیان بێ دەیانگرێتەوە.

سێیەم: وشەی ئیسلامیی (الإسلامي)ش دیارە دەبێ هەم ئیمانەکە ئیمانێکی ئیسلامیی بێت، وە هەم دەبێ عەقیدەکەش عەقیدەیەکی ئیسلامیی بێت، واتە بە جۆرێك بن کە دوو سەرچاوەی ڕوون و بێ چەند و چوونی ئیسلام (الکتاب والسنة) دیاریان کردوون.

# بابەتی یەکەم

# پێناسەی ئیمان و عەقیدە لە روانگەی زمانەوەو لە زاراوەی شەرع دا

## دەرسی یەکەم

## پێناسەی ئیمان و عەقیدە لە ئەسڵی زمان دا

سەرەتا لە ڕوانگەی زمانەوە هەرکام لەو دوو وشە شی دەکەینەوە و پێناسەی دەکەین، پاشان لە زاراوەی شەرع دا سەرنجی ئیمان وعەقیدە دەدەین، ئەمەش لەبەر تیشکی تێگەیشتنی زانا و پێشەوایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دا، کە زانایانی ڕەسەنی ئوممەتی ئیسلامی و میراتگرانی سەر ڕاست و ڕاستەقینەی پێغەمبەری خوان ﷺ .

## أ- وشەی ئیمان :

وشەی ئیمان (إیمان) لە زمانی عەرەبیدا بە دوو جۆر بەکار هاتوە:

یەکەم: وشەی (إیمان) لە خودی خۆی دا بەرکار (مفعول) خوازە، واتە: لەم حاڵەتەدا بە بێ ئەوەی کە پیت (حرف)ێکی بچێتە سەر(مفعول) دەخوازێ و لە خودی خۆیدا (مُتَعَدِّي)[10] یە، کە ئەو کاتە بە مانای دڵنیا کردن و تەئمین کردن (تأمین) دێت، چونکە وشەی (أَمْن) پێچەوانەی وشەی (خَوْف)، دڵنیایی پێچەوانەی ترسانە، لە زمانی عەرەبیدا کە دەڵێی (أَمَنْتُهُ) واتە: ئەمانم پێداو دڵنیام کرد، بەڵام (أَخَفْتُهُ)واتە: ترساندم، خوای

(10) (فعل) لە زمانی عارەبیدا دوو جۆرە (لازم) کە پێویستی بە (مفعول) نیە، وە (متعدّی) کە پێویستی بە (مفعول) ە.

پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ ، الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ ﴾[11] واتە: ﴿ با (قورەیشییەکان) پەروەردگاری ئەو ماڵ (بیت)ە بپەرستن کە لە کاتی برسێتیدا ڕۆزی پێداون وە لە کاتی ترساندا (دڵنیا)ی کردوون ﴾.

وە لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە دەفەرموێ: (**النجوم أَمَنَةُ السماء فإذا ذهبت النجوم أتى السماء ما تُوعَدُ، وأنا أَمَنَةُ لأصحابي فإذا ذهبت أتى أصحابي ما يوعدون، وأصحابي أمنة لأمتي فإذا ذهب أصحابي أتى الأُمة ما تُوعَدُ**)[12] واتە: ﴿ ئەستێرەکان دڵنیایین بۆ ئاسمان هەر کاتێك ئەستێرەکان نەمان ئەوەی کە هەڕەشەی پێ لە ئاسمان کراوە - کە تێکچوونیەتی - دێتە دی، منیش دڵنیاییم بۆ هاوەڵانم هەر کاتێك من کۆچی دواییم کرد و گەڕامەوە بۆ لای خوا ئەوەی کە مەترسییە بۆ هاوەڵانم دێتە پێش، وە هاوەڵانی منیش جێگـــەی دڵنیایی و ئەمین کردنـــەوەن بۆ ئۆممەتەکەم، کاتێك هاوەڵانیش لە ژیاندا نەمان ئۆممەتەکەم ئەو مەترسی یانەی کە لە پێشنی دێتە ڕێی ﴾.

وە (ابن الاثیر)کە یەکێکە لەو زانایانەی وشە و ڕستەکانی فەرموودەکانی پێغەمبەری ﷺ توێژیوەتەوە، دەڵێ: (**الأمَنَةُ في هذا الحديث جَمْعُ : أمِينٍ، وهو:الحافظ**)[13] واتە: وشەی (أَمَنَةٌ) لەم فەرموودەیەدا کۆی (أمِین) ە، کە بە واتای پارێزەر و دڵنیاکەر دێت.

---

(11) قريش ( 3-4) .

(12) رواه مسلم ژمارە 2531.

(13) (النهاية في غريب الحديث والاثر) بەرگی (1) لاپەڕە 69-71.

وە دەربارەی ئەم ڕستـــەیەی کە لەم ئایەتـــەدا هاتووە ﴿**إِنَّهُمْ لاَ أَيْمَانَ لَهُمْ**﴾[14] ئیمامی (طبري)گوتوویەتی: (وَقُرِئَ: إِنَّهُمْ لا إِيمانَ لَهُمْ) واتە: ﴿هەم خوێندراوەتـــەوە بە (إِيمـــان) واتە: ئەوان ئیمـــــان و بڕوایان نیـــە﴾، بەڵام (أَيْمَان)[15]واتە: بەڵێن و پەیمان، بەڵێن و پەیمانیان نیە، بەهەرحاڵ هەردوو جۆری خوێندراوەتەوە، پاشان (طبـري) بەردەوام دەبێ و دەڵێ: (أيْ: أنَّهُمْ إذا أجاروا وأمنَّوا المسلمين لمْ يَفوا وغَدَروا والأيمانُ ههنا : الأجارة)[16]

واتە: وشەی (إيمان) لەم ئایەتەدا بە مانای: پەنادان دێت، واتە: کافرەکان ئەگەر مســـوڵمانانیش پەنا بدەن وە ئەگەر پەیـمان و وەعدیشیان پێ بدەن، پەیمان و وەعدی خۆیان نابەنە سەر و پەیمان شکێنی دەکەن.

هەروەها لە فەرموودەی تری پێغەمبـــەردا ﷺ هاتووە کە دەفەرمـــوێ: (**المؤذنُ مؤْتَمَنٌ**)[17] واتە: ﴿بانگ بێژ ئەمینداره﴾ ئەو کەسەی کە بانگ دەڵێ، دیارە متمانە پێکراوە لەوەی کە کاتی نوێژ هـــاتووە بۆیە بانگ دەڵێ: واتە تا دڵنیا نەبێ کە نوێژ بووە نابێ بانگ بدات.

وە یەکێك لە ناوە چاکەکانی خوای پەروەردگار بریتی یە لە(المؤمن) واتە: دڵنیا کەر چونکە خوای پەروەردگار بەندەکانی دڵنیا دەکات کە زوڵمیان لـێ ناکات، یاخود لەبەرئەوەی ئەو بەڵێن و گفتانەی کە بە بڕواداراني داون لە گەڵیاندا ڕاست دەکات و بۆیان دێنێتە دی[18].

---

(14) سورة البـراءة 12.

(15) (أيمان) کۆی (يمين)ە کە بە مانای سوێند دێ و بۆ بەڵێن خوازراوەتەوە.

(16) (تفسير الطبري) بەرگی  4- لاپەڕە 157.

(17) رواه ابو داود والترمذي واحمد، و صححه الشوكاني والألباني.

(18) تفسير الطبـري بەرگی 4 لاپەڕە 157.

دووەم: وشەی ئیمان (ایمان) کە لە زمانی عەرەبیدا بەکارهاتوە، ئەوەیە کە بە هـۆی پیتی (ب) یاخود (ل)ەوە (مفعول)ی دەوێت و دەتوانـێ (مفعول) بخوازێت، کە ئەو کاتە ئیمان (ایمان) بە واتای بەڕاست دانان و بە ڕاست زانین (تصدیق) دێت، وەکو خوای پەروەردگار لەسـەر زمانی براکانی (یوسف) - علیهم الصلاة والسلام  هێناویەتـی، دوای ئەوەی (یوسف) دەخەنە نێو بیرەوەو کراسـەکەیشی بە خوێن دەکەن، دەگەڕێنەوە بۆ لای باییان و دەڵێن: ئەی بابە (یوسف)ی برامان گورگ خواردوویەتی!، جا دەڵێن : ﴿ وَمَا أَنْتَ بِمُؤْمِنٍ لَنَا وَلَوْ كُنَّا صَادِقِينَ ﴾[19] واتە: تۆ ئەی بابە بە ڕاستمان نازانی هەرچەندە ئێمە ڕاستگۆش بین).

کەواتە لێرەدا ﴿ وَمَا أَنْتَ بِمُؤْمِنٍ لَنَا ﴾ واتە : ﴿ وما انت بِمُصَدِّقٍ لنا ﴾ تۆ ئێمە بە ڕاست نازانی و (تصدیق)مان ناکەی، وشـەی ئیمان (ایمان) لێرەدا بە واتای بەڕاست دانانە.

هەروەها خوای پەروەردگار دەربارەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾[20] واتە : ئیمان بە خوا دێنێ و بڕواداران بە ڕاست دەزانێ، لە ﴿ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ ﴾ دا بە (ب)(تَعَدّی)ی کردووەو (مفعول)ی خواستوە لە ﴿ يُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ یش دا (تَعَدّی)ی بە (ل) کردوە و(مفعول)ی خواستوە، لێرەشدا (ایمان)بە مانای بەڕاست دانان (تصدیق) هاتوە واتە: پێغەمبەر ﷺ خوا بە ڕاست دەزانێ و بڕوادارانیش بە ڕاست دەزانێ.

(19) یوسف 17.
(20) التوبة 61.

(ثعلب) کە یەکێکە لە شـارەزایانی زمانی عەرەبی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: (يُصَدِّقُ اللهَ وَيَصْدُقُ المؤمنين) واتە: ﴿ خوای پەروەردگار بە ڕاست دەزانێ و لەگەڵ بڕوادارانیش دا ڕاست دەکات ﴾.

بەڵام پێویستە بزانین کە وشـەی (تصديق) لە ئەسڵی زمانی عەرەبی دا تەنیا بە واتای: بە ڕاست دانانی زمان نایەت، وەکو لە دەرسـەکانی داهاتوومـاندا باسی دەکەین، وە زۆر لە زانایان لەوەدا بەهەڵەدا چوون کە گوتوویانە: ئیمان (ايمان) لە زمانی عەرەبی دا یانی (تصديق)! ئەو ئایەتەی سوورەتی (یوسف) یشیان بە بەڵگە هێناوەتەوە ﴿ وَمَا أَنْتَ بِمُؤْمِنٍ لَنَا وَلَوْ كُنَّا صَادِقِينَ ﴾ ئینجا گوتوویانە: ئیمان بە مانای (تصديق) دێت، وایشیان زانیوە کە (تصديق) تەنیا ئەوەیە کە بە زمان شتێك بە ڕاست دابنرێ.

بێ ئاگا لەوەی کە لە زمانی عەرەبی دا وشەی (تصديق) تەنیا ئەوە نیە کە بە زمان شتێك بە ڕاست بزانرێ، بەڵکو وشەی (تصديق) واتە بە ڕاست زانین بە دڵ و عەقڵ و بە زمان و بە ئەندامەکان، بە ڕاست زانینی موتڵەق، نەك تەنیا بە ڕاست زانینی بە زمان، واتە وشەی (تصديق) کە مانایەك لە ماناکانی ئیمان (ايمان)ە، لە زمانی عەرەبی دا تەنیا بە ڕاست زانینی زمان نیە بەڵکو بە ڕاست زانین وبە ڕاست دانانی دڵ وعەقڵ وزمان و ئەندامەکانە، بەڵگەشـمان ئەوەیە کاتێ (ئیبراهیم)(عليه السلام) بە فەرمانی خوا ویستی (ئیسماعیل)ی کوڕی سەربڕێ کە ئەو کاتە منداڵ بوو، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ ، وَنَادَيْنَاهُ أَنْ يَاإِبْرَاهِيمُ ، قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴾[21] واتە: ﴿ کاتێـك هەردووکیـان

(21) الصافات (103-105) .

تەسـلیم و مل کەچی فەرمانی خوا بوون، وە ئیبراهیم هەڵسا و ئیسماعیلی لە پەوڕوو خست و ڕووی پێ لە زەوی کرد، بۆ ئەوەی سەری بڕێ، بانگمان کرد ئەی ئیبراهیم ﴿ **قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا** ﴾ بێ گومان خەونەکەت بە ڕاست دانا﴾.

چ کاتێك خوای پەروەردگار فەرمووی: خەونەکەت بە ڕاست دانا؟ کاتێك کە ئیسماعیلی هێناوەتە سەر سەربڕین، مانای وایە (تصديق) لێرەدا یانی جێبەجێ کردنی فەرمانی خوا، کە بێگومان هەم بە دڵ قەناعەت و بڕوای بە فەرمانی خوا بووە و هەم بە زمان دانی پێداهێناوە و، هەم بە کردەوەش ئەوە هەستاوە و خەریکە جێبەجێی دەکات !

کەواتە ﴿ **قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا** ﴾ واتە: خەونەکەت هێنایە دی و جێبەجێت کرد، بەڵێ (تصديق) تەنیا بە ڕاست دانانی بە زمان نیە، بەڵکو بە دڵ و بە زمان و بە ئەندامەکانیشە.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (**العينان تزنيان وزناهما النظر... و الفرج يُصدق ذلك او يكذبه**)[22] واتە: ﴿ چاوەکان زینا دەکەن زینای چاوەکانیش ڕوانینی حەرام (نظر)ە، (پاشان باسی دەستەکان و باسی پێیەکان دەکات) ئەمجا فەرمووی: داوێنیش یان ئەوە (تصديق) دەکات و دەچێ زیناکە دەکات، یاخود زینای ئەندامەکان بە درۆ دەخاتەوە و نایگەیەنێتە گوناحە گەورەکە و زینای گەورە ﴾.

کەواتە (تصديق)ی داوێن ئەوەیە کە بە کردەوە زیناکە بکرێ، مانای وایە (تصديق) تەنیا بە ڕاسـت دانان و بە ڕاسـت زانینی بە دڵ و بە زمان نیە، بەڵکو بە تێکڕای پێکهاتەی ئینسانە.

(22) رواه البخاري و مسلم .

(جوهري) کە یەکێکە لە زانا و شارەزایانی زمان، دەڵێ : (والصِّدِّيقُ مِثالُ الفِسِّيقِ الدائم التَّصدِيقِ، ويكون الذي يُصَدِّقُ قولهُ بالعمل)[23]

واتە: وشەی(الصِّدِّيق) وەکو (الفِسِّيق)ە، واتە: ئەو کەسەی زۆر تاوانکار و گوناحکارە، (الصديق) واتە: ئەو کەسەی کە زۆر بەرانبەرەکەی بە ڕاست دادەنێت، یاخود زۆر ڕاست بێژە، یاخود ئەوەیە کە بە کردەوە قسەکەی بە ڕاست دادەنێت، قسەیەك دەکات بەڵام بە کردەوە شایەدیی ڕاستی قسەی زمانی دەدات.

ئەوە سەبارەت بە وشەی ئیمان (ایمان) کە لە زمانی عەرەبی دا بەم دوو مانا و واتایە بەکارهاتوە، بەڵام پێویستە ئاگاداری ئەم دوو مەسەلەیەش بین:

یەکەم: وشەی (ایمان) لە هەموو ڕوویێکەوە هاو واتا (مرادف)ی وشەی (تصدیق) نیە، چونکە دەگونجێ هەر هەواڵدەر (مُخْبِر)ێك پێی بگوترێ: (صَدَقْتَ) ڕاستت کرد، یان پێی بگوترێ: (كَذَبْتَ) درۆت کرد، بۆ وێنە ئەگەر یەکێك بڵێ : فلان کەس لە سەفەر گەڕایەوە: دەگونجێ پێی بڵێی: ڕاستت کرد یاخود درۆت کرد، بەڵام وشەی (ایمان) تەنیا لە حاڵەتێکدا دەتوانی بڵێی: درۆی کرد، ئەگەر هەواڵ لە شتێکی نادیار (غائب) بدات وە هەواڵدەرەکە جێی متمانە بێت، وەکو ئێمە دەربارەی پێغەمبەر ﷺ دەڵێین: (أمَنّا به) چونکە هەواڵ دەدات بە ناوی خواوە، هەواڵ دەدات لە فریشتەکان، لە (الملكوت الاعلى)، لە دوا ڕۆژ، لە بەرزەخ، لە بەهەشت، لە دۆزەخ، لە بەرانبەردا ئێمەش دەڵێین: (أمَنّا به) بە ڕاستی دەزانین چونکە ئەو هەواڵانە نادیارن.

---

(23) (مختار الصحاح) مادة (صدق) .

دووەم: وشەی (ایمان) ڕاستە و ڕاست پێچەوانەی وشەی (تكذیب) نیە وەكو (تصدیق)، چونكە (تصدیق) و (تكذیب) پێچەوانەی یەكترن واتە: بە ڕاست دانان و بە درۆ دانان، بەڵام (ایمان) لەگەڵ (تكذیب) ڕاست پێچەوانەی یەكتر نین، بەڵكو (ایمان) و(كفر) پێچەوانەی یەكترن، دەگونجێ بە كەسێك بڵێین: (صَدَّقْنَاكَ) تۆمان بە ڕاست زانی، دەشگونجێ پێی بڵێین: (كذَّبْناكَ) تۆمان بە دۆر زانی، بەڵام لە بەرانبەری (آمَنّا بە) دا ناتوانین و ناگونجێ بڵێین: (كَذَّبْناهُ)، تەنیا یەكێك لە واتاكانی وشەی (ایمان) پێچەوانەكەی بریتییە لە (كفر)، كەواتە (ایمان) یەكێكە لە جۆرەكانی (تصدیق) وە پێچەوانەكەیشی (كفر)ە، كە ئەویش یەكێك لە جۆرەكانی بریتییە لە (تكذیب)، بەڵام (كفر) جۆری تریشی هەن وەك لە دەرسەكانی داهاتوودا دەیخەینە ڕوو.

بە كورتی نە (ایمان) لە (تصدیق)دا كورت هەڵاتوە و، نە (كفر)یش لە (تكذیب) دا كورت هەڵاتوە.

## ب: وشەی عەقیدە:

وشەی عەقیدە (العقیدة)ش لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا، وەكو فەرهەنگەكانی زمانی عەرەبی هێناویانە دەڵێن: (العَقْدُ والرَّبْطُ والإبْرامُ و الإحْكَامُ والتَّوثُّقُ والشَّدُّ بقُوَّةٍ والتَّماسُكُ وَهُوَ نقیضُ الحَلِّ)[24] واتە: هەموو ئەو وشانە:گرێدان وپەیوەست كردن وتوند كردن وبەهێز كردن ومەحكەم كردن و توندوتۆڵكردن و پێكەوە لكاندن، وشەی (عقیدة) و (عقد) ئەوانە هەموویان

(24) بڕوانە (القاموس المحیط) وە (لسان العرب) وە (المعجم الوسیط) وە باقی فەرهەنگەكانی زمانی عەرەبی.

دەگرێتەوە، (عقد) واتە: گرێدان و پێکەوە لکاندن، کە پێچەوانەی (حلّ)ە واتە: هەڵوەشانەوە و لابردن.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ لاَ يُؤَاخِذُكُمْ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدْتُمْ الأَيْمَانَ ﴾[25] واتە: ﴿خوا (جل جلاله) بەوەی کە سوێندێکتان بە دەم دا دێت ناتانگرێ و سزاتان نادات بەڵکو بەوە سزاتان دەدات کە سوێندێکتان بە دڵ دا دێت و دڵتانی لەسەر دادەمەزرێنن و دەچەسپێنن﴾.

کەواتە (عقیدة) بە حوکمێك دەگوترێ کە خاوەنەکەی دڵی لەسەر دامەزراندبێ، عەقیدەی ئیسلامیی (العقیدة الاسلامیة) واتە دڵ دامەزراندنی ئینسانی مسوڵمان لەسەر ئەو ڕاستی و حەقیقەتانەی کە خوای پەروەردگار بە پێغەمبەردا ﷺ ناردوونی.

ئەوە بابەتی یەکەم: ﴿پێناسەی ئیمان و عەقیدە لە ڕوانگەی زمانەوە﴾.



(25) المائدة (89) .




# بابەتی دووەم :

# پێناسەی ئیمان و عەقیدە لە زاراوەی شەرع دا لە ڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە

پێشەکی بە قسەی هەندێك لە زانایان دەست پێ دەکەین:

زانای پایە بەرز (اللاّلکائي) نەقڵی کردوە کە ئیمامی (بخاري) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، گوتوویەتی: (**لَقِيتُ أَكْثَرَ مِنْ الفِ رَجُلٍ مِنَ العُلَمَاءِ بالأمصارِ فما رَأَيْتُ أحَداً مِنْهُمْ يَخْتَلِفُ فِي أَنَّ الإيمانَ قوْلٌ وَعَمَلٌ يَزِيدُ وَ يَنْقُصُ**)[26] واتە: ﴿ بە زیاتر لە هەزار (1000) پیاو لە زانایانی شارەکان گەیشـــتووم - شـــارەکانی بەصـرە، کووفە، بەغـدا، میصـر، شام،

(26) بڕوانە (شرح اصول اعتقاد أهل السنة والجماعة / اللالكائي) بەرگی -5- لاپەڕە 886 وە بڕوانە (فتح البارى) بەرگی -1- لاپەڕە 47.

مەککە، مەدینە... هتد - دوو زانا جیاوازی و ناکۆکی یان نەبووە لەسەر ئەوە کە ئیمان قسـه (قول)یە و کردەوە (عمل)یە، زیاد دەکات و کەم دەکات ﴾.

ئیمام (نەوەوی) یش نەقڵی کردوە کە (محمد بن اسماعیل بن محمد بن فضل التیمي الأصفهاني) گوتوویەتی: (الإیمان في لسان الشَّرْع هُوَ التَّصدیق بالقلب والعمل بالأرکان)[27] واتە: ﴿ئیمان لە زاراوەی شەرع دا بریتی یە لە بە ڕاست زانینی بە دڵ وە کردەوە بە ئەندامەکان﴾.

(بَغَوي)یش گوتوویەتی: (إتَفَقَتِ الصحابة والتابعون فَمَنْ بَعدَهُم مِنْ عُلَماء السُّنَّةِ علی أنَّ الأعمال مِنَ الإیمانِ، وقالوا: إنَّ الإیمانَ قَوْلٌ وَعَمَلٌ وَ عَقیدة)[28] واتە: ﴿تێکڕای هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و شوێنکەوتووانی ئەوان کە بە دوای ئەواندا هاتوون لە زانایانی ئەهلی سوننەت هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە کردەوە بەشێکە لە ئیمان، وە هەموویان گوتوویانە: ئیمان بریتی یە لە قسە و لە کردەوە و لە عەقیدە﴾.

هەروەها (الحافظ ابن عبدالبـر) گوتوویەتی: (أجْمَعَ أهْلُ الفِقْهِ والحدیث علی ان الأیمانَ قَوْلٌ وَعَمَلٌ ولا عمَلَ الاَّ بِنیَّةٍ، إلاَّ ما ذُکِرَ عَنْ أبي حَنیفةَ و أصحابه فإنَّهُمْ ذَهَبُوا الی أنَّ الطاعات لا تُسَمّی إیمانا)[29] واتە: ﴿ سەرجەم زانایانی شەرعزان وفەرمووده ناس لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە ئیمان قسەیەو کردەوەیە وە کردەوەش بە بێ نیەت قبووڵ نابێ، جگە لە ئیمام (ابو حنیفة) و هەندێـــك لە هاوەڵانی کە گوتوویانە: تاعـــەت و کردەوەکان بە ئیمان ناو نابردرێن، هەر بەرهەمی ئیمانن بەڵام بەشێك نین لە ئیمان ﴾.

---

(27) بڕوانە (صحیح مسلم/بشرح النووی) بەرگی -1- لاپەڕە 146.
(28) بڕوانە (شرح السنة) بەرگی □1□ لاپەڕە 38□39.
(29) بڕوانە (التمهید) بەرگی □9□ لاپەڕە 238□243.

وە (اللاّلكائي) نەقڵی كردوە كە ئیمام (شافعي) لە كتێبی خۆیدا (الأُمّ) گوتوویەتی: (وكان الأجْماعُ مِنْ الصحابة والتابعين مِنْ بَعْدِهِمْ مِمَّنْ أدْرَكْنا أنَّ الإيمان قَوْلٌ وَعَمَلٌ وَ نِيَّةٌ لا يُجْزِيُ واحدُ مِنْ الثَّلاثة عَنِ الأخَرِ)[30] واتە: ﴿یەك دەنگی زانایان لە هاوەڵان و ئەوانەی دوای ئەوان لەوانەی ئێمە بینیومانن لەسەر ئەوەیە كە ئیمان بریتی یە لە قسە وە لە كردەوە وە لە نیەت، هیچ كام لەم سێیانە بێ ئەوی تر بە كەڵك نایەت.

## ڕوونكردنەوەیەكی گرنگ:

مەبەست لە قسە (قول) و كردەوە (عمل) چی یە ؟!

زانایان گوتوویانە (الإيمان قَوْلُ القلبِ واللسان، وعمل القلبِ والجوارح) جا با بزانین ئەم قسەیە چی دەگەیەنێ؟! ئینسان چوار هێز(قوة)ی هەیە،
یەكەم: عەقڵ كە شتی پێدەناسێ ودەزانێ، دووەم: دڵ (قلب)كە دەتوانێ بەهۆیەوە شت قبووڵ بكات یان ڕەفز بكات، خۆشی بوێ یان ڕقی لێی ببێتەوە.
سێیەم: تەعبیری زمان كە دەتوانێ شتی پێ دەربڕێ ومەبەستی خۆی ڕوون بكاتەوە.
چوارەم: ئەندامەكان كە دەتوانێ شتیان پێ جێبەجێ بكات.

كەواتە ئینسان چوار قووەتی هەیە: قووەتێكی شت پێ ناسین (كشف)، قووەتێكی قبووڵ و ڕەفز، قووەتێكی دەربڕین و ڕوونكردنەوە، قووەتێكی جێبەجێ كردن، ئیمانیش وەختێك ئیمانە كە هەر كام لەم چوار لایەنانەی

(30) بڕوانە (شرح اصول اعتقاد أهل السنة و الجماعة / اللالكائي) بەرگی 5 لاپەڕە 886.

مرۆڤ بگرێتەوە، واتە: دەبێ ئینسان بە عەقڵ و دڵ خوای پەروەردگار بناسێ، حەقیقەتەکانی ئیمان بناسێ، پێغەمبەر ﷺ چی لە خواوە هێناوە بیانناسێ و ئیمانی پێیان بێ، ئەمجا ئەوەی کە ناسیویەتی و زانیویەتی قەناعەتی پێی بێ و لە دڵەوە قبووڵی بکاو بۆی گەردن کەچ بێ و پەسندی بکات، دوای ئەوە بە زمان دانی پێدابهێنێ و پاشان بە ئەندامەکانی جێبەجێی بکات.

کەواتە زانایان کە گوتوویانە: ئیمان قسەیە و کردەوەیە (الأيمان قول و عمل) پێتــان وا نەبێ کە تەنها قسە (قول)ی زمان بێ!، بەڵکو مەبەستیان پێ قسەی دڵ وزمان (قول القلب واللسان)ە، کە قسەی دڵ بریتی‌یە لە زانینی دڵ، وە قسەی زمان دەربڕینی زمانە، وە کردەوە(عمل)یش دیسان کردەوەی دڵ و ئەندامەکان (عمل القلب والجوارح)ە، کردەوەی دڵ بریتــی‌یە لە خۆشویستن و قبووڵ کردن و پەسند کردن و مل کەچ کردنی ئەوەی کە ناســیوتە و زانیوتە لە دەروون و لە دڵــەوە، کردەوەی ئەندامەکانیش ئەوەیە کە ئــەوەی بە دڵ و دەروون پەسندت کردوە بە کردار جێبەجێی بکــەی .

کەواتە دوو بەشی سەرەکی ئیمان بەڵکو ئەصڵی گەورەی ئیمان پەیوەندیی بە دڵەوە هەیە ئەوانیش بریتین لە : قسەی دڵ (قول القلب) قسەی دڵ واتە: ناسین وزانین و پەی پێ بردن (المعرفة والتصديق) وەکردەوەی دڵ واتە: قبووڵ و خۆشویستن و پەسند کردن، ئەم دووە پەیوەندی یان بە دڵ (قلب)وە هەیە، هەر بۆیە خوای پەروەردگار کاتێك باسی ئیمان دەکات زیاتر ئاماژە بە دڵ دەکات وەك دەفەرموێ: ﴿ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمْ الإِيمَانَ ﴾[31] ﴿ وَلَمَّا يَدْخُلْ الإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ ﴾[32] چونکە ئەصــڵی ئیمان پەیوەندی بە دڵ و دەروونەوە هەیە،

(31) المجـادلة (22) .

(32) الحجـرات (14) .

بەڵام بێگومان تەنیا لە دڵ دا کورت هەڵنەهاتوە،بەڵکو دەبێ ئەو حەقیقەتەی کە بە عەقڵ زانراوە وپەسند کراوە دانیشی پێدا بهێنرێ و بە ئەندامەکانیش جێبەجێ بکرێت، وەکو دوایی بە درێژی باسی دەکەین کە دەبێ چی جێبەجێ بکات و چۆنی جێبەجێ بکات.

جا بەڕێز و خۆشەویستانم !

ئێستا بۆمان دەرکەوت کە ئیمان و عەقیدە لە زاراوەی شەرع دا بریتیيە لەوە کە ئینسانی مسوڵمان بە هەموو پێکهاتەی وجوودی بڕوای بە ڕاستیی و تەواویی ئەو حەقیقەتە بەرز و مەزنانە هەبێ کە خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەری ﷺ ناردوون، بەم شێوەیە:

یەکەم: بیانناسێ و دەرکیان پێ بکات و قەناعەتی پێیان هەبێ.

دووەم: پاشان لە دڵەوە قبووڵیان بکات و پەسندیان بکات و خۆشی بوێن.

سێیەم: دوای ئەوەش بە زمان دانیان پێدا بهێنێ.

چوارەم: ئەنجار بە ئەندامەکانیشی بە پێی ئەو حەقیقەتانە بجووڵێتەوە و ڕەفتار بکات.

جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە بنچینەیەك هەیە لە نێو زانایاندا دەڵێت: (أقوال العلماء يُسْتَدلُّ لها ولا يُسْتَدَلُّ بها) واتە: ﴿قسە و بۆچوونی زانایان بەڵگەی بۆ دەهێندرێتەوە و بە بەڵگە ناهێندرێتەوە﴾، قسەی زانایان بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوە لە قورئان و سوننەت و بە بەڵگە ناهێنرێتەوە، چونکە دین ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەر ﷺ فەرموویانە، بەڵام زانایان ئەوەی کە فەرموویانە لەگەڵ ڕێزمان دا بۆیان دەبێ شەرح و تەفسیر و لێکدانەوەی فەرموودەی خوا و پێغەمبەر بێ، چونکە قسەی زانایان (دین) نیە بەڵکو شەرح و تەفسیر و لێکدانەوەی دینە و تێگەیشتن و بۆچوونی ئەوانە دەربارەی دین، بۆیە با بە خێرایی و لەبەر تیشکی چەند دەقێك دا تەماشا بکەین

کە ئاخــۆ چۆن ئيمـــان بۆ ئەوەی بە ئيمـــان دابنرێ دەبێ هەرکام لەم چـوار پێکهێنەرانەی هەبێ: زانينی دڵ، دان پێداهێنان و قبووڵ کردن و تەســـليم بوونی دڵ، وە دان پێداهێنانی زمان، پاشان کردەوەی ئەندامەکان:

1،2: بەڵگە لەسەر پێويست بوونی قسە و کردەوەی دڵ بۆ هاتنە دی ئيمان:

ئێمە گوتمان ئەسڵ و ڕیشە و بنچينەی ئيمان واتە بەشی گەورە و سەرەکی ئيمان بريتی‌يە لە قسەی دڵ و کردەوەی دڵ، جا بۆ ئيسپاتی ئەوە با سەرنجی ئەم ئايەتانەی خوارەوە بدەيـــن:

- يـــەك: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الإِيمَانَ)[33] واتە: ﴿ئەوانە خوا ئيمانی لە دڵ دا چەسپاندوون﴾ ئەو ئيمانەی کە لە دڵدا دەچەســپێ بريتی‌يە لە ناســينی دڵ، زانينی دڵ، دان پێداهێنـــانی دڵ بۆ پەروەردگاريتی و پەرستراويتی خوا، بۆ پێغەمبەرايەتی پێغەمبەر ﷺ، وە بۆ ئەو حەقيقەتانە کە خوا بە پێغەمبەردا ناردوونی، وە بەشی دووەمی لە دڵدا چەســپانی ئيمان بريتی‌يە لە کـــردەوەی دڵ، واتە قبووڵ کردن و خۆشويستن و پەسند کردنی، ئەگەر نا زۆرێك لە کافرەکانی وەك (فرعون) ناسينی دڵيان هەبوو، فيرعەون دەيزانی کە (مووسا)عليه السلام پێغەمبەری خوايە وەك خوای پەروەردگار لە بارەيانەوە دەفەرموێ: ﴿ **وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنْفُسُهُمْ** ﴾[34] واتە: ﴿ کوفر (جحد)يان کرد بە موعجيزەکانی مووسا يەقينيشيان هەبوو کە ڕاستن ﴾ ئەدی بۆچی بە کافر لە قەڵەم دران؟! چونکە ئەوە تەنيا قسەی دڵ و ناسين و زانينی دڵ بوو، کردەوەی دڵی لەگەڵدا

(33) المجـادلة (22) .

(34) النمـل (14) .

نەبوو، قبووڵیان نەکرد و خۆشیان نەدەویست و بە دڵ تەسلیمی نەبووبوون، واتە قسە (قول)ی دڵ هاتبوە دی بەڵام کردەوە (عمل)ی دڵ نەهاتبوە دی.

هی وا هەیە لافی مسوڵمانەتی و دینداریی لێ دەدات و دەڵێ: ﴿دەزانم خوا حەقە و پێغەمبەر ﷺ حەقە﴾، بەڵام تەنیا بەوەندە نابێتە مسوڵمان، چونکە خـۆ (إبلیـس)یش دەزانێ خوا حەقە، بەڵام ئایا بە ئیماندار لە قەڵەم دەدرێ؟! نەخێـر چونکـە قبووڵی نەکـردوە ﴿ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴾[35] کەواتە: تەنها بەوەندە نابێتە مسوڵمان و ئیماندار کە بزانی خوا هەقە، بەڵکو دەبێ کە دەزانی هەقە بە دڵیش تەسلیمی بی، وە کە دەزانی (محمد)ﷺ پێغەمبەری خوایە هەر ئەوەندە بەس نیە و دەبێ لە ناخەوە خۆشت بوێ و بە دڵ بۆ فەرمانەکانی فەرمانبەر و گوێ ڕایەڵ بی، وە کە دەزانی ئیسلام هەقە، دەبێ لە دەروونیشەوە خۆشت بوێ و بە دڵ بۆی تەسلیم بی، ئەمجار قسەی دڵ و کردەوەی دڵ هەردووکیان دێنە دی، ئینجا هەر بەوەندەش نابیتە ئیماندار بەڵکو جارێ بەس دوو بەشی ئیمان هاتوونە دی و دوایی دەبێ بە زمان دانی پێدا بهێنـی کە لە وشەی شایەتماندا خۆی دەنوێنێ، ئەمجار دەبێ بە کردەوەش ئەنجامی بدەی!

- دوو: دەقێکی تر لەسـەر ئەوەی کە قسـەی دڵ و کردەوەی دڵ دوو بەشی پێکهێنەری ئیمانن، ئەوەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ قَالَتْ الأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلْ الإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ ﴾[36] واتە: ﴿ ئەعراب گوتیان ئیمانمـان هێنا، بڵێ: ئیمانتـان

(35) البقـرة (34) .
(36) الحجـرات (14).

نەهێناوە بەڵکو بڵێـن: تەسلیم بووین چونکە جارێ ئیمان نەچۆتە نێو دڵتـــان ﴾.

بە ڕواڵەت دانیان پێدا هێناوە بە زمان، ڕەنگە نوێژیشیان کردبێ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، بەڵام لەبەرئەوەی دوو بەشەکەی تری ئیمانیان نەبووە کە پەیوەنـدی بە دڵەوە هـەیـە واتە: زانیـن و ناسـینی دڵ و قبـووڵ کردن و خۆشویستن و تەسلیم بوونی دڵیان نەبووە، کە ئەمانە قسە و کردەوەی دڵن و دوو بەشی گەورە و سەرەکی و ئەصڵی ئیمانن، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ **وَلَمَّا يَدْخُلْ الإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ** ﴾ هێشتا حەقیقەتی ئیمان نەچۆتە نێو دڵتان، بەڵکو هەر بە ڕواڵەت خۆتان بە ئیماندار پیشان داوە و هەر بە ڕواڵەت تەسلیمی ئایین و بەرنامەی خوا بوون !

- سێ: هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (**وَلَكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ**)[37] واتە: ﴿ بەڵام خوا ئیمانی لەلا خۆشەویست کردوون و لە دڵتاندا ڕازاندوویەتەوە ﴾ .

کەواتە دەبێ ئیمان لە دڵدا ڕازاوە و شیرین و جوان بێ.

- چوار: وە هەر لەو بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ **مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ وَلَكِنْ مَنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ** ﴾[38] واتە: ﴿ کەسێك دوای ئیمان هێنانی کوفر بە خوا بکات جگە لە کەسێك کە زۆریی لـێ کرابێ دڵەکەیشی ئارام بێ

(37) الحجرات (7) .
(38) النحل (106) .

بەهۆی ئیمانەوە، بەڵام کەسێك سینەی گوشاد بێ بە کوفر ئەوە تووڕەیی خوای لەسەرە و سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە ﴾.

کەواتە دەبێ دڵ ئارام (**مطمئن**) بێ بە ئیمان.

- پێنج: وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ﴿ **یا معشر من آمَنَ بِلِسانهِ وَلَمْ یدخل الایمان في قلبه** ﴾[39] واتە: ﴿ ئەی ئەو کۆمەڵەی کە بە زمان ئیمانتان هێناوەو بەڵام ئیمان نەچۆتە نێو دڵتان﴾ کەواتە: دەبێ ئیمان بچێتە نێو دڵ، دیارە بە زمانیش پێویستە دەرببڕدرێ چونکە بە زمان دەربڕینیش بەشێکە لە ئیمان هەروەها پێویستە بە کرداریش ئەنجام بدرێ، بەڵام بەشی هەرە گەورەی ئیمان ئەوەیە کە لە دڵدایە.

بەڵێ بەشی گەورەی ئیمان ئەوەیە کە لە دڵ دایە، ئەویش دوو شتە:

یەکەم: (معرفة القلب وتصديقه وإقراره) دڵ بزانێ و بە ڕاستی بزانێ و دانی پێدابهێنێ .

دووەم: (عَمَلُ القلب كالحب والخشية والتوكل والإذعان والإخلاص وغيرها) کردەوەی دڵ، وەك خۆشویستن، لە خوا ترسان، پشت بە خوا بەستن، مل بۆ کەچ کردن، بۆ خوا ساغ بوونەوە لە دەروونەوە .... هتد.

شێخ (جنيد البغدادي)[40] لەو بارەوە گوتوویەتی: (التوحيد قول القلب و التوكل عمل القلب) واتە: ﴿خوا بە یەکگرتن قسەی دڵە، بەڵام پشت بە خوا بەستن کردەوەی دڵە﴾.

---

(39) رواه الامام احمد و ابو داود و الترمذي و صححه الالباني.

(40) شێخ جونێد یەکێکە لە بەرجەستە ترین و لێهاتووترین زانا و پێشەوایانی بواری تەزکیە.

بێ گومان هەر کاتێك دڵ بەشی هەرە گەورەو ئەسڵی ئیمانی تێدا چەسپا، ئەوە زمان وا لـێ دەکات دانی پێدابهێنێ وئەندامەکانیشی وا لـێ دەکات کە فەرمانبەریی بکەن،واتە هیچ کەسێك ناتوانێ بڵێ: من مسوڵمان وئیمانداڕمو دڵم پڕە لە ئیمان، بەڵام بە زمان دانی پێدانەهێنێ، یاخود بە کردەوەکانی مل کەچی بۆ خوای پەروەردگار پێشان نەدات!، کەسێك لە دەروونەوە بۆ خوا ساغ بووبێتـــەوە و بە ڕاســـتی خوای خۆش بوێـت و بە ڕاستی لـێی بتـرسێت، وە پێغەمبەری ﷺ لە هەموو کەس خۆشتر بوێت و ئیسلام بە ڕاست و تەواو بزانێ، بێ گومان کردەوەی ئەندامەکانی لـێ بەجێ نامێنن، وە بە تەئکید هیچ کاتێك کردەوەی ئەندامەکان لە کردەوەی دڵ بەجێ نامێنـــــن و لە یەك ناترازێن، بەڵێ، دەگونجـێ ئینسان کردەوەی ڕواڵەتی هەبێت بەڵام ئیمانی لە دڵدا نەبێت، بەڵام هەرگیز ناگونجێ ئیمانی لە دڵدا هەبێت و کردەوەی نەبێت، بۆیە سەرەتا ئیمان دێت پاشان ئیسلام دێت، دەگونجێ ئیسلام هەبێت و ئیمان نەبێت، بەڵام ناگونجێ ئیمـان هەبێت و ئیســـلام نەبێت، ئیمان نهێنییە و لە دڵدایە و ئیسلام ئاشکرایە بە کردەوەی ئەندامەکان جێبەجێ دەکرێ وەك گوتراوە: (الايمان سِرٌ والاسلام علانية) ئەگەر ئینسان دەروونەکەی ئاوەدان بێ ڕواڵەتەکەی دەڕازێتەوە، بەڵام دەگونجێ ڕواڵەتەکەی بڕازێتەوە و دەروونەکەی وێران بێ وەك مونافیقەکان، هەرگیز ناگونجێ دەروونەکەی پڕ بێ لە ئیمان و ڕواڵەتەکەی وێران بێ، پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆ دیاری کردووین دەفەرموێ: **﴿ اَلاَ وانَّ في الجسد مُضغة اذا صلحت صلح الجسد كله واذا فسدتْ فسد الجسد كله الا وهي القلب ﴾**(41) واتە: ﴿ لە جەستەدا پارچە

(41) رواه البخاري ومسلم .

گۆشتێك هەیە ئەگەر چاك بێ جەســتەش هەمووی چاك دەبێ، وە ئەگەر خەراپیش بێ جەستە هەمووی خراپ دەبێ، كە ئەویش دڵە﴾.

3- بەڵگە لەسەر پێویست بوونی دان پێداهێنانی زمان بۆ هاتنە دی ئیمان

ئەمەش چەند دەقێك لەسەر ئەوە كە قسەی زمان و دان پێداهێنانی زمانیش مەرج و پێكهێنەری ئیمانە:

یەك: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ(136)فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنتُمْ بِهِ فَقَدْ اهْتَدَوا وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ)[42] واتە: ﴿ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بفەرموو : بڵێن - بە زمان - ئیمانمان هێنا بە خو او بەوەی كە بۆمان نێردراوە، وە بەوەی كە بۆ ئیبڕاهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و كوڕەكانی نێردراوە، وە بەوەی كە دراوە بە مووسا و عیسا و پێغەمبەرانی تر لە پەروەردگاریانەوە جیاوازی ناخەینە نێوانیانەوە و ئێمە مســـوڵمانین و مل كەچی ئەوین، جا ئەگەر ئەوانیش ئیمانیان هێنا وەك ئەوەی كە ئێوە ئیمانتان پێی هێناوە ئەوە ڕێگای ڕاستیان گرتوە، وە ئەگەر پشتیان هەڵكرد ونەیان گوت، ئەوە دیارە لە ناكۆكی و دوو بەرەكی و دان لەگەڵتان ﴾.

كەواتە گوتنی زمان ئیمانە و دەبێ بە زمان بیڵێی و دەری ببڕی ئینجا دەبێ بە ئیماندار، بەڵام ئەگەر بە خەیاڵی خۆت دڵیشت پڕ بێ لە ئیمان،

---

(42) البقــرة (136- 137) .

مادام بە زمان نەیڵێی و دەری نەبڕی بە ئیماندار لە قەڵەم نادرێی، وە مسۆگەر ناشگونجێ دڵت پڕ بێ لە ئیمان بەڵام بە زمان نەیڵێی، مەگەر کابرا لاڵ بێت.

دوو: هــەروەها دەفەرموێ : (**فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ ، فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا**)[43] واتە: ﴿کاتێك هەڕەشـــەی ئێمە و ئەو کارەســـاتەی ئێمە بە سەریان دەهێنین بینیان، گوتیان: ئیمانمان بە خوای تەنها هێنا، وە کوفر دەکەین بەوەی کە پێشتر دەمان کردە هاوبەش بۆ خوا، بەڵام پاش بینینی سزا و تۆڵە و بەڵای ئێمە ئیمانەکەیان سوودی پێ نەگەیاندن﴾.

لێرەشـــــدا خوای پەروەردگار گوتنەکەیان ﴿ **قالوا آمنّا** ﴾ی بە ئیمان داناوە، کەواتە: گوتنی ئیمان هێنان، ئیمانە و بەشێکە لە ئیمان.

سێ: پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: (**أُمِرْتُ أنْ أُقاتل الناس حتى يقولوا لا اله الا الله فإذا قالوها عصموا مني دماءهم وأموالهم الاّ بِحَقِّها**)[44] واتە: ﴿فەرمانم پێ کراوە کە لەگەڵ خەڵك دا بجەنگم تا دەڵێن (لا اله الا الله) جا کە ئەوەیان گوت خوێن و ماڵ و سامانیان لە لایەن منەوە پارێزراوە مەگەر بە هەقی خۆی﴾.

واتە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزی خوا لێیان ڕازی بێ، لە جەنگ و جیهاددا هەر کافرێك گوتی (لا اله الا الله) نەیان کوشتوە، هەر کەسێکیش کوشتی پێغەمبەر ﷺ موحاسەبەی کردوە و سەرزەنشتی کردوە، چونکە

---

(43) غافر (84-85) .

(44) رواه البخـــاري و مسلم .

گوتنەکەی پێشاندان و دەربڕینی ئیمانە، هەڵبەتە دوایی دەبێ بە ئیمانەوە پابەند بێ، بەڵام لەو کاتەدا هەرئەوەندە فریا دەکەوێ کە بە دەربڕینی (لا اله الا الله) ئیعلانی ئیمان و مسوڵمانەتی خۆی بکات، لەو کاتەشدا بەو گوتن و دەربڕینە لـێی قبووڵ دەکرێت کە مسوڵمانە.

جا دیارە شایەتمان هێنان (أشـهد أن لا اله الا الله وأشـهد ان محمدا رسول الله) ئەسـڵی دان پێداهێنانی زمانە و دەرگـای پێدا هاتنە نێو ئیمـان و ئیسلامە، وەك لە دەرسەکانی داهاتوودا بە درێژی باسی دەکەین.

4- بەڵگە لەسەر پێویست بوونی کردەوەی ئەندامەکان بۆ هاتنە دی ئیمان: چەند دەقێـك سـەبارەت بەوەی کە کردەوەی ئەندامەکانیـش مەرج و پێکهێنەری بنەڕەتی ئیمانە.

**یەك:** خوای پەروەردگار دەفەرموێ: **(إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُـمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِـمْ يَتَوَكَّلُونَ ، الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ، أُوْلَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا)**[45] واتە: ﴿ئیمانداران تەنیا ئەوانەن کە کاتێك یادی خوا دەکرێ دڵیان ڕادەچڵەکـێ، وە کاتێك ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنرێتەوە ئیمانیـان پێی زیاد دەبێ، وە پشت بە خوا دەبەستن، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن و لەوەی کە پێمان داون دەبەخشن، بێگومان ئەوانە بڕوادار و ئیمانداری ڕاستەقینەن﴾، وەك دەبینین خوای کاربەجێ لە پێناسەی بڕواداران دا چەند کردەوەیەکی وەك: دڵ ڕاچڵەکین و ئیمان

(45) الانفـال (2-4) .

زیاد بوون و نوێـــژ و ماڵ بەخشـــینی باس کردوە و هەمووشیانی بە بەشێك و بە پێکهێنەری ئیمان لە قەڵەم داوە.

**دوو:** هەروەها دەفەرموێ: (**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِذَا كَانُوا مَعَهُ عَلَى أَمْرٍ جَامِعٍ لَمْ يَذْهَبُوا حَتَّى يَسْتَأْذِنُوهُ...**)(46) واتـــە: ﴿ ئیمانداران تەنیا ئەوانەن کە ئیمان بە خوا و بە پێغەمبەری خوا ﷺ دێنن، وە کاتێك لە خزمەتی پێغەمبـــەردان بۆ بەرژەوەندی و کارێکی گرنگ و کۆکەرەوە تا ئیزنی لێ وەرنەگرن ناڕۆن ﴾.

کەواتە: ئیزن وەرگرتن لە پێغەمبەر ﷺ مەرجە بۆ ئەوەی بە ئیماندار لە قەڵـەم بدرێـن، کە بێگـومان مۆڵـەت وەرگرتنـیش کـــــردەوە و هەڵوێستێکی بەرچاوو بەرهەستە !

**سێ:** وە لە جێگایەکی تردا خوای دادگەر دەفەرموێ: (**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمْ الصَّادِقُونَ**)(47) واتە: ﴿ئیمانداران تەنیا ئەوانەن کە ئیمانیان بە خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ هێناوە، پاشان هیچ جۆرە دوو دڵی یەکیان نەماوە، وە بە ماڵ و بەگیانیان لە ڕێی خوادا جەنگ و جیهاد دەکەن، ئا ئەوانە ڕاست دەکەن﴾.

کەواتە: وەك لەم ئایەتەدا دەردەکەوێ سەروماڵ بەخشین و جیهاد و جەنگی ڕێی خواش هەر پێکهێنەری ئیمانە!

---

(46) النـور (62) .

(47) الحجـرات (15) .

**چوار:** هەروەها کاتێك وەفدی (عبدالقیس) هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: **(آمُرُكُم بالايمان بالله وحده، هل تدرون ما الايمان بالله وحده؟ قالوا: الله ورسوله أعلم قال: شهادة ان لا اله الا الله وإقام الصلاة وإيتاء الزكاة وأنْ تُعْطوا من الغنائم الخُمْسَ)**(48) واتە: ﴿فەرمانتان پێ دەکەم کە ئیمان بە خوای تەنها بهێنن، ئایا دەزانن ئیمان بە خوای تەنها هێنان چی یە؟ گوتیان: خوا و پێغەمبەری خوا زاناترن، فەرمووی: ئیمان بە خوای تەنها هێنان ئەوەیە: شایەتمان بهێنن کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوی تر نین، وە نوێژ بەرپا بکەن و زەکات بدەن، وە لە غەنیمەتیش پێنجیەك (خمس) بدەن﴾.

لێرەش دا دەبینین کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژکردن و زەکات دان و پێنجیەك (1/5) دان لە غەنیمەتی بە بەشێك لە ﴿ئیمان بە خوای تەنها هێنان﴾ داناوە.

**پێنج:** لە فەرموودەیەکی‌تریش دا دەفەرموێ: **(الايمان بضع و سبعون أو بضع وستون شعبة فأفضلها قول لا اله الا الله وأدناها إماطة الاذى عن الطريق والحياء شُعبة من الايمان)**(49) واتە: ﴿ئیمان حەفتا (70)و ئەوەندە یاخود شەست (60)و ئەوەندە بەشەیە، گەورەترین بەشی گوتنی (لا اله الا الله)یە، وە بچووکترین بەشی لابردنی دڕکێکە لەسەر ڕێی مسوڵمانان - تا ئازاریان نەدات - وە شەرم و شکۆش بەشێکە لە ئیمان﴾.

---

(48) رواه البخاري ومسلم .

(49) رواه مسلم وأصحاب السنن.

کەواتە ئیمان هەم قسە (قول)یە کە بریتی یە لە گوتنی (لا اله الا الله) وە هەم کردەوە (عمل)یە کە بریتی‌یە لە لابردنی دڕکێك لەسەر ڕێی مسوڵمانان، وە هەم ڕەوشتە کە بریتی‌یە لە شەرم و شکۆ کردن.

ئەوە بە کورتی پێناسەی ئیمان و عەقیدە بوو هەم لە ڕوانگەی زمانەوە و هەم لە زاراوەی شەرع دا بە پێی تێگەیشتنی زانا و پێشەوایانی ڕاستەقینە و سەر ڕاستی ئیسلام کە لەبەر تیشکی قورئان و سوننەت دا ئەو پێناسەیەیان دیاری کردوە،کە دەڵێن: (**الایمان قول وعمل یزید و ینقص، قول القلب و اللسان وعمل القلب والجوارح**)[50] .

خوای پەروەردگار بمانکات بە خاوەنی ئیمان و عەقیدەی ڕاستەقینە وە هەموو پێکهێنەرەکانی ئیمانمان تێدا بهێنێتە دی، وە ئیمانێکی کامڵ و تێرو تەواومان پێ ببەخشێ، ئامین.

(وصلی الله علی محمد وعلی اله و صحبه وسلم)

والحمد لله رب العالمین

(50) بەڵام دەبێ لێرەدا وریا بین و بۆچوون و بیروڕای ئەهلی سوننەت کە دەڵێن کردەوەی ئەندامەکان (اعمال الجوارح) بەشێکی پێکهێنەر (جزء مکوّن)ی ئیمانە، لەگەڵ هی (خوارج) و (معتزلة) دا تێکەڵ نەکەین، کە ئەوانیش هەروا دەڵێن !! بەڵام جیاوازییەکەیان ئەوەیە کە ئەهلی سوننەت دەڵێن جینسی کردەوە (جنس العمل) و ئەسلی کردەوە پێکهێنەری ئیمانە، واتە ناگونجێ کەسێك ئیمانی هەبێ و هیچ جۆرە کردەوەیەکی مسوڵمانانەی نەبێ و لە هیچ گوناحێك سڵ نەکاتەوە! بەڵام (خوارج) و (معتزلة) دەڵێن: هەر کردەوەیەك بە تەنها پێکهێنەری ئیمانە، واتە: بابای مسوڵمان بە چواندنی هەر فەرزێك و کردنی هەر گوناحێك کافر دەبێت و ئیمانی نامێنێ ! لە دەرسەکانی داهاتووش دا چاکتر ئەم مەسەلەیە ڕوون دەکەینەوە.

# هەڵسەنگاندنی پێناسەی ئەهلی سوننەت و ئەهلی بید عەت بۆ ئیمان




الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله ومن اهتدى بهداه.

پێناسەیەکی کورتی ئیمان لە ڕوانگەی ئەهلی سوننەت وئەهلی بیدعەتەوە

خوشك و برا بەڕێزەکانم!

لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئێمە لەم دەرسی دووەمەمان دا خوا پشتیوان بێ هەڵدەستین بە هەڵسەنگاندن ولە مەحەکی نەقڵ و عەقڵ دانی پێناسەی هەر کام لە ئەهلی سوننەت و ئەهلی بیدعەت بۆ ئیمان، پێویستە ئەگەر بە کورتیش بێ چاوێك بخشێنین بە پێناسەکانی هەر کامێکیان دا ئەگەر نا هەڵسەنگاندن و بەراورد کردنیان ناکرێ و ناگونجێ.

**یەکەم : پێناسەی ئەهلی سوننەت بۆ ئیمان:**

لەبەرئەوەی لە دەرسی پێشوودا بە تێروتەسەلی پێناسەی ڕاست و دروستی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییمان خستە ڕوو کە زانا و پێشەوایانی ڕەسەنی ئیسلام کە بە (أهل السنة والجماعة) ناسراون، لەسەری یەکدەنگن و دەقەکانی قورئان وسوننەتیش تەنها ئەو جۆرە پێناسەیەیان لێ دەفامرێتەوە، لێرەدا بە پێویستی نازانم ئەوەی ئەوێ دووبارە بکەمەوە وهەر بە کورتی دەڵێم:

ئیمان لە ڕوانگەی ئەهلی سوننەتەوە بریتی‌یە لە :

﴿زانین و بە ڕاست زانین و قبووڵ و پەسند کردن و خۆشویستن و تەسلیم بوونی عەقڵ و دڵ وە دان پێداهێنانی زمان و جێبەجێ کردن و مل کەچیی و پابەندیی ئەندامەکان بۆ:

تەنها پەروەردگاریتی و تەنها پەرستراویتی خوا ﷺ وە پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ وە ئەو بەرنامە و شەریعەتەی کە لە لایەن خواوە پێیدا ڕەوانە کراوە﴾.

کەواتە: ئیمان لە پێناسەی ئەهلی سوننەت[51]دا چوار پێکهێنەر (مُكَوِّن)ی هەن کە هەر کامێکیان مەرجێکی سەربەخۆ و پێویستە بۆ هاتنە دی و دامەزرانی ئیمان، کە ئەمانەن:

1- زانین و بە ڕاست دانانی عەقڵ و دڵ.

2- قبووڵ و پەسند کردن و بۆ تەسلیم بوونی دڵ و دەروون.

3- دان پێداهێنانی زمان.

4- پابەندیی و جێبەجێ کردنی ئەندامەکان.

**دووەم : پێناسەی ئەهلی بیدعەت بۆ ئیمان:**

سەرجەم ئەو پێڕو تاقمانەی کە لە بواری ئیمان و عەقیدەدا بە لادەر (مُنْحَرِف) و داهێنەر (مُبْتَدِعْ) دادەنرێن لە ئەنجامی ئەوەدا دووچاری هەڵە و لادان بوون کە ئەو گشتگیری (شمولیة) و هاوسەنگیی (توازن)یەی ئەهلی سوننەت لە پێناسەی ئیمان دا ڕەچاویان کردوە بەهۆی چاك لێ تێگەیشتن و باش پێوە پابەند بوونی قورئان وسوننەتەوە، ئەوان لێیان بەهرەمەند نەبوون، بۆیە هەر کامێکیان یەکێك یان زیاتر لە چوار پێکهێنەرەکانی ئیمانیان فەرامۆش کردوە، یان زیاتر لە قەبارەی سروشتی خۆی بایان پێ داوە !

وە تاقم و پێڕە لادەر و داهێنەرەکان لە بواری ئیمان دا سەرجەم ئەم حەوتەن:

1- جەهمی یەکان (الجهميّون) :

(51) هەروەها شیعەی دوازدە ئیمامی (الشيعة الاثنا عشرية) و شیعەی زەیدیش هەمان بیروڕایان لە بارەی پێناسەی ئیمانەوە هەیە .

که دامەزرێنەری ئەو پێڕە لادەرە (جهم بن صفوان السّمرقندي) یە کە لە ساڵی (128)ی کۆچیدا (نَضْرُ بن سیّار)ی (والي)(بصرة) بەهۆی یان بە بیانووی ئەو جۆرە بیرۆکە ڕیزپەڕ (شاذ) و داهێنراوانەوە کوشتی.

جا جەهمی یەکان دەڵێن: ﴿ئیمان تەنها بریتی یە لە زانینـــی ڕووت (المعرفة المجرَّدة)﴾ واتە هەر کەسێك بە عەقڵ و دڵ قەناعەتی هەبوو و زانی کە خوا پەروەردگارو پەرستراوەو موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە و ئیسلام ڕاست و تەواوە، ئەوە ئیمانداره هەرچەندە لە دڵ و دەروونی دا ئەو زانین و قەناعەتەی قبووڵیش نەکردبێ و لـێی ڕازی نەبێ وبە زمانیش دانی پێدا نەهێنابێ و هیچ کردەوەیەکیشی ئەنجام نەدابێ !!

کەواتە: جەهمی یەکان لە چوار پێکهێنەرەکانی ئیمان تەنها یەکێکیان کە زانین و بە ڕاست دانانی دڵ (معرفة و تصدیق القلب) ە ڕەچاو دەکەن!

2- کەڕڕامی یەکان (الکَرَّامیة) :

ئەمانیش پێڕێکی داهێنەرو لادەرن ودامەزرێنەری بیرۆکە (فکرة)کەیان (محمد بن کرّام السَّجستاني) یە کە لە ساڵی (255)ی کۆچی مردوە.

ئەمانیش ئیمان بەوە پێناسە دەکەن کە بریتی یە لە: ﴿شایەتمان هێنانی بە زمان هەرچەندە هیچ جۆرە زانین و بە ڕاســـت دانان و قبووڵ و پەسند کردنی نێو دڵ و هیچ کردەوەیەکی ئەندامەکانیشی لەگەڵ نەبێت!﴾.

واتە ئەمانیش لە چوار پێکهێنەرەکانی ئیمان تەنها یەکیان حیساب دەکەن کە بریتی یە لە دان پێداهێنانی زمان (إقرار اللسان) ! ..

3- مورجیئەکان (المرجئة) :

ئەمانیـش هەر تاقم و پێڕێکی لادەرن و ئیمـــان وا پێناسە دەکەن کە تەنها پەیوەندی بە دڵ و دەروونەوە هەیە و دەڵێن، بابای ئیماندار کەسێکە کە بە دڵ و دەروون هەقی ناسیوە وقبووڵ و پەسندی کردوە، جا هەرچەندە (مرجئة)کان جۆراو جۆرن وهەیانە کە ڕاست وەك جەهمی یەکان پێناسەی ئیمانی کردوە و گوتوویەتی : ئیمان بریتی یە لە زانین و ناسینی تەنها و ڕووت! بەڵام زۆربەی هەرە زۆری مورجیئەکان ئیمان بەم جۆرە پێناسە دەکەن:

﴿ئیمان بریتی یە لە زانین وبە ڕاست دانان وقبووڵ و پەسندکردنی عەقڵ و دڵ﴾، واتە ئەمانیش تەنها بە دوو پێکهێنەر لە پێکهێنەرەکانی ئیمان ئیمان پێناسە دەکەن کە بریتین لە:

أ- زانین و بە ڕاســـت دانانی عەقڵ و دڵ، ب- وە قبووڵ و پەسند کردنی دڵ و دەروون ، بۆ دان پێداهێنـــانی زمان (اقرار اللســـــان) یـــش مورجیئەکان دەڵێن: تەنها بۆ بە مسوڵمان دانرانی ئینسان پێویستە لە ڕووی هەڵس وکەوت (تعامل)ی دنیایی یەوە، بەڵام بۆ پێکهاتن و دروست بوونی ئیمان (صحة الایمان) پێویست نیە و بە مەرج نەگیراوە!

بەڵام کردەوەی ئەندامەکان ئەوە بە هیچ جۆرێك بۆ دروست بوونی ئیمان و دامەزراندنی بە مەرج نەگیراوە هەرچەندە ئەگەر هەبێ چاکترە!، شایانی باسیشە کە بۆیە ئەم کۆمەڵە بیدعەتچی یە ناونراوە (مرجئة) چونکە کردەوە لە ئیمان دوا دەخەن و لە یەکیان دەترازێنن، چونکە وشەی ناوبراو لە (أرْجأَ يُرْجِئ إرجاء) واتە: (أَخَّر يُؤَخِّرُ تأخيراً)ەوە هاتوە.

4- خـەواریج (الخوارج) :

کۆمەڵی خەواریج لە ئەسڵ دا کەسانێك بوون لە (علي بن أبي طالب) خەلیفەی چوارەم خوا لـێی ڕازی بێ و لە گەرمەی جەنگـی (صِـفِّین) دا جیابوونەوە لەسەر بناغەی هەندێك بڕو بیانووی ناشەرعیی و ناماقووڵ، شایانی باسیشە کە پێڕی ناوبراو یەکەمین تاقمی داهێنەر و لادەر بوون کە لە نێو ئۆممەت دا پەیدا بوون ، وە بە هۆی دەرچوون (خروج)یشیان لە فەرمانبەریی ئیمام و خەلیفەی مسوڵمانان ئەو ناوەیان لێ نرا.

جا خەواریـج بە پێچەوانەی ئەو سـێ تاقمەی پێشووەوەن کە دووچاری کەمتەرخەمی وبەزایەدان (تفریط)بوون و، ئەگەر ئەوانی پێشوو لە شەرع بەجێ مابوون، ئەمان لە شەرع ڕەت بوون !

بەڵێ خوشك وبرا بەڕێزەکانم! لادان لە شەرع هەر لادانە جا چ لـێی بەجێ بمێنی وە چ لـێی تێبپەڕێنی و، هەر بۆیەش گوتراوە: (الزیادة کالنقص)!.

پێناسەی دەرچووەکان (خوارج)یش بۆ ئیمان بەم جۆرەیە:

دەڵێن:﴿ئیمان بریتی یە لە بە ڕاست زانین وقبووڵ کردن وپەسند کردنی دڵ و دەروون و دان پێداهێنانی زمان و ئەنجام دانی سەرجەم جۆرەکانی چاکە و تاعەت و خۆ دوورگرتن لە تێکڕای گوناح و هەڵەکان﴾.

هـەر بۆیەش خەواریـج ڕایان وایە بابای مسـوڵمان بە چواندنی هەر تاعەتێك وکردنی هەر گوناحێك کافر دەبێت و لە بازنەی ئیمان دەردەچێ!

5- موعتەزیلەکان (المعتزلة):

ئەمانیش یەکێکـن لە پێڕو تاقمـە لادەر و داهێنـەرەکان و لە بواری پێناسەی ئیمـان دا زۆر لە خەواریجەوە نزیکن و تەنها جیاوازی یان ئەوەیە کە ئەگەر خەواریج مسوڵمانی گوناحبار (چ بەهۆی چواندنی فەرزێك وە

چ بە هۆی کردنی قەدەغەیەك) بە کـــــافر و لە دین دەرچوو دادەنێن، موعتەزیلەکان دەڵێن کافر نەبووە، بەڵام لە بازنەی ئیمانیش دا نەماوە و لە نێوان ئیمان و کوفردا هەڵواسراوە ! جا ئەم بیرۆکە داهێنراوەی ئەم پێڕە بە وشەی : (مَنْزِلَةٌ بين مَنْزِلَتينِ) ناسراوە!

6- 7 ئەشعەریەکان و ماتورێدییەکان (الاشاعرة و الماتريدية) :

ئەشـعەرییەکان شـوێن کەوتووانی (أبو الحسـن الأشـعري) و ماتوریدییەکانیـش پەیـڕەوانی (أبو منصور الماتريدي) ین کە دوو زانای پایە بەرزی ئیسلامن و هاوچەرخی یەکتـر بوون و یەکەمیان لە عیڕاق و ئەوی دیکەیان لە خوراسان بووەو، کاتی خۆی هەردووکیان بە دوو پارێزەر (مُحامي)ی بەرجەستەی عەقیدەی ئیسلامیی ناسراون لە بەرانبەر نەیاران دا لە پێڕ و تاقمە لادەرەکان ، بە تایبەت (معتزلة) کە ئەو کاتە زۆر پەرەیان ئەستاندبوو !

جا هەرچی (أبو الحسن الأشعري)یە کاتی خۆی (معتزلة)بوو و پاشان لێیان جیابۆوە و گەڕایەوە سەر ڕێبازی (أهل السنة والجماعة) و کتێبی : (الإبانة عن أصول الديانة)ی نووسی،بەڵام لە مەسەلەی پێناسەی ئیماندا هەر لە ژێر کاریگەریی (المرجئـة)دا مایەوە، پاشان جڵە و بە دەستان و چاوسـاغاتی هەردووك قوتابخـانەی زۆر لە یەك نزیکی (الاشاعرة) و (الماتريديـة) بە یەکجاریـی لە بواری پێناسەی ئیمان دا بیـرۆکەی (مورجیئەکان)یان وەرگرت و (تَبَنِّي)یـان کرد و، بەو جۆرە پاش کێشە و مشت و مڕێکی زۆر لە نێو مسوڵمانان دا لەسـەر پێناسەی (ئیمان) و دیاری کردنی سنووری نێوان ئیمـان و کوفر، لە ئاکامی دوورکەوتنەوەی ئۆممەت بە گشتی لە قورئان و سوننەت و ڕێبازی پێشینەی چاك (السلف

الصالح)مان لە لایەك، وە خۆسەپاندنی کاربەدەستانێکی ستەمکارو لاڕێ بەسەر ئۆممەت دا وزەوت کردنی ئیرادەوئازادیی‌یان لە لایەکی دیکەوە[52]، پێناسەیان بۆ ئیمان و عەقیدە لە لایەن زۆربەی ئۆممەتەوە پەسند کرا و هەرچەندە شوێن کەوتووان و پەیڕەوانی ئەو دوو قوتابخانەیە گەلێك بیروبۆچوونی جیاواز لە هی (أبو الحسن الاشعري)و (أبو منصور الماتريدي) یان داهێنا، بەڵام هەر بە ناوی دامەزرێنەرەکانیانەوە مانەوە، کە ئەمەش ستەمێکی گەورەی سەبارەت بەو دوو کەڵە پیاوەی ئیسلامیی تێدایە! وە بە داخەوە گەلێك کەسیش هەم لە گەنج و خوێندەوارەکانمان و هەم لە زانا و مەلایەکانیشمان لەو حەقیقەتە بێ ئاگان و پێیان وایە کە هەرچی ئێستاکە لە کتێب و سەرچاوەکانی (علم الكلام)ی سەر بە هەردووك قوتابخانەی ئەشعەری یەکان (الأشاعرة) و ماتوریدی یەکان (الماتريدية)دا نووسراوە هی خودی (أبو الحسن) و (أبو منصور) ە !!

ئێستاش پاش ئەم پێناسە کورتانەی ئەهلی سوننەت و ئەهلی بیدعەت بۆ ئیمان و عەقیدە، بە چاکی دەزانم بەر لەوەی ئەو پێناسانە لە مەحەکی شەرع و عەقڵ بدەین و هەڵیان بسەنگێنین، سەرنجێکی مێژوویی لە چۆنیەتی پەیدا بوون وسەرهەڵدانی ئەو پێڕو تاقمە لادەرانە و بیروبۆچوونە داهێنراوە (مُبْتَدَعْ) کانیان بدەین:

## سەرنجێکی مێژوویی لە بارەی چۆنیەتی سەرهەڵدانی

(52) چونکە بێگومان دابڕینی کردار و ڕەفتار و پابەندبی لە ئیمان و ئیسلام بۆ حوکمڕانە زۆردار و بێ بەند و بارەکان زۆر قازانج بوو و لەگەڵ ئەو هەموو لاریی و ستەمکاریی پەدا بۆیان هەبوو لاف ئیمان و مسوڵمانەتی پەکی قووڵ لێ بدەن ، وە خەڵکی مسوڵمان و سادەش لێیان بسەلمێنن !!

## پێڕ و تاقمە لادەرەكان و بیرۆكە داهێنراوەكانیانەوە

خوشك و برا بەڕێزەكـــانم ! پەرتەوازەیی و ڕاجیایی نێو ئوممەت پاش دوو كێشە و ئاژاوەی شووم و بەد كە بە هۆی كوژرانی خەلیفەی ســێیەم (عثمان بن عفان) وخەلیفەی چوارەم (علي بن أبي طالب)ەوە ﷺ بەرپا بوون، سەری هەڵدا و پەیدا بوو، جا هەرچی ئاشــــووب و ئاژاوەی یەكەمە كە بە (الفتنة الكبرى) ناسراوە لە ئەنجامی كوژرانی (عثمان) ﷺ لە لایەن كۆمەڵێكی ئاژاوە گێڕ (مشاغب)ەوە بووكە بە چەند بڕو بیانوویەكی بێ جێ و بە ناهەق و بە پیلانی ناحەزانی ئەهلی ئیمان، لە ماڵی خۆی دا كوژرا، ئیدی لە دوای ئەو كارەساتەوە مسوڵمانان بە گشتی بۆ هەڵوێست وەرگرتنی لە بەرانبەر بكوژانی خەلیفەدا بوونە سێ لایەن و تەوژم:

یەكەم: كە (علي بن أبي طالب) ﷺ و شـــوێن كەوتووانی بوون، چونكە (علي) لە لایەن مشـــوور خۆران (أهل الحلِّ والعقد) ەوە بە خەلیفـــەی مسوڵمانان هەڵبژێررا بوو بڕیاری چۆنیەتی چارەسەری ئەو كێشەیەیان بە مافی شەرعیی و ڕەوای خەلیفە دەزانی و دەشـــیان گوت: لەبەرئەوەی بكوژانی خەلیفەی سێیەم ﷺ یەكێك و دووان نین وكۆمەڵێكی زۆرن كە بە دە هەزار (10.000) كەس مەزەننە دەكرێن[53]، جارێ ناكرێ تۆڵە (قصاص) لەو كەسانە بستێنرێتەوە و پێویستە هەموو لایەك بەیعەت بە خەلیفەی چوارەم بكەن و كارەكان بكەونە سەر سكەی ئاسایی خۆیان ئەو

---

(53) چونكە كاتێك (علي) ﷺ داوای لـێ كردن كە بكوژانی (عثمان) ﷺ تەسلیم بكەن ئەو دە هەزار كەسە گوتیان (كُلّنا قتل عثمان) بە هەموومان (عثمان) مان كوشتوە !

جار دەگونجێ بە هاوکاریی و پشتگیری کردنی هەموو لایەك ئەو سزا و سنووره (حَــدّ) شەرعیی یە جێبەجێ بکرێ!

دووەم: کە (معاویــة بن أبي سفیان) و دەســتە و دایەرەکەی بوون، دەیانگوت: دەبێ هەر ئێستا بکوژانی خەلیفەی ســێیەم بکوژرێنــەوە و ئەو مەسەلەیان کردبوو بە بیانووی یاخی بوون (بَغي)[54] و سەرپێچی کردن (عصیان)یان و بەیعەت نەکردنیان بە خەلیفەی چوارەم و نەهاتنە ژێر ڕکێفی یەوە !

سێیەم: کۆمەڵ و لایەنی ســێیەمیش خەڵکێکی زۆر بوون وەك بێ لایــەن (مُحاید) و هەر کام لە (طلحة بن عبیدالله) و(زبیر بن العوّام) و (عائشة بنت الصدیق أُمّ المؤمنین) ﷺ سـەرپەرشتی یان دەکردن، ئەم کۆمەڵەش لە لایەکەوە داوای تۆڵە ســتاندنەوە لە بکوژانی خەلیفەی سێیەم ولە لایەکی دیکەشەوە داوای صوڵح و ئاشــتی یان دەکرد لە نێوان لایەنە ناکۆکەکان دا.

ئەوە لە ئاکامی ئاشووب وئاژاوەی یەکەم دا کە بە هۆی کوژرانی خەلیفەی سێیەم (عثمان بن عفان)ەوە سەری هەڵدا ﷺ، ئەو حاڵەتە تازەیە پەیدا بوو کە مسوڵمانان تێیدا بوونە سێلایەن وکۆمەڵ، بێ ئەوەی جارێ هیچ بیرۆکەیەکی داهێنراو لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە سەرهەڵ بدات!

---

(54) پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی لە کۆمەڵی (معاویە) ناوە:﴿یاخی بووان﴾ چونکە لە فەرموودەیەك دا کە ( مسلم ) هێناویەتی، پێغەمبەرﷺ بە (عمّارُ بن یاسر) ی فەرمووە: (وَیْحَ ابن سُمَیّة تَقْتُلُهُ الفئة الباغیة) پاشانیش (عەممار) ﷺ لە جەنگی (صفین) دا و بە دەستی کۆمەڵی موعاویە کوژرا !!

دووەمیــن ئــاژاوە و ئاشــووب (الفتنة الثانية) یش لە ئەنجامی بە ناهــەق کوژرانی خەلیفەی چوارەم (علي بن أبي طالب)ەوە ﷺ سەری هەڵدا و پەیدا بوو، کە لە لایەن یەکێك لە داخ لە دڵەکانی (خوارج)ەوە ئەنجام درا، کە ناوی (عبدالرحمن بن ملجم) بوو جا هەڵبەتە ئەو سێ کۆمەڵی پێشوو هەر هەبوون، ئەو جار کۆمەڵێکی دیکەش پەیدابوو کە لە خەلیفە (علي)ﷺ جیابوونەوە بەناوی (خَوارج) واتە: دەرچووەکان، دەرچوو لە فەرمانبەریی ئیمام وپێشەوا و خەلیفەی مســوڵمانــان کە ئەو کـــاتە (علي) بوو ﷺ، (خوارج) یەکەمین کۆمەڵ و تاقمێك بوون کە (إبتداع)یان لە (دین)دا کرد، واتە بەشێکیان لە دین دا داهێنا، ئەوانی پێشتر چ کۆمەڵی (على) بوو، چ کۆمەڵی (معاويە) بوو، چ کۆمەڵــی (طـلحة و زبیــر) و ئەوان بوون، هیچ شــتێکیان لە (دین) دانەهێنا بوو- واتە لە بواری ئیمان و عەقیدەدا - بەڵکو هەموویان هەر لەســـەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بوون[55]، ناڵێین هەموویان لە یەك ئاست دابوون، بۆ نموونە (علي) و (معاوية) خواڵێیان ڕازی بێت بە هیچ پێوەرێــك و لە هیــچ ڕوویێکەوە و لەلایەن سەرجەم مســــــوڵمانانەوە لە تەرازوویەك دا دانەدەنران، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەموویان بەگشــتی لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر بوون ﷺ لە ڕووی ئیمان و عەقیدە و تێگەیشتن (فَهْم) ەوە.

---

(55) بەڵام دوایی (معاوية) وەك چۆن خەلیفایەتی یەکەی لە ئەنجامی جەنگ وکوشتاردا چنگ کەوت، لادان (انحراف) ێکی گەورەیشی لە حوکم و سیاسەت دا هێنایە کایەوە کە لە شوراوە گۆڕی بۆ میراتی (وراثي) و یەزیدی کوڕی بە زۆر بەسەر مسوڵماناندا سەپاند و بە هەرەشە و گوڕەشە و چاو بزکردنەوە لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ بە تۆبزی بەیعەتی خەلیفایەتی بۆ وەرگرت، کە نەك هەر شایستەی خەلیفایەتی نەبوو، بگرە مسوڵمانێکی ئاسایی و چاکیش نەبوو !!

بەڵام (خوارج) کە پێغەمبەریش ﷺ لە چەند فەرموودەیەکی دا ئاماژەیان پێ دەکات و لە بارەیانەوە دەفەرموێ (**يَمْرقون منَ الدِّين كما يَمْرُقُ السَّهْمُ منَ الرَّميَّةِ**)[56] واتە: ﴿کەسانێك دەبن لە (دین) دەردەچن وەکو چۆن تیـر لە نێچیر دەردەچێ، تیر کە لە نێچیر دەردەچێ هیچ خوێنی پێوە نایەت ئەوانیش ئاوا لە (دین) دەردەچن و هیچیان پێوە نامێنێ!﴾ .

جا پێغەمبەری خوا ﷺ چەندان فەرموودەی لە بارەیانەوە فەرمووە بۆ ئەوەی وا وەسفیان بکات و پێناسـەیان بکات کە هیچ کەس لە ناسـینیان دا بە هـەڵەدا نەچـێ، بۆ وێنە لە یەکێك لە فەرمایشـتەکانیدا بەڵگە و نیشانەیەکیان لە بارەوە دەخاتە ڕوو و ﴿ نیشـانەیان ئەوەیە کەسێکیان لەگەڵ دایە قۆڵێکی نوقصانە و باسکێکی وەك مەمکی ئافرەت وایەو (ذو الثّدي)ی پێ دەڵێن﴾ وەك لە (صحيح البخاري) دا هاتووە.

جا لەوەوە زانرا کە (خوارج) ئەو کۆمەڵەن کە پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرە وەسفی کردوون، ئەوەبوو کە پاش بیانووگرتن بە(عليّ)ﷺ و بەرز کردنەوەی شیعاری (لا حكم الاّ لله) وە جیابوونەوە لە سوپای خەلیفـە و ئیعلان کردنی جەنـگ لە دژی و دەسـت کردن بە کوشـتار، (عليّ) بە ناچـاری بۆیان چووە مەیدان و لە جەنگی (نهروان)دا جگە لە کەمێکیان قەلاچۆی کردن! جا ئەوە بوو کە پاش کۆتایی جەنگ، (علي) ﷺ فەرمانی کرد بە سوپایەکەی داخۆ جەنازەی ئەو کابرایەی کە پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرە وەسفی کردبوو نایدۆزێتەوە! کاتێك دۆزرایەوە وهەواڵیان بۆ هێنا سەجدەی شوکری بۆ خوا برد و گوتی: سوپاس بۆ خوا دیارە ئەوانە ئەو کۆمەڵە خراپەن کە پێغەمبەر ﷺ وەسفی

(56) رواه البخاري و مسلم .

کردوون بە خراپە و فەرموویەتی: ﴿جەنگیـان لەگـەڵ دا بکەن چونکـە لە کوشتنیان دا خێر و پاداشت هەیە﴾[57].

ئینجا ئایا (خوارج)، بیدعەتـەکەیان چی بوو کە دایان هێنـا؟! هەر بە کورتی دەڵێین: ئەوە بوو کە دەیانگـوت: ﴿هەر کەسـێك گوناحێکـی گەورە بکات (کافر) دەبێت﴾، واتە بەهەر جۆرە گوناحێك، ئەگەر نا ڕاستە گوناحێك شـەرع بە کوفری دانابێ، ئینسـان پێی کافر دەبێ، پێشـتر مسوڵمانان دەیانگوت هەرکەس کە گوناح دەکات گوناح بارە و ئیمانەکەی نوقصانە بەڵام هیچ کەس نەیدەگوت بە گوناحێك (کافر) دەبێت[58]، جا گوناحەکە چ کردنی شتێکی حەڕام بێ وەك قەتڵ و زینا، چ چواندنی شتێکی فەرز بێ وەك نوێژ و زەکات، کەواتە خەواریج و ئەهلی سوننەت بە پێچەوانەی (مُرْجِئة)ەوە لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە گوناح و تاوان زیان بە ئیمان دەگەیەنێ، بەڵام خەواریج دەڵێن: بە گوناحی گەورە ئینسـان کافر دەبێ و لە دین و ئیمان دەردەچێ، وە بۆ ئاگاداری و زانینتـان (خوارج) هەرکام لە (علي) و (عثمان) و (طلحة) و (زبیر) و (عائشة) و (معاویة) و(عمرو بن العاص) و(أبو موسی الأشعري) و ئەوانەیان هەموو پێ (کافر) بوو، چونکە دەیانگوت: ئەوانە جەنگیان لەگەڵ یەکتردا کردوە و یەکتریان کوشتوە!، وە هەر کەسێك ئەوانیشی پێ(کافر) نەبووایە بە (کافر) یان دەزانی !!

---

(57) متفق علیـه .

(58) دیارە بە مەرجێك ئەو گوناحە لە خودی خۆی دا کوفر نەبێت و شەرع بە کوفری دانەنابێ.

## سەرهەڵدانی (مرجئة) كان لە كاردانەوەی تێپەڕاندنی (خوارج)دا

لە كاردانەوەی (خوارج)دا (مرجئة) پەیدا بوون، جا بە زۆری بیدعەت و شت داهێنان لە (دین)دا لە كاردانەوەی یەكتردا بووە، كە (خوارج) دەیانگوت هەر كەسێك گوناحێكی گەورە بكات پێی (كافر) دەبێ، (مرجئة) لە كاردانەوەی ئەوان دا گوتیان: ئینسان هەرچەندە گوناحان بكات ئیمانەكەی زەرەر ناهێنێ!، جا (خوارج) وەك پێشتریش گوتمان بۆیە پێیان گوترا (خوارج)، چونكە لە فەرمانبەریی ئیمام و پێشەوای مسوڵمانان دەرچوون كە (علي بن أبي طالب)ە ڕەزای خوای لێ بێت، بەڵام ئایا (مرجئة) بۆچی پێیان گوترا (مرجئة)؟! وەك پێشتریش گوتمان چونكە كردەوەیان لە ئیمان دوا دەخست، دەیانگوت: ئیمان بە بێ كردەوەش هەر ئیمانە، وە دەیانگوت : ئیمانی كەسێك كە هەموو گوناحێك بكات لەگەڵ ئیمانی كەسێك كە یەك گوناح ناكات، هەروەك یەكن !، بەڵێ بۆیە ناونران (مرجئة) چونكە (أَخَّرُوا العمل عن الايمان، وأرجأوا العمل عن الايمان) وگوتیان، ئیمان هیچ پەیوەندی بە كردەوەو (طاعة)ەوە نیە و هیچ پەیوەندی بە گوناحەوە نیە، كە بێ گومان ئەمە بیدعەیە، وە ئەوەی (خوارج) یش هەر بیدعەتە كە دەڵێ: هەر كەسێك گوناح بكات پێی (كافر) دەبێت، واتە: هەم بیرۆكەی (مرجئە) بیدعەتە كە دەڵێ: هەچەندە ئینسان زۆر گوناحان بكات پێی (كافر) نابێت و ئیمانەكەی زەرەر ناهێنێت و هەم ئەوەی (خوارج)یش كە دەڵێ: بە گوناحێك ئینسان كافر دەبێت.

بەڵی ئەو دوو كۆمەڵانە بنچینەی پەیدا بوونی بیدعەت بوون لە مەسەلەی ئیمان دا، وە پێڕ و تاقمەكانی دیكە كەم و زۆر لە ژێر كاریگەریی بیروبۆچوونەكانی ئەم دوو تاقمە دابوون.

# چۆنیـەتی سـەرهەڵدانی جەهمـی یەکـان

ئینجا لە دوایی دا کۆمەڵێکی دی پەیدا بوون، کە شوێن کەوتووانی (جَهْم بن صَفْوان) بوون، جەهمی کوڕی صـەفوانی سـەمەرقەندی،کە لە ساڵی (128)ی کۆچی دا بە دەستی یەکێك لە (والي)یەکان کوژرا کە ناوی (نصر بن سیّار) بوو، لەبەرئەوە کە (جهم)ی کوڕی (صفوان) بڕوای بە هیچ سیفەت لە سیفەتەکانی خوا نەبوو و دەیگوت[59]: ﴿خوا یەك سیفەتی نیە﴾ وە هەروەها دەیگوت: ﴿ئیمان بەس بریتی یە لەوەی کە ئینسـان بزانـێ خوا هەیە و پێغەمبەر ﷺ هەیە وقیامەت هەیە، جا ئەگەر خواشی خۆش نەوێ و بە قسەی نەکات و هەرچی گوناحە بیکات وەهەرچی دژایەتی خوایە بیکات، ئەوە هەر ئیماندارە ، چونکە دەزانێ کە خوا هەیە!﴾، واتە بەو پێناسەی (جهم بن صـفوان) دەبێ (إبلیـس)یش هەر ئیماندار بێ، (فِرْعَون)یش کە دەیزانـی (موسی) ؏ پێغەمبەری خوایە هەر بە ئیمانـدار لە قەڵـەم بدرێ، وە (أبو جهل)یش کە دەیزانی (محمد) ﷺ پێغەمبەری خوایە، بەڵام ئیمانی پێ نەدەهێنا و بە زمان دانی پێدانەدەهێنا و بە کردەوە شوێنی نەدەکەوت، هەر بە ئیماندار لە قەڵەم بدرێ !!

بە کورتی: جەهمـی یەکان کە شـوێن کەوتەی (جهـم بن صـفوان السَّمرقندي)ین یەکێکن لە پیرِ و تاقمە بیدعەتچی یەکان و بگرە زۆرێك لە زانایان ئەو تاقمەیان بە مسوڵمان دانەناوە، وە کورتەی بیدعەتەکەشیان ئەوە

(59) نکووڵی کردنی جەهم لە سیفەتەکانی خوا (جلّ جلاله) بە حیسابی خۆی بۆ بەرگری کردنە لە خوا بە یەکگرتن (توحید) ، چونکە پێی وابوو مادام سیفەتەکانی خوا وەك زاتی ئەزەلیی و بێ سەرەتا بن، کەواتە (تعدّد القدماء) ڕوو دەدات و ئەوەش بە پێچەوانەی یەکتایی خوایە !!

بوو کە دەیان گوت: ئیمان بریتی یە لە (المعرفة المجرّدة) ﴿زانینی ڕووت﴾ واتە: بەس بزانیێ کە خوا هەقە و پێغەمبەری خوا ﷺ هەقە و ئیسلام هەقە با خۆشیشی نەوێن وە بە ئەمر و نەهی یەکانیانەوە پابەندیش نەبێ هەر ئەهلی ئیمـــانە !!

## چۆنیەتی سەرهەڵدانی تاقمی موعتەزیلەکان

پاشان پیڕ و تاقمێکی دیکـەش جیا بوونەوە بە نـــاوی (المُعْتَــزِلَة) کە سەرۆکەکەیان کابرایەك بوو بە ناوی (واصل بن عطاء) ئینجا ئایا ، بۆچی ناویان لـێنرا (مُعتزلـــة)؟! چونکە (واصل بن عطــاء) یەکێـــك بووە لە قوتابییەکانی (الحســن البصري) ڕۆژێکیان (حسن) کە بە (سید التابعیــن) ناسراوە لە مزگەوتی شاری بەصرەدا خەریك بوو دەرسی دەگوتەوە (واصل بن عطاء) ئەو پرسیارەی ئاڕاستەی (حەســـەنی بەصڕیی) کرد و ئەم مشــت و مڕەیان بوو:

کە ئایا کەسێك گوناحی گەورە بکات بە کافری دەزانیت یان بە مسوڵمان؟! حەسەنی بەصڕیی لە وەڵام دا گوتی: بەڵێ من بە مسوڵمانی دەزانم، (واصل) گوتی: نەخێر مسوڵمان نیە،(حسن) گوتی: ئەدی کافرە؟! (واصل) گوتی: نەخێر کافریش نیە،(حسن) گوتی: ئەدی چی‌یە؟! (واصل) گوتی: (لە منزلة بین المنزلتین) پلەیەکی هەیە لە نێوان دوو پلەکان دا ﴿لە ئیمان چۆتە دەرێ وکافریش نەبووە﴾، (حسن)یش گوتی: جا ئەوەی تۆ دەیڵێی (بیدعة)یە! وە سەرەنجام (واصل) لە کۆڕی (حسن) جیابۆوە و لە گۆشەیەکی مزگەوتەکەدا خۆی کۆڕێکی سازدا[60].

---

(60) لە هەندێك سەرچاوان دا هاتووە کە پاش گۆشەگیریی و جیایی (واصل) ، (حسن) گوتوویەتی: (اِعْتَزَلَنا واصل بن عطاء) جا لەوەوە ناونران (معتزلة) .

بەڵێ (معتزلة) ش بیدعەتێکی دیکەیان داهێنا، بە حیساب بۆ ئەوەی لە نێوان (حق)و (باطل)دا چارەسەرێکی میانجییانە (حَلٌّ وَسَط) و صولْحێك بکەن ! وە بۆ زانینتان هەمیشە (حل وسط) چارەسەری میانجی لە نێوان هەق و ناهەق دا تەنیا بە زەرەری هەق تەواو دەبێ، واتە ئەگەر بتەوێ هەق و ناهەق ڕێك بخەی هەمیشە بە زەرەری هەق تەواو دەبێ، چونکە وەك خوا فەرموویەتی ﴿ فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلاَّ الضَّلاَلُ ﴾[61] لە دوای هەق هەر گومڕایی هەیە، (2+2=4) یەکێك بڵێ نەخێر دەکاتە (10) هەزار، یەکێکی تر بڵێ نزیکی دەکەمەوە، نەخێر دەکاتە (5) پێنج، ئەوە بێگومان بە زەرەری هەقەکەیە، بەڵێ لێی نزیك کەوتۆتەوە بەڵام گرنگ ئەوەیە هەر (باطل) و هەڵەیە !

(مُعْتَزِلة)ش وەك پێشتریش گوتمان ئەو کۆمەڵە بوون کە دەیانگوت: خاوەنی گوناحی گەورە (مُرْتَکِب الکبیرة) ئیماندار نیە، بەڵام کافریش نیە! بەڵکو لەو نێوانە دایە و لە قیامەتیش دا هەر دەچێ بۆ دۆزەخ و لێشی نایەتە دەرەوە !!

## کەڕرامی یەکان کێ بوون و چی یان دەگوت ؟!

(کَرّامیة)یەکانیش کە هەر دەستەیەکن لە (مُرْجِئة)و شوێنکەوتووانی: (محمد بن کَرّام السّجستاني)ین کە لە ساڵی (255) کۆچی دا مردوە، ئەوانیش کۆمەڵێکی تر بوون لەو پێڕ و تاقمە لادەر و داهێنەرانەی کە لە مەسەلەی پێناسەی ئیمان دا لە ڕاستە شەقام لایان دابوو وە دەیانگوت:

(61) یونس (32) .

ئیمان بەس بریتـی یە لەوەی کە ئینسـان شـایەتمان بهێنێ، کە شـایەتمانی هێنـا ئەوە ئیماندارە!، کەواتە بە قسەی ئەوان (مُنافِق)ەکانیش هەر ئیماندارن !!، دیارە ئەهلی سـوننەت و جەماعەتیش دەڵێن: هەر کەسـێك شـایەتمانی هێنـا بە مەرجێك شـتێکی پێچەوانـەی شـایەتمانی لـێ نەبینـرێ واتە هەڵوەشێنەرەوەیەکی[62] شایەتمانی تێدا نەبێ بە ڕواڵەت بە مسـوڵمان لە قەڵەم دەدرێ بەڵام بە ئیماندار لە قەڵەم نادرێ، واتە: لە ژیانی دنیـادا وەك مسوڵمان ڕەفتار و مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ و یاسا شەرعی یە ڕواڵەتی یەکان (أحكام الشرع الظاهرة)ی بەسەردا جێبەجێ دەکرێن و گیان و سامانی دەپارێزرێن، بەڵام لە دواڕۆژدا ناچێتە بەهەشت، چونکە ئیمان مەرجی تەنهاو تەنهای چوونە بەهەشتە و پێشتریش باسمان کرد ئیمان لە چی و چی پێك دێ.

بەڵام (کەڕرامیەکان) دەڵێن: نەخێر هەر کەسێك شایەتمان بهێنێ ئەوە ئیمانێکی زۆر پتەوی هەیە، با لە دڵیشی دا هیچ شتێك نەبێ، یەعنی با عەقیدە و قەناعەت وخۆشەویستی خواو پێغەمبەرﷺ و ئیسلامیشی نەبێ و هیچ کردەوەی باشیشـی نەبێ، وە با لە هیـچ کاروکردەوەیەکـی خراپیـش نەپرینگێتەوە، مادام شایەتمانی هێنابێ ئەوە مسوڵمان وخاوەن ئیمانێکی تێرو تەواوە !!

(62) لە دەرسەکانی داهاتوودا بە تێر و تەسەلی باسی هەڵوەشێنەرەوەکانی شایەتمان (نواقض الشهادتين) دەکەین .

## ئاكامی مشـت و مڕی ئەهلی بیدعەت دەربارەی ئیمان و سـەرهەڵدانی هـەردووك قوتابخانەی ئەشـعەریی یەكان و ماتۆریدیی یەكان

لە ئەنجام و ئاكامی مشت ومڕی كێشەكێشی نێوان ئەو پێڕ و تاقمانەدا كە بە ڕێبازی ڕاست و ڕوون و فیتڕیی یانە و بێ گرێ و گۆڵی پێشینەی چاك (السلف الصالح)مان قەناعەتیان نەكردبوو، سەرەنجام دوو جەمسەری دژ بە یەكی (خوارج) و(جهمیة) كە یەكەمیان ئەوپەڕی جەمسەری تێپەڕاندن (إفراط) و دووەمیان ئەو پەڕی جەمسەری بەزایەدان (تَفْریط) یان گرتبوو، بەڵێ ئەو دوو جەمسەرە زۆر دوور لە یەك و دژ بە یەكە لە ئەنجامی كێشە و مشت و مڕی نێوانیان لە لایەكەوە و فشار و كاریگەریی زانا و پێشەوایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتەوە لە لایەكی دیكەوە وردە وردە سووك (تخفیف) بوونەوە و، هەرچی بیرۆكەی (خوارج) بوو جێگای خۆی دا بە (معتزلة)و، (مُرْجئـــــة)ش جێگای (جهمیـــــــة)یان گرتەوە، بەڵام بێگومان كەم و زۆر بیـروبۆچوونەكانی هەر كام لە (خوارج)و(جهمیە)هەر مان و ئێستاش هەر هەن !

پاشان لە ئەنجامی شكستی (معتزلة) لە بەرانبەر ڕێبازی ئەهلی سوننەت دا لە لایەكەوە و لە لایەكی دیكەشەوە بەهۆی زاڵبوونی ڕووحی خۆسەپاندن و دیكتاتۆری یەت بەسەر بە ناو خەلیفە و كاربەدەستان دا لە بەرانبەر ئۆممەت دا بە گشتی و زانا و پێشەوایان دا بە تایبەت، دیارە زانا و پێشەوایانی ڕاست و ڕەسەن نەك بە ناو زانا و بە پۆشاك و دیكۆر و ڕواڵەت

پێشـــەوایان کە هەمیشە ودایم لە خزمەت دام ودەزگاکـــانی حوکمڕانیی دابوون و هەن !

بەڵێ جا لە ئەنجامی ئەوەدا و بەو هۆیەوە کە باسمان کرد لە ئاکام دا ڕێگا بۆ بیرۆکەی سست و خاوکەرەوە و خەسێنەرانەی (مُرْجِئة) تەخت بوو ، زۆربەی ئۆممەت بەهۆی (تَبَنِّي) کردنی هەر کام لە قوتابخانەی (الأشاعرة) و (الماتريدية) بۆ بیرۆکەی (إرجاء) کەوتنە ژێر کاریگەریی ئەو بیرۆکەیەوە، شایانی باسیشە کە قوتابخانەی (الأشاعرة) کە پەیڕەوانی لە ڕووی فیقهی یەوە شافیعی مەزەب بوون وە قوتابخانەی (الماتريدية) کە لە ڕووی فیقهی یەوە حەنەفی مەزەب بوون، جگە لە چەند مەسەلە و بابەتێکی گچکە و لاوەکیی هیچ جیاوازی یەکی ئەوتۆیان لە نێوان دا نەبووە.

ئێستاش با بۆ ئیسپاتی ئەوە کە هەر کام لە ئەشعەریی یەکان و ماتورێدیی یەکان لە ئاکام دا بیرۆکەی (مرجئة) یان هەڵگرت، چەند دەقێك لە کتێبەکانی ئەو دوو قوتابخانەیەوە بهێننەوە، بەڵام پێویستە ئەوە بزانرێ ڕەخنە گرتنمان لەو دوو قوتابخانەیە بە هیچ جۆرێك ڕێز و حورمەت نەگرتن و تەقدیر نەکردنی ئەو زانا پێشەوایانە ناگەیەنێ کە جڵەو بە دەست وپەیڕەوانی ئەو دوو قوتابخانەیە بوون بە تایبەت (أبو الحسن الأشعري) و (أبو منصور الماتريدي) کە دوو کەڵە زانای بەرجەستەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بوون.

وەك پێشتریش گوتمان (أبو الحسن الأشعري) کاتی خۆی لە پەیڕەوانی (إعتزال) بووە بەڵام دوایی گەڕاوەتەوە بۆ سەر ڕێبازی پێشینەی چاك و ئەهلی

سوننەت و جەماعەت[63]، بەڵام لە بارەی پێناسەی ئیمانەوە کەم و زۆر کەوتۆتە ژێر کاریگەریی و فشاری بیرۆکەی (إرجاء) ەوە!

جا (أبو الحسن) لە بارەی پێناسەی ئیمانەوە لە کتێبێکی خۆی دا گوتوویەتی:

**﴿فإن قال قائل: ما الإيمانُ عندكم بالله تعالى ؟! قيل له: هو التصديق بالله، وعلى ذلك إجماع أهل اللغة التي نزل بها القرآن﴾([ ])**.

(63) دەگێڕنەوە کە هۆی دەست هەڵگرتنی (أبو الحسن) لە بیرۆکەی (إعتزال) ئەوە بوو کە یەکێك لە بنچینەکانی ڕێچکەی (معتزلة) ئەوەیە کە لەسەر خوای پەروەردگار پێویستە ئەوە ڕەچاو بکات کە بەرژەوەندی چاکتری بەندەکانی تێدایە، جا ڕۆژێکیان (أبو الحسن) پرسیارێك لە (أبو علي الجبّائي) مامۆستای دەکات و دەڵێ: باشە ئەگەر سێ کەس هەبن برا بن و یەکیان بە گەورەیی و بە ئیمانەوە مردبێ و ئەوی دیکەیان بە گەورەیی بە کافریی و سێیەمیشیان بە منداڵی و نە باڵقیی، لە قیامەتێ وەزعیان چۆنە؟ (أبو علي) یش دەڵێ: برا گەورە مسوڵمانەکە لە پلە بەرزەکانی بەهەشتە و کافرەکە لە دۆزەخ و منداڵەکەش قوتار دەبێ و بەهەشتی یە، بەڵام چونکە تاعەتی نیە پلەی نزمترە ! (أبو الحسن) یش دەڵێ: جا ئەو کاتە منداڵەکە بۆی هەیە – بە پێی بنچینەی ئێوە – کە ڕەخنە لە خوا بگرێ و بڵێ: بۆچی منیشت وەك برا گەورە مسوڵمانەکەم نەژیاند تاکو منیش پلە بەرزەکان بگرم ؟! (أبو علي) یش دەڵێ: خوای کاربەجێ پێی دەفەرموێ : ئاخر بۆ تۆ ئەمە چاکتر بوو، چونکە من دەمزانی ئەگەر مابایەوە و گەورە و باڵغ بووبای کافر دەبووی و بە مەرەدی برا کافرەکەت دەچووی !

ئینجا (أبو الحسن) ئەو (تەڵە)یەی کە مامۆستایەکەی دایبنابوو تەقاندی و گوتی: جا ئەو کاتە برا کافرەکەش بۆی هەیە ڕەخنە بگرێ و بڵێ : دەجا خوای پەروەردگار مادام وایە بۆچی منیشت بە نەباڵغی نەمراند و بۆچی هێشتت گەورە بم و کافر بم تووشی دۆزەخ ببم؟! جا لێرەدا (أبو علي الجنابي) ڕاوەستا و داما، وە دەرکەوت کە ئەو بنەمایەی ڕێچکەی (إعتزال) وەك سەرجەم بنەما داهێنراوەکانی دیکەیان هەڵەیە.

واتە: جا ئەگەر یەکێك گوتی: ئیمان بە خوای بەرز لای ئێوە چی یە؟! پێی دەگوترێ: بریتی یە لە بە ڕاست زانینی بوونی خوا، وە ئەوەش یەکدەنگیی ئەو شارەزایانەی زمانی عارەبی لەسەرە کە قورئانی پێ هاتۆتە خوارێ.

دیارە (أبو الحسن الأشعري) تاکە بەڵگەیەکیشی بۆ ئیسپاتی قسەکەی کە ئیمان لە زمانی عارەبی دا بە مانای (تصدیق)ە ئایەتەکەی سوورەتی (یوسف)ە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا أَنْتَ بِمُؤْمِنٍ لَنَا وَلَوْ كُنَّا صَادِقِينَ ﴾(17).

جا هەرچەندە ئێمە لە دوایی دا بەرپەرچی ئەو جۆرە بەڵگە هێنانەوانە دەدەینەوە، بەڵام لێرەش هەر بە کورتی دەڵێین:

یەکەم: ڕاست نیە کە بۆ زانینی پێناسە و واتای زاراوە و وشە شەرعییەکان بەس گەڕانەوە بۆ زمانی عارەبی مەدار ساز بکات، چونکە گەلێك جاران شەرع چەمك و واتای و شەو زاراوە عارەبی یەکانی زۆر گۆڕیوە ، بۆ وێنە هەر کام لە وشەکانی (صلاة) و(زكاة) و(حج) و(صوم) کە یەکەمیان لە ئەسڵی زمان دا (دعاء)و دووەمیان (تطهیر و نمّو)و سێیەمیان (قصد) و چوارەمیان(إمساك)دەگەیەنێ پاش بەکارهێنانیان لە قورئان و سوننەت دا چەمك و واتایەکی زۆر جیاوازیان بۆ پەیدا بووە!

دووەم: هەروەها ڕاستیش نیە کە وشەی (تصدیق) یش پڕ بە پێستی وشەی (إيمان) بێت، وە راستیش نیە کە (تصدیق) تەنها بە ڕاست دانانی دڵ و پێ لێنانی زمان (إقرار اللسان) بگەیەنێ، وەك لە دەرسی یەکەم دا خستمانە ڕوو !

(64) بڕوانە : (اللّمَع) ص 123، کە هی (أبو الحسن الأشعري) یە.

ئینجا (الباقلاني)یش کە یەکێکە لە شارەزایانی قوتابخانەی (الأشاعرة) لە کتێبی (التمهید)دا هەمان قسەی (أبو الحسن) بۆ پێناسەی ئیمان دووبارە دەکاتەوە[65] .

هەروەها (عبدالقاهر البغدادي)کە بە (الأسْفَراييني)ناسراوە و یەکێکە لە زانا بەرجەستەکانی سەر بە قوتابخانەی (الأشاعرة) لە کتێبی: (أُصول الدين)دا هەمان مەبەست دووبارە دەکاتەوە و دەڵێ:[66]

﴿الطاعات عندنا أقسامٌ، أعلاها يصير بها المطيع عندالله مؤمنا ويكون عاقبته بأجْلِها الجنة إنْ مات عليها، وهي معرفة أصول الدين في العَدْلِ و التوحيد والوعد والوعيد والنبوات والكرامات ومعرفة اركان شريعة الاسلام و بهذه المعرفة يخرج من الكفر.

والقسم الثاني إظهار ما ذكرناه باللسان مَرَّةً واحِدةً وبه يَسْلَم من الجزية و القتل والسَّلب والإسترقاق وبه تحل المناكحة واستحلال الذبيحة والمعارفة والدَّفن في مقابر المسلمين والصلاة عليه وخَلْفَهُ.

والقسم الثالث إقامة الفرائض وآجتناب الكبائر وبه يسلم من دخول النار ويصير به مقبول الشهادة.

والقسم الرابع فيها زيادة النوافل وبها يكون له الزيادة من الكرامة و الولاية﴾.

واتە: خواپەرستیی و فەرمانبەریی و دینداریی لای ئێمە چوار بەشە:

(65) بڕوانە : ( التمهيد ) للباقلاني ص 346، 347.

(66) بڕوانە : ( أصول الدين ) للأسفراييني، ص 268.

1- بەرزترینیان کە بابای فەرمانبەر (مطیع) لە لای خوا پێی دەبێتە بڕوادارو بەهۆیەوە سەرەنجامی بەهەشت دەبێ ئەگەر لەسەری بمرێ، ئەمیش بریتی یە لە: ناسین و زانینی بنچینەکانی ئایین لە دادگەریی خوا لە قەزاو قەدەری دا و خوا بە یەکگرتن وبەڵێن وموژدەی خوا وهەڕەشە و ترساندنی (کە هەقن و دێنە دی) وە مەسەلەکانی وەحیی و پێغەمبەرایەتی و کەرامەتی دۆستانی خوا و زانینی پایەکانی شەریعەتی ئیسلام، وە بەم زانینە لە کوفر رزگاری دەبێ (دەچێتە بازنەی ئیمانەوە).

2- بەشی دووەمیش بریتی یە لە دەرخستن و ئاشکرا کردنی ئەوەی کە باسمان کرد بە زمان ئەگەر تەنها یەك جاریش بێ، وە بەمەش لە سەرانە دان و کوشتن و ڕووت کرانەوەوکرانە کۆیلە سەلامەت دەبێ و، حەلاڵ بوونی ژن و ژن خوازیی و سەربڕاویش هەر بەمە دەبێ، هەروەها ناسران بە مسوڵمان و لە گۆڕستانی مسوڵمانان نێژران و نوێژ لەسەر کران و نوێژ لە پشتەوە کرانیش بەهەمان شێوە.

3- بەشی سێیەمی دینداریش بریتی یە لە بەرپا کردن و بەجێ هێنانی فەرزەکان و خۆ دوورگرتن لە گوناحە زلەکان، کە بەمەش لە چوونە دۆزەخ سەلامەت دەبێ (لە دوا ڕۆژدا) و لە دنیاش دا بە دادگەرو شایەدیی لێ وەرگیراو دادەنرێ.

4- بەشی چوارەمیش بریتی یە لە زیاد کردنی سوننەتان و بەمەش ڕێز و حورمەت و دۆستایەتی لە لای خوا زیاد دەکات.

جا ئێمە هیچ قسە و تێبینیمان لەسەر خاڵی چوارەم نیە، بەڵام خاڵەکانی تر ئەم ڕەخنە و سەرنجانەمان لەسەریان هەیە:

1- جاریٰ لە بارەی خاڵی یەکەمەوە دەڵێین: ئەو بەشەی ئیمان کە لە دڵ و عەقڵ دا جێگیر دەبێ تەنها دوو پێکهێنەری ئیمانن و ئیمانیان پێ نایەتە دی ئەمە لە لایەکەوە و لە لایەکی دیکەشەوە ئەو بەشە ئیمانەی کە لە دڵ و دەروون دایە تەنها (معرفـــة) نیە ! بەڵکو هەم زانین (معرفة) و هەم بە ڕاست زانین (تصدیق) و هەم پەسند کردن و تەسلیم بوون (قبول و إذعان) یشە!

2- وە لە بارەی خاڵی دووەمیشەوە دەڵێین: دەربڕینی زمان وەك چۆن مەرجی بە مسوڵمان دانرانە بۆ دنیا، مەرجی بە ئیماندار دانرانیشە بۆ دوا ڕۆژ چونکە وەك پێشتر خستمانە ڕوو - لە دەرسی یەکەم دا - دان پێداهێنانی زمانیش پێکهێنەرێکی بنەڕەتی ئیمانە ! ئەمە لە لایەك لە لایەکی دیکەشەوە ڕاست نیە کە ئینسان تەنها بە شایەتمان هێنان هەمیشە هەر بە مسوڵمان دابنرێ، بەڵکو جینس و ئەسڵی کردەوەش کە پێکهێنەرێکی ئیمانە مەرجە بۆ بە مسوڵمان دانرانی ئینسان.

3- لە بارەی خاڵی سێیەمیشەوە دەڵێین: جێبەجێ کردنی فەرزەکان و خۆ دوور گـرتن لە گوناحــە زلەکـــان (إقامة الواجبات واجتناب الکبائر)بە گشتی وەك ئەسڵ تەنها مەرجی بە دادگەر(عَدْل) دانران و شایەدیی لێ وەرگیـران نیە، بەڵکو مەرجـی بە مسوڵمان دانرانیشە، چونکە کەسێك هیچ تاعەتێك ئەنجام نەدات ولە هیچ گوناحێك پارێز نەکات ناگونجێ بە مســـوڵمان دابنرێت وەك لە دەرســـی یەکەم دا خستمانە ڕوو، وە وەك پێشتریش گوتمان ئەسڵی کردەوە(أصل العمل)ی

ئەندامەکان یەکێکە لە پێکهێنەرەکانی ئیمان، پاشان دەڵێن ڕستەی: (جێبەجێکردنی فەڕزەکان وخۆ پاراستن لەگوناحە گەورەکان) ئاوا بە موتڵەقی بەس نیە بۆ پارێزران لە چوونە دۆزەخ و یەکسەر چوونە بەهەشت! بەڵکو دەبووایە بڵێ: بەجێ هێنانی سەرجەم فەڕزەکان و خۆ دوور گرتن لە تێکڕای گوناحە گەورەکان، یان دەبووایە بڵێ: بەجێ هێنانی فەڕزەکان و خۆ پاراستن لە گوناحە گەورەکان، مەگەر گەڕانەوەی ساغ (التوبة النصوح)یان لەسەر بکات بەر لە حاڵەتی تۆبە تێدا قبووڵ نەکران !

چونکە بێگومان ئەگەر بەند (قَیْد) ی هەموو (کلّ) یان تێکرا (جمیع) نەخرێتە سەر وشەی فەڕزەکان (الواجبات) وگوناحە زلەکان (الکبائر)، ئەوە ئیحتیمالی فەڕز چواندن وگوناح کردن هەر هەیە و، هەر کەسێکیش فەڕزێك بچوێنێ یان گوناحێك بکات، ئەوە ئەگەر تۆبەی ڕاست وساغی بەدوادا نەیەت خاوەنەکەی یەکسەر چوونە بەهەشت و پارێزران لە دۆزەخی بۆ مسۆگەر نەبووە، بەڵکو لە ژێر سایەی ویست (إرادة)ی خوا دایە و ئەگەر ویستی لێی دەبووری و یەکسەر دەیباتە بەهەشت، ئەگەر نا بە ئەندازەی گوناحەکەی کە بە (فەڕز چواندن یان قەدەغە شکاندن) دێتە دی سزای دۆزەخ دەچێژێ و پاشان قوتاری دەبێت و دەچێتە بەهەشت.

وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ **إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ...** ﴾ **النساء -48-** .

ئەوە لە بارەی ئیسپاتی کار تێ کران (متأثر)ی ئەشعەرییەکان لە پێناسەی ئیمان دا لە لایەن بیرۆکەی ئیرجائی (الفکرة الإرجائیة)یەوە، ئینجا

با چەند دەقێکیش لە زمان ولە سەرچاوەکانی قوتابخانەی ماتوریدیی یەکانەوە بهێنینەوە بۆ ئیسپاتی هەمان مەبەست:

(النَّسفي) کە یەکێکە لە زانایانی قوتابخانەی (الماتريدية) و لە دوای (أبو منصور الماتريدي) بە گەورەترین زانای ئەو قوتابخانەیە دادەنرێ لەو بارەوە گوتوویەتی: (67)

﴿الإيمان في اللغة عبارة عن التصديق: فكلُّ مَنْ صَدَّقَ غيره فيما يُخبره يُسمى في اللغة مؤمنا به ومؤمنا له، والإقرار يحتاج اليه ليَطَّلِعَ عليه الخَلْقُ، و هذا هو المرويُّ عن أبي حنيفة رحمه الله واليه ذهب الشيخ ابو منصور الماتريدي رحمه الله وهو أصحُّ الروايتين عن أبي الحسن الأشعري﴾ .

واتە: ئیمان لە زمان دا بریتی یە لە بە ڕاست دانان (تصديق) ، جا هەر کەسێك غەیری خۆی بە ڕاست دابنێ لە شتێك دا کە هەواڵی پێ دەدات ئەوە لە زمان دا پێی دەگوترێ: ئیمانی پێ هێناوە و ئیمانی بۆ هێناوە، دان پێداهێنان (إقرار)یش لەبەرئەوە پێویستە تاکو خەڵکی بزانن کە ئیمانی هێناوە، وە ئەم ڕایەش لە (أبو حنيفة) ەوە خوا لێی خۆش بێ گێڕراوەتەوە، وە (الشيخ أبو منصور الماتريدي) یش هەمان ڕای هەیە خوا لێی خۆش بێ، وە ئەم ڕایە ڕاست ترینی دوو ڕایەکانە کە لە (أبو الحسن الأشعري)یشەوە گێڕراوەتەوە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم تێبینی یەك لەسەر ئەو قسەیەی (النَّسفي) بخەمە ڕوو کە دەڵێ ئەو ڕایە - کە ئیمان بریتی یە لە تەنها (تصديق)- ڕای (أبو حنيفة)شە !

---

(67) بڕوانە : ( التمهيد في أصول الدين ) ص 99، 100، کە نووسراوی ( النسفي ) یە.

چونکە لە ڕاستی دا وا نیە و (أبو حنیفة) گوتوویەتی: ﴿کردەوەی ئەندامەکان بەشێك نیە لە ئیمان، بەڵام زادە و بەرهەمی ئیمانە و لە ئیمان جیا نابێتەوە و هەر کەسێك ئیمانی هەبوو کردەوە و پابەندیی (إلتزام) یشی دەبێ﴾.

کەواتە: قسەکەی (أبو حنیفة) لەگەڵ هی باقی زانا و پێشەوایانی (أهل السنة والجماعة)دا لە ئەنجام دا دەبێتەوە بە یەك ولە هی (مُرْجئة) جیا دەبێتەوە! واتە هەرچەندە قسەکەی (أبو حنیفة) لە سەرەتاوە لە هی (مُرْجئة) نزیکە، بەڵام لە ئاکام و ئەنجامی کۆتایی دا لێیان دوور دەکەوێتەوە و لەگەڵ هی باقی زانایانی پێشینەی چاك یەك دەگرێتەوە، چونکە (مرجئة) دەڵێن: کردەوە (عمل) هیچ پەیوەندیی بە ئیمانەوە نیە و پێی کەم و زیاد ناکات! بەڵام (ابو حنیفة) دەڵێ کردەوە چاکەکان (الأعمال الصالحة) و پابەندیی بە شەریعەتەوە بەرهەم ونیشانەی ئیمانە وهەبوونی بەڵگەی بوون (وجود)یەتی و نەبوون و دیار نەبوونیشی بەڵگە و نیشانەی نەبوون (عَدَم) یەتی!

هەر بۆیەش (إبن أبي العزّ الحنفي) لەو بارەوە گوتوویەتی[68] ڕا جیایی نێوان (أبو حنیفة) وباقی زانایان ڕا جیایی یەکی وشەیی (إختلاف لفظي)یە، مەبەستی ئەوەیە کە هەردووك رایەکان لە نێوەڕۆك دا هەر یەکن چونکە هەردووك ڕایەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە کردەوە لە ئیمان جیا نابێتەوەو ئیمان بە بێ کردەوە و پابەندیی نایەتە دی!

بەڵام بێگومان ئەگەر قسەکەی (أبن أبي العز) ڕاستیش بێت قسەکەی (ابو حنیفة) هەر باش نیە خوا لێی خۆش بێت، چونکە، یەکەم: وەك لە

(68) بڕوانە : (تهذيب العقيدة الطحاوية) ص264، أبو بصير.

دەرسی یەکەم دا خستمانە ڕوو دەقەکانی قورئان و سوننەت هەر ئەوەیان لێ وەردەگیرێ کە کردەوەی ئەندامەکان (أعمال الجوارح) پێکهێنەرێکی بنەڕەتی ئیمانە .

دووەم: ئەو قسەیەی (ابو حنیفة) بۆتە بیانووی کەسانێك کە بڵێن: کردەوەی چاك هیچ پەیوەندی یەکی بە ئیمانەوە نیە !

یەکی دیکە لەو زانایانەی کە سەر بە قوتابخانەی (الماتريدية) یە و لە بارەی ئیمانەوە هەمان ڕا و بۆچوونی هەیە بریتی یە لە (الشیخ ملا علي القاري)، جا ئەمیش لە کتێبی: (شرح الفقه الاکبر) دا لەو بارەوە گوتوویەتی: (69)

﴿ذهب جمهور المحققين الى ان الايمان هو التصديق بالقلب وانما شرّع الإقرار لإجراء الأحكام في الدنيا، لِما انَّ التصديق أمْرٌ باطنيٌّ لابُدَّ له مِنْ عَلامة، فَمَنْ صدَّقَ بقلبه ولم يُقِرَّ بِلِسانه فهو مؤمن عند الله تعالى، وإنْ لم يكن مؤمناً في احكام الدنيا، ومَنْ أقرَّ بلسانه ولم يُصَدِّق بقلبه كالمنافق فهو العكس، هذا هو إختيار الشيخ أبو منصور الماتريدي والنصوص موافقة لذلك﴾ .

واتە: زۆربەی لێکۆڵەرەوە سەر ڕاستەکان ڕایان وایە کە ئیمان بریتی یە لە بە ڕاست دانانی بە دڵ، وە دان پێداهێنانی بە زمان تەنها بۆ جێبەجێ کردنی یاساکانە لە ژیانی دنیادا، چونکە بە ڕاست دانان (تصدیق) شتێکی پەنهانە و دەبێ نیشانەیەکی هەبێ پێی بزانرێ، کەواتە هەر کەسێك بە دڵ بە ڕاست زانین (تصدیق)ی هەبێ ئەگەر بە زمانیش دانی

(69) بڕوانە: (شرح الفقه الاکبر) کە هی (ملا علي القاري)یە و کتێبی (الفقه الاکبر ) ی ( ابو حنیفة ) ی پێ شەرح کردوە کە لە بارەی ئیمان و عەقیدەوەیە، ص 69، 70.

پێدانەهێنیَ ئەوە لە لای خوای بەرز هەر بڕواداره، هەرچەندە لە ڕووی مامەڵەی دنیایی یەوە بە بڕواداریش دانەنریَ، کەسێکیش کە بە زمان دان پێدا دێنیَ بەڵام بە دڵ بە ڕاستی نازانیَ وەك مونافیقەکان ئەوە بە پێچەوانەوەیە (واتە هەرچەندە لە دنیادا وەك مسوڵمان حیسابی بۆ دەکریَ بەڵام لە لای خوا هیچە) ئا ئەمە ڕای پەسند کراوی (الشيخ ابو منصور الماتريدي)یە ودەقەکانیش هەر پشتگیری ئەم ڕایە دەکەن.

منیش دەڵێم:

لە ڕابردوودا دەرکەوت و لە داهاتووش دا زیاتر دەیخەینە ڕوو کە بە پێچەوانەوەیە و دەقەکانی قورئان و سوونەت ئەوە ناگەیەنن، لەگەڵ ڕێز و حورمەتی زۆرمان بۆ ئەو زانا و شارەزایانەی کە ئەو ڕایەیان هەڵبژاردوە کە بێگومان ڕای(مُرجئة)یە نەك هی پێشینەی چاکمان وهی ئەهلی سوننەتو جەماعەت .

## هەڵسەنگاندنی بیر و بۆچوونەکانی ئەهلی بیدعەت لە بارەی ئیمانەوە

### 1- ڕەخنە لیَ گرتنی ( خوارج ) و ( معتزله ) :

سەرەتا دەربارەی (خوارج ومعتزلة) دەدوێین، ئەوە بوو وەك باسمان کرد کە (خوارج و معتزلة) دەڵێن : ئیمان بریتی یە لە هەموو کردەوەکان واتە: ﴿ خۆ پاراستن لە هەموو گوناحە گەورەکان وە کردنی هەموو فەرزەکان﴾(70)، بەڵکو هەندێکیان دەڵێن خۆ پاراستن لە شتە نا

(70) واتە : وێڕای پێکهێنەرەکانی دیکەی ئیمان لە زانین و بە ڕاست دانانی عەقڵ و دڵ و قبووڵ و پەسند کردنی دەروون و دان پێداهێنانی زمان.

پەسندەکانیش واتە (المكروهات)وە کردنی سوننەتەکانیش مەرجە بۆ هاتنە دی ئیمان، بەلاّم زۆربەیان دەڵێن نەخێر مسولّمان ئەگەر سوننەتان نەشکات پێی (کافر) نابێ، بەلاّم یەك فەرز بفەوتێنێ لە (دین) دەچێتە دەر، وە یەك شتی حەرامیش بکات دیسان لە (دین) دەچێتە دەر !!

لە وەلاّمیان دا دەڵێین:ڕاستە کردەوە بەشێکە لە ئیمان و پێکهێنەریەتی بەلاّم وەك ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەڵێن: ئەسڵی کردەوە وە جینسی کردەوە پێکهێنەری ئیمانە نەك هەموو کردەوەیەك، جا ئایا ئەمە یانی چی؟! یانی کەسێك یەك کردەوەی نەبێ و هیچ شتێك لە ئیسلام جێبەجێ نەکات، ناتوانێ بڵێ مسولّمانم، بەلاّم مەرج نیە ئەگەر کردەوەیەکی چاکی چواند، یان خراپەیەکی کرد بڵێی ئەوە (کافر) بووە، بەڵگەمان چی یە؟!

## بەڵگەی کافر نەبوونی مسولّمان بەهۆی گوناحانەوە

یەکەم: یاسا و سنوور وتۆڵە و سزا شەرعی یەکان خوای پەروەردگار بۆ مسولّمانانی تاوانبار و گوناحباری داناون، تۆڵەی کوشتنی داناوە بۆ کەسێك کە مسولّمانێك بە ناهەق بکوژێ، وە سزای بەرد باران کردن تا مردن (الرجم حتى الموت) ی دیاری کردوە بۆ کەسێك کە زینا بکات مادام پیاو ژنی هێناو یان ژنی شوو کردوو بێت، هەروەها سەد قامچی بۆ کوڕ و کچ، و دەست بڕین (قطع اليد) بۆ بابای دز.

کەواتە ئەوانە دیارە بە مسولّمان لە قەڵەم دەدرێن بۆیە سزا دەدرێن.

دووەم: لە لایەکی دیکەشەوە (عبدالله بن شقيق العقيلي) کە یەکێکە لە زانایانی(تابعين) ئەو قسەی کردوە کە زانایان هەموو پشتگیری دەکەن، دەڵێ (كان أصحاب رسول الله ﷺ لا يرون شيئا من الإيمان تركُهُ كُفْرٌ

غَیْرَ الصلاة)[71] واتە: هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ تەرك كردنی هیچ كردەوەیەكی فەرزیان بە (كفر) نەزانیوە جگە لە نوێژ، كەواتە: ئەگەر مسوڵمانێك ڕۆژووی نەگرتبێ یەكسەر نەیانگوتوە (كافر) بووە، وە ئەگەر زەكاتی نەدابێ یەكسەر نەیانگوتوە (كافر) بووە، حەجی نەكردبێ نەیانگوتوە (كافر) بووە، بەڵام كەسێك نوێژی نەكردبێ[72] (لە ئەصڵدا نەی كردبێ)ئەوە بە(كافر)یان داناوە، كەواتە خاوەنی گوناحە گەورەكان (كافر) نیە مەگەر ئەو كردەوەیە شەرع بە كوفری دانابێ وەك نوێژ نەكردن یان هەر خۆی كوفر بێ.

سێیەم: لە قورئانیدا كەسانێك كە گوناحی گەورەشیان بووە بە بڕوادار لە قەڵەم دراون، بۆ نموونە : لە سووڕەتی (الحجرات) دا دەفەرمووێ:﴿ **وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ، إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ**﴾[73] خوای بەخشندە دەفەرموێ: ئەگەر دوو كۆمەڵ لە ئیمانداران لە دژی یەك جەنگیان كردو كوشتاری یەكتری یان كرد ئێوە صوڵحیان لە بەین دا بكەن،

---

(71) بڕوانە : (تهذيب شرح العقيدة الطحاوية) ی أبو بصير . ص 235، هەروەها "ابن حزم" ش هەمان كۆڕا (إجماع)ی هاوەڵانی نەقڵ كردوە و (ابن تيمية)ش گوتوویەتی: (.. وأكثر السَّلف على أنَّه يُقْتَلُ كافِراً ، وهذا كلّه مع الأقرار بوجوبها، بڕوانە: (مجموع الفتاوى) ج28 ص308.

(72) لە بەرگی یەكەمی ( خوا پەرستی مسوڵمان ) دا بە درێژی باسی حوكمی نوێژ نەكردنم كردوە.

(73) الحجرات (8-10).

لەگەڵ ئەو گوناحە زلەشیان دا کە یەکتر کوشتنە هەر بە بڕواداری ناوبردوون! وە لە جێگایەکی تردا فەرموویەتی: ﴿ **يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ** ﴾[74] واتە:﴿ئەی ئیماندارینە! ئەگەر سەرخۆش بوون نوێژ مەکەن هەتا دێنەوە هۆش خۆتان و دەزانن چی دەڵێن﴾، وەك دەبینین خوای بەخشندە ڕووی دواندنی کردۆتە بڕواداران و پێی فەرموون کە لە کاتی مەی خواردنەوە و سەرخۆش بوون توخنی نوێژ نەکەون، واتە: لەگەڵ ئەوەش کە شەراب بخۆنەوە هەر مسوڵمان و بڕوادارن، دیارە مەیخۆرەوە زۆر گوناحبارە و گوناحی گەورەی کردوە، بەڵام پێی (کافر) نەبووە.

چوارەم: ئەو دەقانەش کە ڕواڵەتەکەیان ئەوە دەگەیەنێ کە ئینسانی گوناحبار کافرە، ئەوە پێویستە لەگەڵ تێکڕای دەقەکانی دیکەدا سەرنج بدرێن و نابێ لە یەکتر دابرێنرێن، چونکە هەندێك دەقی ئاوا هەن بۆ نموونە: ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێ: (**لا يَدْخُل الجنة نمّام**) یان (**لا يدخل الجنة قتّات**)[75] واتە: ﴿قسە هێنەر و بەر ناچێتە بەهەشت﴾ یان ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێ: (**لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن**)[76] واتە: ﴿کەسێك کە زینا دەکات لە کاتی زینا کردنەکەی دا ئیماندار نیە﴾، یان ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێ: (**سِبابُ المسلم فسوق وقتاله كُفْرٌ**)[77] واتە: ﴿جنێودان بە

---

(74) النســاء 43.

(75) هەردووکیان (متفق علیه) ین.

(76) متفـق علیه.

(77) ( متفـق علیه ) .

مسوڵمان ئینسانی پێ فاسق دەبێ، وە جەنگ لە دژ کردنیشی کوفرە﴾ جا با بزانین ئایا ئەم فەرموودانەی کە ڕواڵەتەکەیان ئاوایە زانایانی ئەهلی سوننەت وجەماعەت چۆن وەڵام دەدەنەوە وچۆنیان مانا دەکەن و لەگەڵ دەقەکانی دیکەدا ڕێکیان دەخەن! دەڵێن: نابێ ئێمە بێنین ئەو دەقانەی کە هەڕەشەیان تێدایە بە جیا بیان هێنین و حیسابی بۆ ئەو دەقانەی تر نەکەین کە موژدەیان تێدایە وباسی ڕەحمەت و لێخۆشبوونی خوا دەکەن، چونکە خوای پەروەردگار هەمیشە باسی بەزەیی و بەخشش و تووڕەیی و تۆڵەی خۆی پێکەوە کردوە، بۆ وێنە: ﴿ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ، مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴾[78] وە (إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ الْعِقَابِ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَحِيمٌ)[79] بەڵام تۆ بێنی باسی تەنها ئەوە بکەی کە خوا (سريع العقاب)ە و باسی ڕەحمەت و بەخششی نەکەی، کە بە تەئکید خوای پەروەردگار هەردووکیانی هەیە وڕەحمەت وبەخشش ولێبوردنیشی زیاترە و پێش تووڕەیی و تۆڵەیشی کەوتۆتەوە، بەڵێ ئەگەر وا بکەی بێگومان تووشی هەڵە دەبی، وەك چۆن (خوارج) و(معتزلة)ش زیاتر لە سۆنگەی ئەوەوە بەهەڵەدا چوو بوون کە تەنها دەقەکانی باسی سزا و دەقەکانی هەڕەشە ئامێزیان، کە باسی تووڕەیی و تۆڵەو سزاو جەزرەبەی خوا دەکەن، کردبوو بە جێگای سەرنجی خۆیان و دەقەکانی دیکەیان فەرامۆش کردبوو !

(78) الفاتحة (3، 4).

(79) الانعام (165) .

(مُرجئة)ش بە پێچەوانەوە بۆیە بەهەڵەدا چوو بوون کە بە زۆری ئەو دەقانەیان دەهێنان کە باسی موژدەیان تێدایە و دڵخۆشکەرن و باسی ڕەحمەت و بەزەیی خوا دەکەن و ئەوانی تریان فەرامۆش دەکرد، بۆیە هەردووکیان واتە (خوارج ومُرْجئة) لە ڕاست و دروست و دادگەرانەو میانجی یانە تێگەیشتنی دەقەکانی قورئان و سوونەت دا بە هەڵەدا چوون و دووچاری ئەو جۆرە بیرۆکە هەڵە و داهێنراوانە بوون.

ئینجا زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت پاش سەرنج دانی هەموو دەقەکانی هاتوون ئەو دەقانەیان (تأویل)کردوە بە شێوەیەك کە لەگەڵ دەقەکانی تردا بگونجێن، چونکە دەقەکانی قورئان و سوننەت نابێ بەیەکەوە بەشەڕیان بدەی، بەڵکو دەبێ هەر کامێکیان لە شوێنی خۆی دا دابینێی، نەك بڵێی خوای بەرزو مەزن بۆچی لێرەدا وای فەرمووە و لە فلان شوێنەدا بۆچی پێچەوانەی ئەوەی فەرمووە؟!، ئێمە دەڵێین کە لێرەدا وای فەرمووە بۆ حاڵەتێکی ئاوا وای فەرمووە، وە لە شوێنێکی تردا بۆ حاڵەتێکی تر وای فەرمووە، یان پێغەمبەر ﷺ لێرە وای فەرمووە لە شوێنێکی تر بە شێوەیەکی تر، ئەوەی ئێرە بۆ حاڵەتێکە و ئەوەی تر بۆ حاڵەتێکی ترە.

بۆ وێنە: (لا يدخل الجنة نمام) وە هەموو ئەو دەقانەی تر کە وەك ئەون، بەم جۆرە مانا دەکرێن:

واتە: کەسێك کە قسە هێنەرو بەرە ناچێتە بەهەشت، تاکو تۆبە نەکات، یان تاکو سزا و ئازار نەدرێت، یانی: لەسەر ئەو گوناحە گەورەیە دەبێ سزا و ئازار بدرێت مادام تۆبەی نەکردبێ، یان مادام

وەبەر شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ نەکەوتبێ، یان مادام خوا بە ویست (مشیئة)ی خۆی نەیبەخشی بێ، چونکە هەم خوای دادگەر لە قورئانیدا ئاماژەی پێ کردوە وهەم فەرموودەکانی پێغەمبەریش ﷺ - وەك لە داهاتوودا باسی دەکەین - باسی ئەوەیان کردوە کە هی وا هەیە خاوەنی گوناحی زلیشە، بەلاّم بە شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ دەچێتە بەهەشت، یان گوناحی گەورەشی کردوە، بەلاّم دەبینی بە سزای قەبرو مەینەتی یەکانی ڕۆژی مەحشەر پاك دەبێتەوە،وە ئەو فەرموودەیە کە دەفەرموێ: (لا يَزْنِي الزاني حين يزني وهو مؤمن) واتە: لەو کاتەدا ئیمانەکەی کاملّ نیە، نەك ئەصلّی ئیمانەکەی نەماوە، ئیمانی[80] (مطلق)ی نەماوە نەك (مطلق)ی ئیمان، ئیمانی ماوە بەلاّم ئیمانێکی نوقصان و ناتەواو، چونکە ئیمانەکەی ئەوەندە نیە کە لە (زینا) بیگێڕێتەوە !

هەروەها ئەو فەرموودەیەش کە دەفەرموێ:(سِباب المسلم فسوق و قتاله كفر)واتە: جنێودان بە مسولّمان مایەی فاسق بوونەو،جەنگ و کوشتار کردن لەگەلّ مسولّمان دا سیفەتی کافرانە و سیفەتی مسولّمانان نیە، یان مەبەست لە (کفر)[81] کوفری گچکەیە.

(80) جیاوازی نێوان (الايمان المطلق) وە (مطلق الايمان) ئەوەیە کە ئیمانێك موتلّەق بێ و هیچ (قید) ی لەسەر نەبێ دیارە تێرو تەواوە، بەلاّم موتلّەقی ئیمان، هەر جۆرە ئیمانێکە با کز ولاوازو ناتەواویش بێت .

(81) زانایان وشەی کوفری کچکە (الكفر الاصغر) یان بۆ گوناحە زلەکان بەکارهێناوە.

## 2- ڕەخنە لێ گرتنی جەهمی یەکان و مورجیئەکان[82]

بە پەسندی دەزانم سەرەتا ئاماژە بکەم بەو شتانەی کە ئەو دوو پێڕە بۆ پشتگیریی ڕا و بۆچوونە پووچەکەیان بە بەڵگەیان دەهێننەوە:

1- بەڵگەی یەکەمیان ئەوەیە کە دەڵێن: مانای ئیمان لە زمانی عەرەبی دا بریتی یە لە (تصديق)، هەروەها لە قورئانیش دا هەمان چەمك و واتای هەیە.

2- بەڵگەی دووەمیان ئەوەیە کە دەڵێن: لە قورئان دا دەبینین ئیمان و کردەوەی باش (عَطْف) کراونەوە سەر یەك﴿ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ﴾ کەواتە: دیارە ئیمان و کردەوەی چاك لە یەك جیان.

3- بەڵگەیەکی تریان ئەوەیە کە دەڵێن: خوای پەروەردگار دەفەرموێ:
﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (الحج -77) .

کەواتە: ئینسان پێش ئەوەی نوێژەکەیشی بکات ئیمانەکەی هەر هەیە، چونکە فەرموویەتی: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە نوێژ بکەن![83]، دیارە ئیمانی هەیە بە بێ ئەوەی نوێژیش بکات.

4- بەڵگەیەکی تریان ئەوەیە کە دەڵێن: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ ﴾ (البقرة -143)، واتە: ﴿ وە خوا

---

(88) بێگومان ڕەخنە گرتن لە (الجهمية) و (المرجئة) لە هەمان کاتدا ڕەخنەشە لە بیر و بۆچوونەکانی (الاشاعرة) و (الماتريدية)ش، بۆیەش بە جیا باسم نەکردن چونکە ئەمان لە ژێر کاریگەریی ئەوان دان و بیرۆکەکەیانیان لەوان وەرگرتوە .

(83) دیارە لە ئایەتەکەدا بە ڕاشکاوی باسی نوێژ نەکراوە، بەڵام (ركوع) و (سجدة) تەنها لە نوێژی دا پێکەوە کۆ دەبنەوە.

ئیمانتان زایە ناکات ﴾. کە سەرجەم توێژەرەوان لە بارەی تەفسیری وشەی (إیمانکم) ەوە دەڵێن: (أي صلاتکم) نوێژەکەتان زایە ناکات، جا ئەوان دەڵێن : بەڵێ مەبەست لە (إیمانکم) نوێژەکەیانە، بەڵام ماناکەی ئاوایە: (إعتقادکم بوجوب الصلاة) واتە: بڕواتان بەوەی کە نوێژ فەرزە، خوا لێتان زایە ناکات بەهۆی گۆڕینی قیبلەوە، ئەمانە سەرجەم بەڵگەکانیان بوون..

وەڵامی بەڵگەکانیان و پووچاندنەوەی قسەکانیان

1- جارێ بۆ هی یەکەم دەڵێین: ئەوان کە گرنەیان لەو ئایەتە داگرتوە کە دەفەرموێ ﴿ وَمَا أَنْتَ بِمُؤْمِنٍ لَنَا وَلَوْ كُنَّا صَادِقِينَ ﴾ کە پێشتریش قسەمان لە بارەوە کردو لێرەش بە ڕوونکردنەوەی زیاترەوە بۆ زیادە تەئکید دووبارەی دەکەینەوە لە ڕاستی دا ئێمە بۆ پێناسەی ئیمان پێویستیمان بە زمانی عەرەبی نیە[84]، وە بۆ پێناسەی هەر حەقیقەتێکی شەرعی، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ خزمەت دەقەکانی قورئان و سوننەت بۆچی و بەڵگەمان چی یە؟! چونکە بۆ وێنە: خوای پەروەردگار دەفەرموێ (أقیموا الصلاة) دیارە (صلاة) لە زمانی عەرەبی دا لێی بکۆڵەوە داخوا چی دەگەیەنێ، هەموو فەرهەنگەکانی زمان دەڵێن: (الصلاة:الدعاء)، باشە خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿ أقيموا الصلاة ﴾ ئایا مانای ئەوەیە کە (دووعا بکەن) یان (نوێژ)؟! بێگومان ئەگەر بۆ مانای (صلاة) تەنیا

(84) دیارە مەبەستمان ئەوە نیە کە بۆ زانینی چەمك و واتای وشەکانی قورئان نەگەڕێینەوە بۆ زمانی عارەبی، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە زمانی عارەبی بەڵگە نیە لەسەر حەقیقەتە شەرعی یەکان و بۆ پەی پێ بردنی حەقیقەتە شەرعی یەکان دەبێ بگەڕێینەوە بۆ خودی شەرع.

بگەڕێینەوە بۆ زمانی عەرەبی (صلاة) بەس (دعاء)یە بەڵام ئەوە قورئان و سوننەت و شەرعە کە پێمان دەڵێ: ﴿ **أقيموا الصلاة** ﴾ لێرەدا بە مانای (پاڕانەوە) نیە و واتە: شتێك بکەن کە بە (الله اكبر) دەست پێ دەکات و (فاتحة)و (ركوع) و(سجدة) و(تحيّات)ی تێدایە و بە سەلام دانەوە کۆتایی دێت، جا ئایا ئەوەمان چۆن و لە کوێ زانی؟! دیارە ئەگەر تەماشای ئەصڵی زمانی عەرەبی بکەین(صلاة)تەنها دوعایە، بەڵام ئەوەمان لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ زانی، (ڕۆژوو) هەروایە چونکە وشەی (صوم) واتە (امساك) ﴿خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە و قسە کردن و هەر شتێك﴾، ئەدی چۆن دەزانین کە (صوم)یانی: خۆ گرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە و جیماع لە پێش بەرەبەیانەوە تا نوێژی شێوان ؟! بێگومان تەنها لە ڕێی شەرعەوە و بە هۆی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەو حەقیقەتەمان زانی هەروەها (حج) لە زمانی عەرەبی دا یانی:(قَصْد) مەبەست، بەڵام چۆن دەزانین حەج بە مانای (إحرام) بەستن و ڕاوەستان لە (عرفات)و ڕەجمی سێ (جمرة)کان و (طواف)ی دەوری کەعبە و هاتن و چوونی نێوان (صفا و مروة) و باقی (مناسك)ی حەججە؟! بێگومان ئەوەمان هەمووی بە هۆی پێغەمبەر ﷺ و دەقەکانی قورئان و سوونەتەوە زانی.

کەواتە ئەو قسەیان کە دەڵێن: ئیمان تەنیا (تصدیق) بە ڕاست زانینی نێو دڵە، ئەو قسەیەیان ڕەت دەکەینەوە، دەڵێین ئێمە بۆ پێناسەی ئیمان دەبێ بگەڕێینەوە بۆ قورئان و سوننەت، وەك لە دەرسی یەکەم دا باسمان کرد کە خوای پەروەردگار لە قورئان چۆن باسی ئیمان دەکات، وە

پێغەمبەر ﷺ چۆنی باســــی دەکات، بۆ وێنە: لە فەرموودەیەك دا دەفەرمویٚ: (**الایمان بضع وسبعون شعبة أو بضع وستون شعبة، فأفضلها قول لا اله الا الله ، وأدناها إماطة الاذى عن الطريق، و الحياء شعبة من الايمان**)[85] جا مادام پێغەمبەر ﷺ ئاوای بۆ پێناسە کردووین، پێویست ناکات بگەڕێینەوە بۆ زمانی عەرەبی، پاشان دەڵێین: وشەی (تصدیق)، وەك ڕوونمان کردەوە یەعنی (بە ڕاست زانین) بەڵام بە ڕاست زانین بە موتڵەقی و بە دڵ و بە زمان و بە کردەوەکان، (لە دەرسی ڕابردوودا برایەك پرســیاری کرد ) و گوتی: کەواتە (تکذیب) یش یەعنی (بە درۆزانین) بە درۆ زانین بە موتڵەقــی و بە دڵ و بە زمان و بە کردەوەکان، ئەدی مادام وایە بۆچی یەکســەر نەڵێیــن: (تصدیق) پڕ بە پێستی ئیمانە؟! وەڵامەکـــەی ئەوەیە کە لەبەر ئەوە ناتوانین وا بڵێین، چونکە بە ڕاست زانین ئەگەر بە دڵ و بە زمان و بە کردەوەکانیشە ، کە بە بەڵگەشمان لەسەر هێنایەوە، بەڵام خۆ ئیمان تەنیا بە ڕاست زانین نیە بەڵکو وێڕای (تصدیق) ئیمان خۆشـویستنیشە ، چونکە جاری وا هەیە تۆ شتێك بە ڕاست دەزانی بە کردەوە جێبەجێشی دەکەی، بەڵام خۆشیشت ناویٚ، وەك ئەوەی کەسێك (بێگار)[86]ت پێ دەکات، جێبەجێشی دەکەی، یان بە قسەش شتێك دەڵێی ڕەنگە بە دڵ بە ڕاستیشی بزانیٚ قەناعەتیشت پێی هەبیٚ، بەڵام ڕەنگە خۆشـــت نەویٚ و پێت خۆش نەبیٚ، کەواتە ئیمان تەنیا بە ڕاست زانین نیە ، هـــەرچەندە چەمك و واتای (تصدیق) فراوان و

---

(85) رواه مسلم و غيـره.

(86) بێگار (سُخرة) : بە زۆر ئیش و کارێك بە کەسێك ئەنجام دان.

گشـــتگیـــریش بێ. وە وشەی (اقرار)یش هەروایە، چونکە هەندێك لە زانایانی سەلەفی صالح گوتوویانە، ئیمـــــان بریتی یە لە (اقرار) بەڵام (إقرار) یش وەك (تصدیق) تەنیا بریتـی نیە لە ﴿دان پێداهێنانی زمان﴾ بەڵگەمان چی یە؟! خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُمْ مِنْ كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنْصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُمْ مِنَ الشَّاهِدِينَ ﴾[87] سەرنج بدەن، خـــــوا دەفەرموێ: خوای پەروەردگـــار پەیمان و بەڵێنـــــی لە پێغەمبەران (علیه الصلاة والسلام) وەرگرت،﴿ دیارە لە هەموویان بێجگە لە موحەممەد ﷺ، چونکە پەیمان وەرگرتنەکە بۆ بڕوا پێ هێنانی وی بووە﴾ فەرمووی: ئەی پێغەمبەرەکان چونکە من کیتاب و حیکمەتم بە ئێوە داوە هەر کاتێك پێغەمبەرێك هات (مەبەست موحەممەدە ﷺ) ئەو ڕێبازەی ئێوە لەسەرنی بە ڕاستی زانی و پشتگیری کرد دەبێ ئێوە بڕوای پێ بهێنن (ئەگەر لە سەردەمی ئێوەدا هات یاخود شوێنکەوتووەکانی ئێوە ئیمانی پێ بهێنن ئەگەر لە سەردەمی ئەوان دا هات) دەبێ ئیمانی پێ بهێنن و سەری بخەن و پشتگیری بکەن، ئینجا فەرمووی (أأقْرَرْتُمْ) دانتان پێدا هێنا؟! گوتیان (أَقْرَرْنا) دانمان پێداهێنا، کەواتە دان پێداهێنان (إقرار)یش یەعنی: ئیمانیش و سەرخستنیش و پشت گرتنیش .

---

(87) آل عمـران (81) .

2- ئەوەش کە دەڵێن: مادام کردەوەی باش (عَطْف) کراوەتەوە سەر ئیمان، کەواتە جیایە لە ئیمان و سەرەنجام ئیسپات دەبێ کە کردەوەی چاك پێکهێنەری ئیمان نیە!

ئێمە دەڵێین: ئەوە ڕاست نیە ،چونکە لە زمانی عەرەبی دا (عَطْف)[88] جاری وایە بۆ (مغايرة)[89] یە تۆ دەڵێی: (محمد)هات و(احمد)یش هات، لێرەدا (أحمد) لە (محمد) جیـــایە، بەڵام جاری وایە (عَطْف)، (عَطْف)ی (خاصّ)ە لەسەر (عامْ)، واتە: شتێکی تایبەتە دەگێڕرێتەوە بۆ شتێکی گشتی لەبەرئەوەی دەتەوێ ئەو شـــتە تایبەتە مەکانەت و پلە و پایەی زیاتری پێ بدەی، وەك لە قورئانیدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ **مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِلْكَافِرِينَ** ﴾[90] جوولەکەکان دەیانگوت: لەبـەرئەوە ئێمـە ئیمان بە محمد ﷺ ناهێنین چونکە (جبـریل) وەحی بۆ محمـــد ﷺ دێنێ، ئێمەش دوژمنایەتیمـــان هەیـــە لەگـــەڵ (جبـریل)دا !! جـــا لەو بارەوە و بۆ بەرپەرچدانەوەی جوولەکان ئەم ئایەتە هاتە خوارێ و دەفەرموێ: ﴿هەر کەسێك دوژمنی خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی بێ وە دوژمنی جوبرائیل و میکائیل بێ ئەوە خوا دوژمنی کافرانە﴾ لێـــرەدا تەماشا دەکەین لە پێشـــدا بە گشتی باسی فریشتەکان دەکات، بەڵام دوایی بە تایبەتی باسی ﴿جبـریل و میـکال﴾ یش دەکات، چونکە ئەم دووانە دوو فریشتەی تایبەتین، سەلامی خوایان لێ بێ.

(88) وشەی (عطف) یانی : گێڕانەوە و بادانەوە و نوشتاندنەوە.

(89) (مغايرة) یانی جیایی.

(90) البقـرة (98) .

کەواتە کە خوا (سبحانە وتعالـی) دەفەرمویٚ: ﴿ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ﴾ ئیمان کردەوەی باشیشی تیٚدایە، بەڵام لەبەرئەوەی کردەوەی باش بەشیٚکی تایبەتـــە لە ئیمان، بۆیە خوای بەرز و مەزن وەك زیادە ئیمتیـــاز و دەرخستنی پلە و پایەی دووبارە (عطف)ی دەکاتەوە سەری.

3- ئەوەش کە دەڵیٚن: خوای بەرز ومەزن هەموو جاریٚ فەرموویەتی: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ ئینجا داوای کردەوەی باش دەکات، وەك ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمْ الصِّيَامُ... ﴾ (البقرة – 183) دەڵیٚن:

أ- بەڵیٚ بەرلەوەی نویٚژ فەرز بیٚ، لەسەر ئیمانداران فەرز نەبووە کە نویٚژ بکەن، وە بە بیٚ نویٚژیش ئیمانەکەیان هەر ئیمان بووە، وە بەر لەوەی (حَـجّ)یان لەسەر فەرز بیٚ، ئەگەر حەجیشیان نەکردبایە ئیمانەکەیان هەر ئیمان بووە، هـــەروەها بەر لەوەی زەکـــــات فەرز بیٚت، ئەگەر زەکاتیشیان نەدابایە ئیمانەکەیان زەرەری نەدەهیٚنا، بەڵیٚ لەو کاتەوە کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ مسوڵمان ئیمانیٚکی (مُجْمَلْ)[91]یان هەبووە، بەڵام جاریٚ کامڵ نەبووە، وە کە کامڵیش نەبووە لەسەری گوناحبار نەبوون، چونکە خوای کاربەجیٚ تا ئەو کاتە هەر ئەوەندەی لەسەر پیٚویست کردبوون، بەڵام دوای ئەوەی کە خـــوای پەروەردگار هەموو ئەرکەکانی دینی ناردۆتە خواریٚ، ناتوانین بڵیٚین ئیٚستاش ئینســـــان بە بیٚ نویٚژ و ڕۆژ و زەکات و بە بیٚ جیٚبەجیٚ کردنی ئەرکەکان هەر ئیمان دارە.

---

(91) زانایانی زاراوەی (الایمان المجمل) وە (الایمان المفصل) یان بەکارهیٚناوە. بۆ ئیمان هیٚـــان بە کورتی بە ئیسلام بە بیٚ چوونە نیٚو (جزئیات) و، ئیمان هیٚنان بە سەرجەم (تفاصیل)ی یاسا و دەستوورەکانی ئیسلام. کە بە پیٚی شەخس و شویٚن حوکمی ئەو دوو جۆرە ئیمانە جیاوازە.

ب- هەروەها کە خوای پەروەردگـــار هەمیشە بە نازناوی ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ بانگی مسوڵمانانی کردوە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە کردەوە باشـــەکان لە نێو ئیمان دا نین و پێکهێنەری نین چونکە مادام بەشی گەورە و بنەڕەتی ئیمان کە دوو پێکهێنەری سەرەکینی لە نێو دڵ دان، دیارە بەر لە جێبەجێ کردنی ئەرکە شەرعی یەکانیش ئەو بەشە گەورەو بنەڕەتی یەی ئیمان هەر هەیە و دروســتیشــە شتێك بە ناوی بەشێکی یەوە ناوبنێی (يجوز تسمية شيء باسم بعضه أو جزء منه).

4- ئەوەش کە دەڵێن: ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ ﴾ مەبەستی پێ (إعتقادكم بوجوب الصــلاة)ە، دەڵێین: ئەوە (تأويل)ێکە کە بێ جــێیە (تكلف)ێکی زۆری تێدایە و هیچ پێویســت ناکـــات، چونکە خوا فەرموویەتی:﴿ئیمانەکەتان زایە ناکات﴾، ئینجا سەرجەم سەلەفی صالح و (مفسرين) فەرموویانە: (إيمانكم أي صلاتكم) دەجا چ پێویست دەکات تۆ بڵێی ﴿بڕواتان بە نوێژ﴾، چونکە بێگومان خوای پەروەردگار بڕوا بوون بە هیچ شتێکی تریش زایە ناکات، وە ئەو کاتە ئیشکال لەسەر نوێژ بووەو هاوەڵان بۆ ئەو نوێژانە کە پێش گۆڕانی قیبلە لە (بيت المقدس)ەوە بەرەو (كعبة) دوو دڵی یان بۆ پەیدا بووە لە بارەیانەوە و پێیان وا بووە کە ئێستا قیبلە وەرچەرخاوە بەرەو (كعبة) ئەو نوێژانەی کە بەرەو ئەوێیان کردوون زایە بوون ولێیان هەڵوەشاونەوە و بەر نەکەوتوون، بۆیە لەو بارەوە بە ئایەتی ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴾ (البقرة  143) دڵنیایی کردوونەتەوە کە ئیمان و تاعەتەکەیان پارێزراوە و زیانی نەهێناوە.

وە لە ڕاستی دا ئەم ئایەتە بەهێز و پیرۆزەی قورئان بەڵگەیەکی زۆر بەهێزی دەستی ئەهلی سوننەتە لەسەر ئەوە کە کردەوە (عمل)ش یەکێکە لە پێکهێنەرەکانی ئیمان، چونکە خوای کاربەجێ نوێژ (صلاة) ی ناوناوە (إيمان)، کەواتە دیارە نوێژ کردن ئیمانە و بەشێکە لە ئیمان، ئەگەر نا خوای زانا پەنهان بین لە خۆوە و بێ حیکمەت نوێژی ناو نەدەنا ئیمان.

## حیکمەتی هەڵبژاردنی پێناسەی ئەهلی سوننەت بۆ ئیمان(92)

با لە کۆتایی هەڵسەنگاندنەکەماندا بێینەوە سەر ئەوەی کە بۆچی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، (إصابة)یان کردوە و لەوەدا پێکاویانە کە ئیمانیان بەوە پێناسە کردوە کە دەڵێن: ئیمان بریتی یە لە زانین و بە ڕاست زانینی بە دڵ (المعرفة والتصديق بالقلب)، ئەوە یەکەمین پێکهێنەری ئیمانە.

پێکهێنەری دووەم: بریتی یە لە کردەوەی دڵ (عَمَلُ القَلْب) وەك: خۆشویستنی خوای بێ وێنە، ئیخلاص، پشت بەستن بە خوا، لە خوا ترسان، وە خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ، ئینجا تەسلیم بوون بە قەلب و قەناعەتەوە بۆ سەرجەم و ورد و درشتی شەریعەتی خوا (سبحانه وتعالى).

وە پێکهێنەری سێیەم: بریتی یە لە دان پێداهێنانی زمان.

وە پێکهێنەری چوارەم: بریتی یە لە کردەوەی ئەندامەکان.

ئێمە دەڵێین: ئەهلی سوننەت وجەماعەت لەو پێناسەیان دا پێکاویانە چونکە ئەگەر تەماشا بکەین دەبینین ئینسان لە چوار بەشی سەرەکی پێك

(92) ئەم باسە زیاتر هەڵهێنجراو و زادەی لێکدانەوە و تێوەڕاچانی خۆمە و لە هیچ کتێب و سەرچاوەیەکم وەرنەگرتوە.

هاتوە، وە بە بێ هیچ کام لەو چوارانە نابێتە ئینسان: یەکەم (عەقڵ) دووەم (دڵ) سێیەم (زمان) چوارەم (ئەندامەکان) جا ئیمان بە پێی پێناسەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بەسەر هەر چوار لەو پێکهێنەرە بنچینەیی یانەی ئینسان دا دابەش دەبێ:

یەکەم: یەکەمین پێکهێنەی ئینسان (عەقڵ)ەو یەکەمین پێکهێنەری ئیمانیش (المعرفة والتصديق) (زانین وبە ڕاست زانین)ە کە پەیوەندی بە (عەقڵ)ەوە هەیە، چونکە عەقڵ ئامرازی (کشف)و ئامێری پەی پێ بردنە، تۆ هەتا نەزانی (خوا)یەك هەیە، بە دڵ چیت خۆش دەوێ؟! کەواتە عەقڵ لە پێش دڵیشەوەیە، ئینسان لە پێشدا بە عەقڵ ئینسانە، ئەگەر عەقڵی لێ لابەری پێی دەڵێن شێت و دەچێتە ڕیزی ئاژەڵ، بۆیە زۆر جێی خۆیەتی کە یەکەمین پێکهێنەری ئیمان پەیوەندی بە عەقڵەوە[93] هەبێت کە بریتی یە لە ناسینی خوا و پێغەمبەر ﷺ وە بە ڕاست زانینیان و بە ڕاست زانینی دینەکەیان.

دووەم: دووەمین پێکهێنەری ئینسان دڵ (قلب)ە، جا ئایا بریتی یە لە چی؟! (دڵ) چەق (مرکز)ێکە ئینسان دەسووڕێنێ و دەجووڵێنێ، ئینسان شتی پێ قبووڵ دەکات یان ڕەفز دەکات، شتی پێ خۆش دەوێ یان ناخۆش دەوێت، ئەوە شتێکی دیارە کە فیکر و بۆچوون و تێگەیشتن پەیوەندی بە عەقڵەوە هەیە، بەڵام خۆشویستن و ڕق لێ بوونەوە، ڕەفز و قبووڵ، ویستن و نەویستن پەیوەندی یان بە دڵەوە هەیە، کەواتە ئەگەر ئینسانێك دڵی

(93) کەواتە: یەکەمین پێکهێنەری ئیمان پەیوەندی بە یەکەمین پێکهێنەری ئینسان و تایبەتی ترین و سەرەکی ترین شتی یەوە هەیە کە (عەقڵ)ە.

نەبێت، ویست و ئیرادە و خۆشویستن و بوغز و ویستن و نەویستنی نەبێت، پێی ناگوترێ ئینسان، وە لە ڕووی شەرعەوە (مُكَلَّف)یش نابێت، كەواتە وەك ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەڵێن، پڕ بە پێستە و جێی خۆیەتی كە پێكهێنەری دووەمی ئیمان پەیوەندی بە دڵ و دەروونەوە هەبێت، تاكو ئەوەی بە عەقڵ زانیوتە و ناسیوتە و كەشفت كردوە، كە هەقە و ڕاستە بە دڵیش خۆشت بوێ و قبووڵی بكەی و تەسلیمی بی.

سێیەم: وە پێكهێنەری سێیەمی ئینســـان لە ڕووی گرنگی یەوە بریتی یە لە زمانی دەربڕین و (نُطْق) تەنانەت فەیلەسووفەكانی یۆنان، لە پێناسەی ئینسان دا گوتوویانە: (الإنسان حیوان ناطق) ئینسان گیاندارێكی گۆیایەو بێژەرە، دیارە پێناسەكەیان زۆر ناتەواوە چونكە ئینسان زۆر لەوە گەورەترە كە تەنیا بە زمان پێناسە بكرێ، بەڵام بەهەر حاڵ زمان و دەربڕین پێكهێنەرێكی بنچینەیی ئینســـانە، تۆ لە ڕێی زمانەوە ئینسان دەناسی، وەك گوتراوە (زمان كەوچكە و دڵ مەنجەڵە) تۆ چووزانی ئەو دڵە چی تێدایە ئەگەر لە ڕێی زمانەوە نەبێ؟! وە گوتراوە (اللسان مفتاح الانسان) زمان كلیلی ئینسانە، كابرا كە قسەی كرد ئەوجار لـێی حاڵی دەبـــی چی یە و چۆنە و چی لە باران دا هەیە.

كەواتە: جێی خۆیەتی و پڕ بە پێستە پێكهێنـــەری سێیەمی ئیمان پەیوەندی بە زمان و دەربڕینەوە هەبێت، پێشتریش باس كرا كە ســـــــێیەمین پێكهێنەری ئیمان دان پێداهێنـــــان (إقـــرار)ە كە لە شایەتمان دا خۆی دەنوێنێ.

چوارەم: پێكهێنەری چوارەمی ئینسانیش جەستە وئەندامەكانی، كە چوارەمین پێكهێنەری ئیمانی پێوە پەیوەستە، چونكە ئایا كەسێك عەقڵی هەبێت و

دڵ وزمانیشی هەبێ، بەڵام ئەندامەکانی دیکەی نەبن، ئایا پێی دەگوترێ ئینسان؟! بێگومان دەڵێن: ئەوە هەر پارچە گۆشتێکە لەوێ کەوتوە! کەواتە زۆر جێی خۆیەتی کە مل کەچی ئەندامەکان و جەستە بۆ خوا و کردەوە بە ئەندامەکان، جگە لە کردەوەی دڵ، وەك جێبەجێ کردنی نوێژ و ڕۆژوو و زەکات وحەج و جیهاد و ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە و مل کەچی کردن بۆ شـەرعی خوا و هتد زۆر جێگای خۆیەتی کە پێکهێنەری چوارەم و کۆتایی ئیمان بێ، چونکە پاش زانین و کەشف کردنی عەقڵ بۆ هەق و قبووڵ کران و خۆشویسترانی لە لایەن دڵەوە و دان پیێداهێنرانی لە لایەن زمانەوە، نۆرە دەگاتە سەر جەستەو ئەندامەکان بۆ جێبەجێ کردن.

ئینجا پێویستە بزانرێ وەك لە دەرسی ڕابردوودا گوتمان کە بەشی هەرە گەورە و گرنگی ئیمان پەیوەندی بە دڵەوە هەیە، چونکە لە زاراوەی قورئان دا (قَلْب) (عَقْل)یش دەگرێتەوە، خوای بەرز و مەزن کە فەرموویەتی: ﴿ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمْ الإِيمَانَ ﴾[94] عەقڵیش دەگرێتەوە، وە هەتا ئێستاش زانایانی دەروون ناس و پزیشکەکان بۆیان ساغ نەبۆتەوە کە چۆن و بە چ شێوەیەك عەقڵ و دڵ پەیوەندی پێکەوە دەبەستن، چونکە ئینسان هەست دەکات کە هەواڵێکی خۆشـێ بۆ دێت دڵـی خۆش دەبێ وە کاتێك خەبەر و هەواڵێکی ناخۆشی بۆ دێ دڵی دەگوشرێ ودەزانێ کە دڵ ودەروونی پەیوەندی بە هەست و سۆزو خۆشویستن وخۆشنەویستن و ڕەفزو قبووڵەوە هەیە، بەڵام ئایا ڕەبتی چی یە لەگەڵ مێشك دا ؟! هەتا ئێستا زانایان بە ڕوونی بۆیان دەرنەکەوتوە، گرنگ ئەوەیە بزانین کە لە بەکارهێنـــــــــانی قورئان دا وشەی (قَلْب) (عَقْل)یش

---

(94) المجـادلة (22) .

دەگرێتەوە و وشەی (قَلْب) لە بەکارهێنانی قورئان دا بەس چەق و مەڵبەند (مرکز و محور)ی بیر و هۆش نیە، وەك لە عورفی ئێستادا باوە، بەڵکو هەردوو بەشەکەی زانین و بە ڕاســـت زانین وە قبووڵ کردن و خۆشویستن هەموویان پەیوەندی یان بە (قَلْب)ەوە هەیە، وە لە ڕاستی دا هەم دان پێداهێنانی زمان و هەم کردەوەی ئەندامەکانیــش بەرهەم و ئەنجامی ئەو حەقیقەتەن کە لە دڵ و دەروون دا جێگیــر بووە.

کەواتە: هەر کاتێك جێبەجێ کردن (تطبیق) و ڕەفتار و ئاکارمان لە کەسێك نەبینی ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لە دڵی دا هیچ شتێك نیە، وە هەر کات (کُفْر)مان لە ڕەفتار و ئاکاری دا دیت، یان (کُفْر)مان لــێ بیست، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لە دڵیشی دا (کُفْر) هەیە[95]، چونکە چی لە دڵ دا هەبێ، هەر ئەوەش لە ڕێی زمانەوە دێتە دەرێ و هەر ئەوەش لەسەر ڕووبەڕی ئەندامەکان ئاشکرا دەبێ و دەردەکەوێ.

وصلى الله تعالى وسلَّم وبارك على حبيبنا و شفعينا محمد وآله وصحبه أجمعين . ومن اهتدى بهديهم وانسلك في سلكهم الى يوم الدين. والحمد لله رب العالمين .

---

(95) با هیچ کەس وا لەم قسەیەم حاڵی نەبێ کە منیش وەك هەندێك لە زانایانی مەشرەب مورجیئەی سەردەم تەنها ئەوە بە کوفر دەزانم کە لە دڵ دایە ! بەڵکو هەرچی یەك شەرع بە کوفری دانابێ کوفرە: چ لە دڵ دا بێ، چ لە لەسەر زمان و قەڵەم دەرکەوێ و، چ بە ئەندامەکان ئەنجام بدرێ، بەڵام بێگومان هەر کوفر و شیرکێکی بیستراوو بینراوو ئاشکرا ڕەگ و ڕیشەکەی کوفر و شیرکێکی پەنهان و دەروونی یە .

الحمد لله حق حمده والصلاة والسلام من الله على عبده محمد وآله وصحبه و سائر السائرين على دربه، أما بعد:

بـــەڕێزان!

ئێمە لە دوو دەرســـی ڕابردوودا باسی ئیمانــمان کرد، وە لە میـــانەی قسەکانمان دا وشەی (ئیسلام) یش چەند جارێك بەکار هات، بەلاّم وەکو ئیمان بە درێژ (تفصیل)ی باسمان نەکرد، جا خوا یار بێ لەم دەرسەمان دا باسی ئەوە دەکەین کە ئیمان و ئیسلام چ پەیوەندی یەکیان پێکەوە هەیە، لە کوێ پێك دەگەن و دەچنــە نێو یەك، وە لە کوێش لە یەك جیا دەبنەوە؟، وە ئایا ئیمان و ئیسلام یەك شتن یا لە یەك جیان؟، وە ئایا هەر بە یەکجاریی لە یەك جیان یان لە هەندێك شت دا بە یەك دەگەنەوە؟!.

لێرەدا دەمەوێ ئەوەتان بۆ ڕوون بکەمەوە کە مەبەســـتمان لەم دەرسە ئەوەیە ئەگەر بێت و بلێین: (اسلام)و(إيمان) هەر یەکن و لە یەك جیاواز نین، مانای وایە هەر کات لە دەقێکی شەرعی دا بینیمان کە فلاّن شـــتە و فلاّن شتە ئینسانیان پێ دەبێتە مسولّمان، مانای وایە ئەو مسولّمانەتی یە، مایەی ئیمانداریێتی و بە (مؤمن) لە قەلّەم درانیشـــە، واتە هەر ئەو شـــتانەی کە ئینسانیان پێ دەبێتە مســـولّمان و لە دنیادا حوکمی مسولّمانەتی یان پێ وەردەگرێ، پێشیان دەبێتە بڕواداریش و لە دوا ڕۆژیش دا دەرباز بوون لە دۆزەخ و چوونە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەکەن، بەلاّم ئەگەر بلّێین: نەخێر ئیسلام و ئیمان لە یەك جیان، مانای وایە ئەو شتانەی کە شەرع دایناون ئینسانیان پێ ببێتە مسولّمان، ئەوە هەر چەندە لە دونیادا بە مســـولّمان و دیندار دادەنرێ، بەلاّم

لە لای خوا و بۆ قیامەت مادام مەرج و پێکهێنەرەکانی (إیمان)ی تێدا نەهاتبنە دی بە ئیماندار دانانرێ، وە بۆ ئاگاداریشتان ئینسان بە بێ ئیمان ناچێتە بەهەشت، وەکو دواتر ڕوونی دەکەینەوە، جا لێرەدا زانایان لەو بارەوە دوو ڕایان هەن:-

یەکەم: هەندێکیان دەڵێن: ئیمان وئیسلام یەك شتن و لە هەر شوێنێك خوای پەروەردگار باسی (ئیسلام)ی کردبێ ئەوە مەبەستی (ئیمان)یشە، وە ئەگەر باسی ئیمانی کردبێ ئەوە مەبەستی ئیسلامیشە، واتە وەك چۆن لە زمانی عەرەبی دا دەڵێی (قَعَدَ، جَلَسَ) تەنیا (لَفْظ)ەکەیان لە یەك جیایە ئەگەر نا وشەی (مترادف) هاوواتان و چەمك و واتا و نێوەڕۆکەکەیان هەر یەکە، شایانی باسیشە کە ئەو زانایانەی ئەم ڕایەیەی یەکەمیان هەڵبژاردوە، هەر کام لە:(البخاري ومحمد بن نصر المروزي وابن عبدالبَرّ والمُزْني)و کۆمەڵێکی دیکەش لە پێشەوایانیان لە نێو دان، بەڵگەشیان ئایەتێکە لە قورئان دا لە سوڕەتی (الذاريات) کە بەسەرهاتی ابراهیم ﷺ باس دەکات، کاتێك (ابراهیم) بە فریشتەکان دەفەرموێ ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ ﴾(31) ئەو فریشتانەی کە دەچن میوانی (ابراهیم) ﷺ دەبن بە مەبەستی کاول کردنی دێیەکانی گەلی (لوط) ﷺ ، دوای ئەوەی کە ئیبراهیم خواردنیان بۆ دادەنێ وخواردنەکە ناخۆن وخۆیانی پێ دەناسێنن، وە موژدەی پێ دەدەن کە کوڕێکی زانای دەبێت، کە دیارە تا ئەو کاتە ابراهیم ﷺ و (سارة)ی خێزانی منداڵیان نەبووە و تا ئەو کاتە خۆی و خێزانی بێ وەچە بوون، جا خێزانەکەی کە ئەوە دەبیستێ زۆر بە سەرسوڕمانەوە چریکەیەك دەکات و وەك لە سوڕەتی (هود) دا هاتوە دەڵێ:

﴿ أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ وَهَذَا بَعْلِي شَيْخًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ ﴾(72)، واتە: بە ڕاستی شتێکی سەیرە! چۆن منداڵم دەبێ لە حاڵێك دا کە خۆم پیرەژنم و مێردەکەشم ئەوە دیارە پیر بووە؟!جا دوای ئەو مشت ومڕە (ابراهیم)ﷺ پێیان دەفەرموێ: ﴿ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ ﴾ (الذاریات-31)، واتە: جا ئەی نێردراوەکان ئەو کارەی کە پێی نێردراون چی یە؟ ﴿ قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمٍ مُجْرِمِينَ ، لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِنْ طِينٍ ، مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ ، فَأَخْرَجْنَا مَنْ كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ، فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ (الذاریات 32 36) فریشتەکانیش لە وەڵامی پرسیارەکەی (ابراهیم) ﷺ دا دەڵێن:

ئێمە لە لایەن پەروەردگارتەوە ڕەوانە کراوین بۆ ئەو گەلە تاوانبارە ، تاکو بەردێکی قوڕینیان بەسەردا بباڕێنین. کە لە لایەن پەروەردگارتەوە. بۆ زێدەڕۆیی کەران نیشانەدار کراوە، ئینجا دەڵێن: ﴿ فَأَخْرَجْنَا مَنْ كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ واتە: جا هەر ئیمانداری‌ك کە لەو شوێنە دابوو دەربازمان کرد، ﴿ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ بەڵام بەس یەك ماڵی مسوڵمانی تێدا بوو، واتە: لێرەدا فریشتەکان ئیمان و ئیسلام بە یەك واتا بەکار دێنن، وە لە ڕاستی دا ئەم بەڵگەیە بەڵگەیەکی بەهێزە و لایەنگرانی ڕای یەکەم هەر ئەو بەڵگەیەشیان بە دەستەوەیە.

دووەم: ڕای دووەم کە بێ گومان زۆربەی زانایان لەسەر ئەم ڕایەن ومن خۆیشم ئەو ڕایەم پێ پەسندە، چونکە بەڵگەی زیاتر پشتگیری دەکەن، ئەوەیە کە دەڵێن: ئیمان و ئیسلام لە یەك جیان، هەرچەندە لە هەندێك شت دا دەچنە نێو یەك بەڵام لە زۆر شتیش دا لە یەك جیا دەبنەوە، ئەو زانایانەش کە

ڕایان وایە: بێجگــە لە (ابن عباس) خوا لێیــان ڕازی بێت، وە (الحسن البصري) و (ابن سیرین و زُهري و قتادة)، کە ئەوانە هەموویان لە زانایانی (تابعین)ن هەر کام لە (حمّاد بن زید و محمد بن عبدالرحمن بن أبي ذئب و أحمد بن حنبل و أبو جعفر الباقر و عبدالرحمن بن مهدي و ابن معین و الخطابي و اللالّکائي و ابن صلاح الشهرزوري و ابن تیمیة و ابن رجب) ئەوانە هەموویان ئەو ڕایەی دووەمیان پەســـند کردوە کە ئیمان و ئیسلام لە یەك جیان و مەرج نیە هەر کەسێك مسولْمان بوو هەمیشە ئیمانداریش بێ و مەرج نیە هەر کەسێك لە دەقەکانی شەرع دا ئیسلامی بۆ قەرار درا، ئیمانیشی بۆ لەگەڵ قەرار درابێ، بەلاّم هەمیشە (مؤمن) (مسلم) ە، واتە هەر کەســـێك ئیمانی پێ بوو ئیســـلامیشی پێیە، بەلاّم مەرج نیە هەر کەسێك ئیسلامی پێ بوو ئیمانیشی پێ بێ.

وە ئەو زانایانە وەلامی ئەو بەلْگەیـــــەی ڕای یەکەم - کە بەهـــێزترین بەلْگەیانە - بەم شـــێـوەیە دەدەنەوە کە دەلْێن: لێرەدا کە ئیمان و ئیســـلام چوونەتە نێو یەك، ئەوە یەکێکە لەو شوێنانەی کە ئێمەش ئینکاری ناکەین، هەندێك جار ئیمان و ئیسلام دەچنە نێو یەك، ئەویش چ جارێکە؟ ئەوەیە کە (ئیســـلام) ی تەواو ئیمانیشی لەگەڵ دایە واتە لە هەر شـــوێنێك خوای پەروەردگار زۆر بە مەدحەوە باسی ئیسلام و (مسلم)ی کردبێ ئەوە ئیمانیش دەگرێتەوە، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ **قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ، لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ** ﴾ (الانعام 162-163) تۆ بڵێ ئەی محمد ﷺ نوێژ و قوربانی ســـەربڕین و ژیان و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە، هیچ

هاوەڵی نین، وە من بەوە فەرمانم پێ کراوە، وە من یەکەمین مسـوڵمانم، لێرەدا دیارە کە مسوڵمان (مسلم) لە مەقامی (مدح) دایە و مسـوڵمانەتی تەواوە، جا هەمیشە مســوڵمانەتی تەواو ئیمانیشی لەگەڵ دایە، چونکە مسوڵمانی تەواو بە بێ ئیمان تەواو نابێ بۆیە من لە کتێبی (مسوڵمانی کامڵ)، ئەو قەیدی (کامڵ)ەم بۆ زیاد کردوە چونکە وشەی (مسلم) مســوڵمان بە تەنها، هەموو جارێك مەدح ناگەیەنێ و، جــاری وا هەیە کابرا (مسلم)ە و وەك باس دەکەین لە ئایەت و حەدیســەکان و لە دەقە شەرعی یەکان دا پێی دەگوترێ (مسلم)، بەلاّم ڕەنگە لە حەقیقەت دا (منافق) بێ، کەواتە وشــەی (مسلم) ئەگەر قەیدێکی بخرێتە گەڵ بلێی مسوڵمانی تەواو، مسوڵمانی کامڵ ئەوە ئیمانیشی لەگەڵدایە، جا ئەو زۆربەی زانایانە وەلاّمی بەڵگەی لایەنگرانی ڕای یەکەم کە دەڵێن ئیمان و ئیسلام هەر یەکن، بەوە دەدەنەوە کە دەڵێن: ئەو ئایەتەی (الذاريات) یەکێکە لەو شــوێنانەی کە ئیمان و ئیســلامیان تێدا چوونەتە نێو یەك بەهۆی ئەوەوە کە (ئیسلام)ە کە (ئیسلام)ێکی تەواوە، دیارە کە (ئیسلام)یش تەواو بوو ئیمانیشـــــی لەگەڵ دایە وە لە بەڵگەکەی ڕای یەکەمیش دا لەوەوە دەزانین کە (ئیسلام)ە کە تەواوە، چونکە ئەو ماڵەی کە فریشتەکان ئاگاداریان کردنەوە کە بڕۆن و دەرچن چونکە خوا ئەو شوێنە کاول دەکات، ئەوە ماڵی (لوط) بووە ﷺ دەجا ئاشکراشـــــە کە (لوط) ﷺ مسوڵمانی زۆر تەواو و (مؤمن)ی زۆر تەواویش بووە !

بەلاّم مەرجیش نیە کە هەموو جارێ ئینسان کە مسوڵمانی تەواو بوو (مؤمن)ی تەواو (کامڵ) یش بێت.

بەڵام دەبێ ئەصڵی ئیمانەکەی هەر هەبێت، بەڵام لێرە لەو مەقامەدا بۆیە وامان گوت چونکە ئیسلامی هیچ کەس لە هی پێغەمبەران(علیهم الصلاة و السـلام) تەواوتر نیە.

وە بێ گومان ئەو مەسەلەیەش زۆر حوکم و یاسای دنیایی پێوە پەیوەستن، بۆ وێنە: هەر کات لە (نصّ)ێکی شەرعی دا بینیمان کە دەڵێ فلان کەس مسوڵمانە، ئەوە ئێمە ناڵێین حەتمەن ئەو کەسە بەهەشـــتی یە، بۆ نموونە (عبدالله بن أبيّ بن سلول) وەك مسوڵمان دانراوە و تەنانەت پێغەمبەر ﷺ کە (عبدالله) مرد چووە نوێژیشی لەسەر کردوە، ئەوە دیارە، کەچی دوایی خوای پەروەردگار پێی فەرموو ﴿ وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ ﴾ (التوبة -84) واتە: وە لەمەودوا هەر کامێك لەو (منافـــق)انە مرد، هەرگیز نوێژی لەسەر مەکە و مەچۆ سەر گۆڕەکەیشی!، ئیـدی لەوەودوا پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی کە زانیبای (منافق)ن و نوێژی لەسەر نەدەکردن و لە ناشتنیشیان دا بەشدار نەدەبوو، وە لە سۆنگەی ئەوەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەندێ لە (منافق)ەکان کە مابوونەوە ناوەکەیانی بە (حذیفة بن الیمان) ﷺ گوتبوو، چونکە ئەو (أمین سر)ی پێغەمبەر بووە ﷺ وە زۆر لە نهێنی یەکانی ئەوی لا دانرا بوو، کە یەکێك لەوانە ناوی منافقەکان بوو، جا (عمر بن الخطاب) ﷺ هەر کات یەکێك لە شـــــــاری مەدینەدا دەمرد ئەگەر وەك مسوڵمانێکی باش نەناسرابایە یا نەی ناسیبا تەماشای دەکرد ئاخۆ (حذیفة) نوێـــژی لەسەر دەکات یان نا، ئەگەر ئەو نوێژی لەســـەر کردبـــایە ئەوە (عمـر)یش ﷺ نوێژی لەســــــەر دەکرد، وە ئەگەر (حذیفة) نوێژی لەسەر نەکردبایە، (عمر)یش نوێژی لەســـەر نەدەکرد، نەبادا لە (منافق)ەکان بێت چونکە (حذیفة) هەموویانی دەناسین.

جا بەڵگەکانی ڕای ئەوانەی دەڵێن: ئیمان وئیسلام لەیەك جیان هەرچەند هەندێك جار بە یەك دەگەنەوە، ئەو هەندێك جارەش ئەوەیە کە ئیسلامی ئیسلامی تەواو بوو ئیمانیشی لەگەڵ دایە، بەڵگەکانیان ئەمانەن:

(یەکەم): لە سووڕەتی (الحجرات)دا، خوای پەروەردگار دەربارەی عەرەبە خێڵەکی یەکان کە تازە دەهاتنە نێو ئیسلام وشانازی و منەتیشیان بەسەر پێغەمبەردا ﷺ دەکرد ئەو ئایەتەی نارده خوارێ:﴿ قَالَتْ الأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلْ الإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ ﴾[96] واتە: عارەبە خێڵەکییەکان گوتیان: ئیمانمان هێنا، بلێ- ئەی موحەممەد- ﴿ لم تؤمنوا ﴾ بە تەئکید ئیمانتان نەهێناوە چونکە ووشەی ﴿ لَمْ ﴾ ئامرازی (نفي)یە،﴿ وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا ﴾ بەڵام لە جیاتی گوتنی ﴿ امنا ﴾ ئیمانمان هێناوە، بڵێن ﴿ اسلمنا ﴾ مسوڵمان بووین ﴿ ولما يدخل الايمان في قلوبكم ﴾ وشەی ﴿ لما ﴾ بۆ نەفی شتێکە لەگەڵ چاوەڕوان کردنی پەیدا بوونی دا، وەك ﴿ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ ﴾ (الجمعة-3) واتە: جارێ پێیان نەگەیشتوون بەڵام پێیان دەگەن، کەواتە: ﴿ ولما يدخل الايمان في قلوبكم ﴾ واتە: جارێ ئیمانتان نەچۆتە نێو دڵ بەڵام ئومێد دەکرێت ئیمانتان بچێتە نێو دڵ.

لێرەدا خوای پەروەردگار بە (نص)ی ئایەت ئیسلامەتی بۆ کۆمەڵێك قەرار دەدات کە دەفەرموێ: مسوڵمانن و بە ئەهلی (ئیسلام) حیسابن، بەڵام ئیمانیان لێ نەفی دەکات و دەفەرموێ: ئیمانتان نەچۆتە نێو

(96) الحجرات (14).

دڵەوە، کەواتە ئەو دەق (نص)ە حەسمی نیزاع دەکات و قەزیەکەمان بۆ هەڵ دەبڕێ، کە دەگونجێ کابرا مسوڵمان (مسلم)بێ بەڵام (مؤمن) نەبێ، ئیسلامی پێ بێ بەڵام ئیمانی پێ نەبێ.

(دووەم): فەرموودەیەك هەیە کە دەفەرمووێ: (**عن عامر بن سعد عن ابيه أن النبي ﷺ أعطى رجالا ولم يُعْطِ رجلا، فقلت يا رسول الله أعطيت فلانا وتركت فلانا لم تعطه وهو مؤمن ، فقال النبي ﷺ أو هو مسلم، قال فأعدتها ثلاثا وهو يقول أو مسلم**)[97] واتە: عامری کوڕی سعد لە باببیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ماڵ و سامانێکی دابەش کردوە و داویەتی بە هەندێك لە پیاوان، بەڵام نەیدا بە پیاوێك لە نێویان دا (سعد)یش کە باوکی (عامر)ە، دەڵێ : گوتم ئەی پێغەمبەری خوا دات بە فلان و ئەوانە بەڵام نەتدا بە فلانە کەس لەگەڵ ئەوەش دا کە بڕوادار (مؤمن)ە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: یان بڵێ مسوڵمان (مسلم)ە، دەڵێ من سێ جار دووبارەم کردەوە و گوتم ئیمانداره، ئەویش هەر فەرمووی مسوڵمانە!، جا دیارە کابرا یان (منافق) بووە یا هەر بە ڕواڵەت هاتۆتە نێو ئیسلامەوە، واتە مەرج نیە ڕقی لە ئیسلام بووبێتەوە، بەڵکو هاتۆتە نێو ئیسلامەوە بەڵام جارێ ئیمانی وەرنەگرتوە، چونکە مەرج نیە هەر کەسێك ئیمانی نەبوو (منافق) بێ جاری وا هەیە کابرا بە ڕواڵەت هاتۆتە نێو ئیسلام، بەڵام جارێ نازانێ ئیمان چی یە! واتە مەرج نیە هاتبێت بە فێڵ مسوڵمان بووبێت و لە دڵیش دا هەر کافر بێت بەڵکو نازانێ ئیمان چی یە و وەری نەگرتوە، وەختێك کابرا خوا

---

(97) رواه البخاري و مسلم عن عامر بن سعد عن أبيه.

نەناسێ وەك تاقە پەرستراو و تاقە پەروەردگار و خاوەنی ئەو سیفەت و ناوە بەرز و پەسندانەی کە تەنها شایستەی خۆیـی، وە وەختێك پێغەمبەر ﷺ وەك خۆی نەناسێ، وە لە ئیسلام شارەزا نەبێ و نەزانێ ڕۆژی دوایی و فریشتەکان وکتێبەکانی خواو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) چین؟ ئیمان بە چ بێنێت! واتە جاری وا هەیە کابرا ئیمانی نیە نەك لەبەرئەوەی کە (منافق)ە، بەڵکو لەبەرئەوەی لە ئیمان حاڵی نەبووە و وەری نەگرتوە، دیارە بابای واش هەر چەندە بە ئیماندار دانانرێ، کەچی بە مسوڵمان ناو زەد دەکرێ و وەك هەڵاواردن (إستثناء)ێکیش لە یاسای: ﴿بە بێ ئیمان چوونە بەهەشت مەیسەر نابێ﴾ وا پێ دەچێ ئەو جۆرە کەسانە ئەهلی (نجاة) بن، چونکە چی لە توانایان دا هەبووە پێی هەڵساون، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلْ الإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ وَإِنْ تُطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ لاَ يَلِتْكُمْ مِنْ أَعْمَالِكُمْ شَيْئًا إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ (الحجرات -14) .

لەم ئایەتەدا زۆر بە روونی دەفامرێتەوە کە هۆی بە ئیماندار دانەنرانی ئەو جۆرە کەسانە کوفر و نیفاق نیە بەڵکو هۆیەکەی ئەوەیە کە نازانن ئیمان چی یە، تەنها ئەوەندەیان زانیوە و بیستوە کە پێغەمبەرێك پەیدا بووە و حاڵ و سیفاتی ئاوایە و ئەوانیش ڕەگەڵ کەوتوون، واتە ئیسلام وەك کیان و دەوڵەت پەرەی سەندوە و دەستەڵاتی پەیدا کردوە ئەوانیش هاتوونەتە نێوی، بەڵام بە وردیی نەیانزانیوە بڕوا بە چی بهێنن و ئەو پێغەمبەرە ﷺ چی دەفەرموێ و چی نافەرموێ.

(سێ یەم): فەرموودەکەی (جبریل) عليه السلام که به کورتی و به کوردی بەم جۆرەیە:
عمر بن الخطاب رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە لە جەنگی (تبوك)دا بووە، دەفەرمووێ ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، پیاوێك هات بەرگێکی زۆر ســـپی لەبەردابوو، هیچ شوێنەواری سەفەری پێوە دیار نەبوو، مـــــووەکانی زۆر ڕەش بوون، هـــات ســـــــەلامی کرد و لە نزیك پێغەمبەرەوە ﷺ دانیشت، لە فەرموودەکەدا دەفەرمووێ ئەژنۆی بە ئەژنۆی پێغەمبەرەوە ﷺ نا ﴿دیارە مەبەستی ئەوەیە کە زۆر لێیەوە نزیك دانیشت، ئەگەر نا ناگونجێ و ئەدەبی مەجلیس نیە کە ئەژنۆی خۆی بە ئەژنۆی پێغەمبەرەوە بنێ﴾، ئینجا دەفەرموێ پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی (ئیسلام و ئیمان و ئیحسان) وە دەربارەی ڕۆژی دوایی، سەرەتا گوتی: (یا محمد أخبرني عن الاسلام) هەواڵم پێ بدە دەربارەی ئیسلام کە ئیسلام چی یە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیسلام ئەوەیە کە شـــایەتمان بێنی بەوە کە جگە لە خوا پەرستراوێکی دیکە نیە، وە کە موحەممەد ڕەوانە کراوی خوایە، وە نوێژ بکەی و زەکات بدەی و ڕۆژوو بگری و حەج بکەی، ئەوە ئیسلامە، پاشان پیاوەکە گوتی: ڕاست دەکەی، عمر دەفەرموێ: زۆر سەرمان سوڕما کێیە ئەو کەسە لە پێغەمبەر ﷺ دەپرسێ و پاشانیش پێی دەڵێ ڕاست دەکەی، چونکە کەسێك بە کەسێکی دیکە بڵێ ڕاست دەکەی دیارە بۆ خۆی لەو سەری هاتۆتەوە بۆیە پێیان سەیر بووە.

---

(98) رواه مسلم ، و الترمذي ، و ابو داود ، و النسائي.

ئینجا لە بارەی ئیمانەوە پرسیاری لـــــێ کرد و گوتی: (فأخبرني عن الایمان) دە پێم بلێ ئیمان چی یە؟ ئەویش وەڵامی دایەوە کە ئیمان (ان **تؤمن بالله وملائکته و کتبه ورسله وبالیوم الاخر وبالقدر خیره و شرِّه**) بڕوا بێنی بە خوا وە بە فریشتەکانی وکتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی وە هەروەها بە (قەدەر) بە خێر و شەڕی و، خۆش و ناخۆشی یەوە، دیسان کابراکە گوتی ڕاست دەکەی.

ئەوجار دەربارەی (احسان) پرسیاری لـێکرد کە ئایا (احسان) چی یە؟! ئەویشی وەڵام دایەوە و فەرمووی (**الاحسان ان تعبد الله کأنك تراه فإن لم تکن تراه فأنه یراك**) ئیحسان ئەوەیە کە بە جۆرێك خوا بپەرستی پێت وابێ دەیبینی، یان بە لای کەمەوە پێت وابێ کە ئەو تۆ دەبینێ، واتە چاك دینداری کردن، وە لە کۆتایی دا دەربارەی کاتی هاتنی قیامەت لـێی پرسی و ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: (**ما المسئول بأعلم من السائل**) پرسیار لێکراو (کە پێغەمبەرە ﷺ) شارەزا تر نیە لە پرسیارکەر، پاشان کابرایەکە پرسیاری نیشـــانەکانی ڕۆژی دوایی لە پێغەمبەر ﷺ کرد و ئەویش وەڵامی دایەوە و چەند نیشـــــانەیەکی بۆ دیاری کردن.

جا (عمر) رضي الله عنه دەڵێ: پاشان ئەو پیاوە ڕۆیشـــــت و ئێمەش زۆرمان مەسەلەکە لە لا سەیر بوو، بەڵام دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە سام بووە، وە هاوەڵان (أصحاب)یش رضي الله عنهم زۆریان شەرم لـێ کردوە، ئەوەتا ئەو شتە گرنگ و گەورەیە بووە، کەچی لێیان نەپرسیوە ئەوە چی بوو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟! بە تایبەت هاوەڵە زۆر نزیکەکانی شـــتێك کە

پێغەمبەر ﷺ خۆی بۆی ڕوون نەکردبنەوە کەمتر وا بووە پرسیاریان لــێ کردبێ !

هەتا یەکێك لە هاوەڵان (أصحاب)دەڵێ: ئێمە خوا خوامان بوو کە (أعرابي)یەکان بێن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ، چونکە زۆر پرسیارمان لە دڵ دا هەبوو شەرمان دەکرد لــێی بپرسین لەبەر زۆر ڕێز لــێ گرتنی، بەڵام (أعرابي)یەکان گوێیان نەدەدایە، چونکە زۆر فێری ئیسلام و ئەدەب و شت نەبوو بوون و یەکسەر پرسیاریان دەکرد کە ئەو شتە بۆچی وایە و بۆچی وا نیە ؟! جا دەڵێ ئێمەش پێمان خۆش بوو دەمانگوت ئێمەش شتەکەمان بۆ دەردەکەوێت و تووشی کەم ڕێزیش نابین لە خزمەتی دا.

بەڵێ (عمر) ﷺ دەڵێ: جا کە ئێمە هەمووومان بێ دەنگ بووین و پرسیارمان لە پێغەمبەر ﷺ نەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە (جبریل) بوو هاتبوو دینەکەتان تێ بگەیەنێ (**انه جبريل اتاكم يعلمكم أمر دينكم**) جا زانایان دەڵێن: لەم فەرموودەیەی پێغەمبەردا ﷺ چەند شتێکمان دەستگیر دەبێ، کە یەکێکیان ئەوەیە:

کە دینی ئیسلام وەك بەرنامە و شەریعەت، هەم ئیسلامە هەم ئیمانە، (احسان)یش لووتکەی هەرە بەرزی ئیمان وئیسلامە، چونکە (احسان) بریتی نیە لە شتێکی تایبەت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە پێناسەی ئیسلام دا پێنج پایەکانی ئیسلامی ژماردوون، شایەتمان و نوێژ و ڕۆژ و زەکات و حەج، وە لە پێناسەی ئیمان دا شەش پایەکانی ئیمانی باس کردوون بەڵام لە پێناسەی (احسان)دا شتێکی تازەی نەگوتەو، بەس فەرموویەتی:

ئەوەیە کە خوا بپەرستی بە جۆرێك، پێت وابێ دەیبینی یاخود ئەو تۆ دەبینێ، یانی (احسان) بریتی یە لە چاك ئیمانداریێتی کردن و چاك مسوڵمانەتی کردن، چاك بەڕێوە بردنی ئیمان و چاك جێبەجێ کردنی ئیسلام، چونکە ئینسان ئەگەر چاك ئیمان نەهێنێ و ئیمانەکەی دامەزراو و پتەو نەبێ خاوەنەکەی وانازانێ کە لە کاتی خواپەرستی دا خوا دەبینێ یان وا هەست ناکات کە خوا دەیبینێ، وە ئیسلامەتی ونوێژو ڕۆژوو تاعەتەکەشی بە شێوەیەك نابێ و ناکات کە هەست بە چاودێری (مراقبة)ی خوا بکات و بچێتە حاڵەتی (شهود) ەوە.

ئایین و بەرنامەی خوا - لە بواری دینداریی تاکی یدا- هەم عەقیدە و هەم عیبادەت و هەم تەقوا و تەزکیەشە.

کورتەی قسان: ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیمان و ئیسلام لە یەك جیان چونکە پێغەمبەر ﷺ لە پێناسەی ئیسلام دا پێنج پایەکانی فەرموون، کە هەموویان دیار و ئاشکران، بەڵام لە پێناسەی ئیمان دا شەش پایەکانی خستنوونە ڕوو کە هەموویان پەنهانن، بۆیە هەندێك لە زانایان دەڵێن: (الایمان سرٌ والاسلام علانیة) ئیمان پەنهانە بەڵام ئیسلام ئاشکرایە، ئیمان کەس هەستی پێ ناکات، بەڵام ئیسلام هەستی پێ دەکرێت، ئیمان خۆی هەستی پێ ناکرێت بەڵکو شوێنەواری ئیمان هەستی پێ دەکرێت، واتە ئەصڵی ئیمان کە لە دڵ و دەروون و لە عەقڵ و مێشك دا جێگیر دەبێ هەستی پێ ناکرێ، بەڵام بەرهەمی ئیمان کە ئەویش پێکهێنەری ئیمانە هەستی پێ دەکرێ وەکو دان پێداهێنان و شایەتمان و جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و خۆ دوور گرتن لە قەدەغە

کراوەکـان، چونکە هەر کەسێك شایەتمان نەهێنێ و زمانی بەو شێوەیە دانی پێدا نەهێنێ کە ئیمانەکەی داخوازی دەکات، وە ئەندامەکانیشی بەو شێوەیە ڕەفتار نەکەن کە ئیمانەکەی نێو دڵی داخوازی دەکات، ئەوە ئەو بێ فەرمانی و سەرپێچییـــەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لە دڵی دا ئیمان نیە.

(چوارەم): بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە کە دەبینین خوای پەروەردگار بە بێ هەڵاواردن (استثناء)، لە قورئانیدا هەرچی بەڵێـــن و موژدە و مزگێنی باش هەیە بە تایبەت چوونە بەهەشت بە ئەهلی ئیمانی داوە، بەڵام تەنانەت یەك جاریش خوای پەروەردگار موژدە و بەڵێنی چوونە بەهەشتی بە ئەهلی ئیسلام نەداوە، من زۆر سەرنجی قورئانم داوە نەم بینیوە، یەك جاریش خوای پەروەردگار فەرموو بێتی بابای مسوڵمان (مسلم) یان ئەهلی ئیسلام بە موتڵەق دەچنە بەهەشتێ، بەڵام مسوڵمانی کامڵ ئەوە جیایە، چونکە لەو حاڵەتانەدا کە پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) وشەی (مسلم) یان بۆ خۆیان بەکارهێناوە ئەوە بە مانای مسوڵمانی کامڵ و تەواوە کە وەك گوتمان ئیمانیشی لەگەڵ دایە، بەڵێ ئەو حاڵەتە تایبەتە ئەوە جیایە، ئەگەر نا بە (مطلق)ی خوای کاربەجێ و باڵا دەست وەعدە و بەڵێنی بەهەشت وە وەعدە و بەڵێنی خێر و چاکەی دونیاشی بە ئەهلی ئیسلام نەداوە، بۆ وێنە: کە بفەرمویێ سەریان دەخەم بۆ نموونە خوای پەروەردگار دەفەرمویێ: ﴿ وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴾ (الاحزاب-43) واتە: خوا (سبحانە و تعالی) خاوەنی بەزەییە بۆ بڕوادارن، ﴿ تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُ سَلَامٌ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴾ (الاحزاب-44)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە بە دیداری خوا دەگەن بە سەلام کردن سڵاویان لێ دەکات (خوا لەوانمان

بگێڕێ) وە پاداشتێکی بەرێز و حورمەتی بۆ داناون، ئەم دووانە بۆ دونیا، بۆ دوا ڕۆژ و قیامەتیش بەهەمان شێوە :

لە شـــوێنێك دەفەرمـوێ: ﴿ **اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّوُرِ** ﴾ [99] واتە: خـــوا دۆســت و پشـتیوانی بڕوادارنە لە تاریکـــی یەکان قورتاریان دەکـــات بەرەو ڕۆشنایی.

دیسان بۆ ڕۆژی دوایی دەفەرموێ: ﴿ **وَعَدَ اللّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ** ﴾ [100] واتە: خوا بەڵێنـــی داوە بە پیاوانی بڕوادار و ئافرەتانی بڕوادار بە چەند باخێك کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن. وە فەرموویەتی: ﴿ **قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ(1)الَّذِينَ هُمْ فِي صَلاتِهِمْ خَاشِعُونَ(2) وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ** ﴾[101] واتە: بێگومان بڕواداران سەرفرازن. ئەوانەی لە نوێژەکانیان گەردن کەچن. وە ئەوانەی خۆیان لە شـــتی پووچ دەبوێرن. وە هەروەها لە زۆر ئایەتی دیکەش دا، هەمیشە خوای پەروەردگار موژدە و بەڵێنی شـــتی پەسند و باشـی چ لە دونیادا دابێ چ لە قیامەت دا هەمیشـــە و دایم بە ئیمانەوە بەستۆتەوە، چونکە بە بێ ئیمان خوا ئینسان ناکات بە دۆستی خۆی، تاکو شایستەی موژدە و گفت و بەڵێنی خوای پەروەردگار بێ، جا چ پەیوەندی بە دونیاوە هەبێ چ قیامەت، لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی ئەوە نیە خوای بەخشەر دەفەرموێ ﴿ **إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللّهِ الإِسْلاَمُ** ﴾[102] یان دەفەرموێ:

---

(99) البقـرة ( 257) .

(100) التـوبة (72) .

(101) ( المؤمنون 1-3) .

(102) ال عمـران (58) .

﴿ وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنْ الْخَاسِرِينَ ﴾[103] دەڵێین: بەڵێ، بەڵام لێرەدا وشەی (إسلام) لە (سیاق)ی ئایەتەکەدا دەبینرێ کە بە مانای بەرنامە هاتوە و هەموو شەریعەت بە ئاشکرا و پەنهانی یەوە دەگرێتەوە، چونکە دەفەرموێ: بەرنامەی پەسند کراو لە لای خوا تەنیا ئیسلامە، کە ئیمان و هەموو شتەکانی دیکەش دەگرێتەوە، هەروەها ئایەتەکەی دیکە دەفەرمووێ: هەر کەسێك غەیری ئیسلام بەرنامەیەکی دی بخوازێ لـێی قەبووڵ ناکرێ، ئاشکرایە کە لێرەدا ئیسلام بە مانای هەموو دین بەکارهاتوە ئینجا دیارە ئیسلامیش کە بە مانای هەموو دین بەکارهات، ئیمانیش دەگرێتەوە نێو خۆی بە بەڵگەی فەرموودەکەی (جبریل) کە باسمان کرد و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (**انه جبريل اتاكم يعلمكم امر دينكم**) .

(پێنجەم): ئێمە نابینین لە دەقەکانی شەرع دا بەهۆی گوناهانەوە بە هیچ شێوەیەك ئیسلام لە ئینسان نەفی کرابێ، واتە لە هیچ شوێنێك نەبینراوە خوای پەروەردگار یان پێغەمبەر ﷺ بفەرموێ: فلان کەس ئیسلامەکەی ناتەواو بووە بەهۆی فلان گوناهەوە، بەڵام لە چەندەها (دەق)دا هەیە کە ئیمان ناتەواو دەبێ بەهۆی گوناهەوە، وەك لە دەرسی ڕابردوودا باسمان کردو چەند بەڵگەیەکمان لەسەر هێنایەوە، یەکێك لەوانە (**لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن، ولا يسرق السارق حين يسرق وهو مؤمن ولا يشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن**)[104] لێرەدا هەم بۆ بابای

(103) ال عمـران (19) .

(104) متفــق عليه.

زیناکەر، هەم بۆ کەسێك کە دزی دەکات و هەم بۆ کەسێك کە شەڕاب دەخواتەوە، پێغەمبەر ﷺ نەفـی ئیمانی لـێ کردوون، بەڵام وەك پێشتر باسـمان کرد لێـرەدا مەبەسـت پێی ئیمانی کامڵە، واتە: ئەو جۆرە گوناهکارە ئیمانی تەواوی نیە، چونکە ئەگەر ئیمانی تەواوی هەبێ ئیمانەکەی نایهێڵێ ئەو گوناحانە بکات، بەڵێ ئیمانی تەواو بەهەشت بۆ ئینسان مسۆگەر دەکات و گوناه نەکردنیش بۆ ئینسان دەستەبەر دەکات، ئەمە بنچینە (قاعدة)یەکە و زانایان لەسەری یەك دەنگن.

بەڵێ هەر کەسێك ئیمانی تەواوی هەبێ گوناهی گەورە ناکات، دیارە گوناحی گەورەش یان چواندنی فەرزێکە یان شکاندنی سنووری قەدەغە کراوێکە، کەسێکیش وابێ ئەوە چوونە بەهەشتی بە بێ دیتنی سزا و جەزرەبە بۆ مسۆگەر دەبێت.

بەڵام ئیمانی نە کامڵ و ناتەواو دەبینین ئینسان لە گوناهی گەورە ناگێڕێتەوە وەك لەو فەرموودەیەدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن**) کە لێرەدا مەبەست ئەوەیە ئیمانی کامڵی نیە، وە لە قیامەتیش ئەوەی گوناهی گەورەی هەبێ مەگەر خوا هەر خۆی بیبەخشێ ئەگەر نا شایستەی سزا و عەزابە ئەگەر (توبە)ی نەکردبێ، بەڵام دوای سزا و ئازار و ئەشکەنجە ئەگەر ئیمانی هەبێ (واتە ئەصڵی ئیمان) با کامڵیش نەبووبێ هەر ڕزگاری دەبێ و سەرەنجام هەر دەچێتە بەهەشت، بەڵام بە بێ ئیمان ئینسان ناچێتە بەهەشت، کەواتە کە نەفی ئیمان لە ئینسان دەکرێ

بەهۆی گوناحە گەورەکانەوە، بەڵام نەفی ئیسلامەتی لێ ناکرێ، ئەوە بەڵگەیە بۆ ئیسپاتی جیایی ئیمان لە ئیسلام.

(شەشەم): زانایان سەبارەت بە (استثناء)کردن لە ئیمان دا واتە: ئەگەر یەکێك لێی پرسی: ئایا تۆ ئیمانداری (أمؤمن انت؟) بڵێت: بەڵێ ئەگەر خوا بیەوێ (نعم ان شاء الله) ، ڕاجیاییان هەیە:

بەشێکیان دەڵێن: وا باشە و پێویستە بڵێ: ان شاء الله من ئیماندارم کە ئەوانە زۆرینەی زانایانن.

هەندێکیش دەڵێن: پێویست ناکات و بگرە پەسندیش نیە و خراپە، بۆ وێنە: (حەنەفی یەکـــان) دەڵێن ئەو کەســەی کە بڵـێ ان شاء الله ئیماندارم، مانای وایە گومانی هەیە لە ئیمانی خۆیدا و ئەوە زۆر خراپە، بەڵام ڕای زۆربەی زانایانی پێشین و ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەسەر ئەوەیە کە بەلای کەمەوە شتێکی پەسند و سوننەت و چاکە ئینسان بڵێ: ان شاء الله ئیماندارم.

بەڵام بۆ ئیسلامەتی هیچ کەس باسی نەکردوە و یەك زاناش نەیگوتوە ئەگەر بڵێی مسوڵمانم پێویستە بڵێی ان شاء الله یا سوننەتە وا بڵێی، چونکە مسوڵمانەتی دیارە، نوێژ دەکەی و ڕۆژوو دەگری، پێویست ناکات بڵێی ان شاء الله نوێژێ دەکەم، ئەوە نیە نوێژەکەی دەکەی، هەروەها بۆ ڕۆژووگرتن و تاعەتەکانی دیکەش چونکە دیار و ئاشکرایە کە کردووتن.

وە زانایان بۆ حیکمەتی ان شاء الله گوتن بۆ ئیمان چەند شتێکیان گوتـوە:

**یەك:** دەڵێن: لەبەر ئەوەی خوای کاربەجێ بەڵێنی داوە بە ئەهلی ئیمان کە (بەهەشتی)ن، بۆیە هەر کات گوتت: ئیماندارم و بە جەزمی وات گوت، مانای وایە ئەوە بە جەزمی بەهەشتت بۆ خۆت دیاری کردوە! ، دیارە ئەوەش جۆرێکە لە خۆ تەزکیە کردن وئەوەش شتێکی باش نیە چونکە خوا(سبحانه و تعالى) فەرموویەتی: ﴿ **فَلاَ تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ اتَّقَى** ﴾ (النجم -32) بۆیە پەسند نیە کە یەکسەر بڵێی ئیماندارم و وا باشە بڵێی ان شاء الله، ئەگەر خـــوا حەز بکات چونکە لەوانەیە خەلەتێکت هەبێ و تووشـــــی جۆرە (شرك)ێك بووبی و بۆ خۆت هەستی پێ ناکەی!

**دوو:** دەڵێن: لەبەر عاقیـــــبەت و سەرەنجام، کێ دەڵێ تۆ لەسەر ئیمان بەردەوام دەبی کێ دەڵێ دوایی سەرەنجام و خاتیمەت خراپ نابێ! لەبەر ئەوە وەك دووربینی (احتیاط) یەك و ئەدەب ڕەچاو کردنێك وا پەسند و باشە وا بڵێی .

**ســـێ :** دەڵێن وەك ئەدەبێـــــك لەگەڵ ویســـتی (مشـــیئة)ی خـوای پەروەردگاردا، چونکە تەنها خوای پەروەردگار بە تەواویی دەزانێ کە سەرەنجامی شتەکان چۆنە و بۆ خۆت نازانی، لەبەرئەوە وەك ئەدەبێکی ئیسلامی، وەك خوای زانا بە پێغەمبەری فەرمووە ﷺ ﴿ **وَلاَ تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَلِكَ غَدًا(23)إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ** ﴾ (الكهف 23-24) واتە: وە بۆ کارێك کە بەیانی دەیکەی مەڵێ دەیکەم مەگەر بڵێی (ان شاء الله) ئەگەر خوا حەز بکات، بەڵێ ئەدەبێکی ئیسلامی یە کە

ئینسان هەموو شتەکان ببەستێتەوە بە ویست (مشیئة)ی خوای پەروەردگارەوە.

(حەوتەم) : لە یەك شوێن لە قورئانیدا نەهاتوە کە خوای پەروەردگار فەرمانێك یاخود قەدەغەکردنێك ئاراستەی مسوڵمان بکات بە ناوونیشانی ئیسلام و بڵێ **(یا أیها الذین اسلموا)** بەڵکو هەمیشە هەر دەفەرموێ ﴿ **يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا** ﴾ چونکە ئەگەر ئینسان ئیمانی نەبێ ناتوانێ فەرمانی خوا جێبەجێ بکات و ناتوانێ لە قەدەغە کراو (حرام)ەکان دوور بکەوێتەوە، بەڵێ جاری وایە بە ڕواڵەت لە قەدەغەیەك دوور دەکەوێتەوە یا بە ڕواڵەت فەرمانێك جێبەجێ دەکات وەك (منافق)ەکان، بەڵام لەبەر خوای نیە، ئەوە لە لایەکەوە.

لە لایەکی دیکەشەوە: ئینسان بە بێ ئیمان شایستەی ئەوە نابێ خوا بیدوێنێ و ئەرکی پێ بسپێرێ، بەڵکو لەو حاڵەدا (واتە پێش ئیمان هێنان) ئەگەر بیدوێنێ بۆیە دەیدوێنێ کە ئیمان بێنێ! بەڵێ دواندن (خطاب)ی خوای کاربەجێ (سبحانه وتعالى) بۆ ئینسان پێش ئیمان هێنانی، بەس بۆ ئەوەیە پێی بڵێ: ئیمان بێنە! بۆ وێنە: ﴿ **يَاأَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمْ** ﴾ [105] واتە: ئەی خەڵکینە پەروەردگاری خۆتان بپەرستن و بەندایەتی بۆ بکەن، بەڵام نەیفەرمووە ئەی کافرەکان نوێژ بکەن و ڕۆژوو بگرن!، بەڵکو پێیان دەفەرموێ، ئیمان بێنن واتە جارێ بیناسن و ئیمانی پێ بێنن، پاشان کە قبووڵیان کرد بەندەی بن ئەوجار بەندایەتی بۆ بکەن و ئەو کاتە خوای پەروەردگار ئەرکەکانیان پێ دەسپێرێ.

---

(105) البقرة (21) .

کەواتە بە بێ ئیمان ئینسان شایستەیی ئەوەی نیە کە خوای کاربەجێ تەکلیفی بخاتە سەر شان.

(هەشتەم): بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە کە لە دەقەکانی قورئان و سوننەت دا باسی زیاد کردن وکەم کردنی ئیمان کراوە کە ئیمان کەم و زیاد دەکات، وەك لە داهاتوودا بە درێژی باسی دەکەین، بەڵام باسی زیاد کردن و کەم کردنی ئیسلام نەکراوە.

ئەمانە هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئیمان و ئیسلام لە یەك جیان و تەنیا لە یەك حاڵ دا وەك یەکن و دەچنە نێو یەك ئەویش ئەوەیە کە ئینسان ئیسلامێکی تەواوی پێ بێ و مسوڵمانی کامڵ و تەواو بێ ئەوە دیارە ئیمانیشی پێیە.

(نۆیەم) : وە لە کۆتایی دا ئەم فەرموودەیەش لەو بارەوە بەڵگەیە و هەر ئەوە دەگەیەنێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (**عن عمرو بن عَبْسَةَ قال: جاء رجل الى النبي ﷺ فقال: يا رسول الله ما الإسلام؟، قال: أنْ تُسْلِمَ قلبك لله وأنْ يسلم المسلمون من لسانك و يدك، قال فأي الاسلام أفضل؟ قال: الايمان، قال وما الايمان؟ قال أن تؤمن بالله و ملائكته و كتبه و رسله والبعث بعد الموت**)[106] واتە: (عەمری کوڕی عەبسە) ﷺ دەڵێ: ﴿پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیسلام چی یە؟ فەرمووی: ئیسلامەتی ئەوەیە کە دڵت گەردن کەچ بکەی بۆ خوا، وە کە مسوڵمانان لە دەست و زمانت دڵنیا و سەلامەت بن﴾، واتە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوو شتان ئیسلامی تەفسیر

(106) رواه احمد والطبراني في الكبير بنحوه و رجالــه ثقات.

کرد، یەکەم: دڵت بۆ خوا گەردن کەچ و تەسلیم بێ، دووەم: مسوڵمانان لە دەست و زمانت سەلامەت و ئەمین بن، بەندەی باش بی بۆ خوا و برای باش بی لەگەڵ خەڵك دا، پاشان (عەمر) ﴿گوتی: ئەدی باشە کام بەشە لە ئیسلام دا چاکترە؟!﴾ نەك چ جۆرە (ئیسلام)ێك! ﴿ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیمان﴾ ئەوجار (عمر بن عبْسة)، ﴿گوتی: ئەدی ئیمان چی یە؟ فەرمووی: ئیمان ئەوەیە کە بڕوا بە خوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی بێنی و وە بەوەی کە لە دوای مردن زیندوو دەکرێیەوە﴾.

لێرەدا دەبینین : ئیمان چۆتە نێو ئیسلامەوە و وەك باشترین بەشی ئیسلام دانراوە.

ئینجا ئایا بەڵگەمان چییە کە لێرەدا ئەو ئیسلامە مەبەست پێی ئیسلامی تەواوە؟

یەکەم: ئیمان بووەتە گەورەترین بەشی، کە دەفەرمووێ (**أيُّ الاسلام أفضل؟ قال: الايمان**)

دووەم: پێغەمبەر ﷺ کە پێناسەی ئیسلامی کردوە دەفەرموێ (**ان تُسْلِمَ قلبك لله**) جا دیارە دڵ تەسلیم بوونیش بریتی یە لە کاکڵی ئیمان هێنان.

کەواتە ئەو ئیسلامەی لێرەدا پێغەمبەر ﷺ پێناسەی دەکات و ئیمان دەبێتە بەشێکی، دیارە ئیسلامی تێرو تەواوە، ئێمەش هەر گوتمان ئیسلامی تەواو ئیمانیشی لەگەڵ دایە، بەڵام ئیسلامی ڕوو کەشی و ڕواڵەتی، مەرج نیە ئیمانی لەگەڵ دا بێ، وەك ئیسلامی (منافق)ەکان و عەرەبە خێڵەکی یەکان، یان وەك ئیسلامی هەر کەسێکی دیکە کە بە ڕواڵەت دێتە نێو ئیسلامەوە بەڵام هیچ لە هیچ حاڵی نەبووە، ئەوە مەرج نیە ئیمانی لەگەڵ دابێ.

بە کورتی: ئیمان هەمیشە ئیســــــلامی لەگەڵ دایە و هەر کات ئینسان ئیمانی هەبێ حەتمەن مسوڵمان دەبێ و گەردن کەچ و تەسلیمی فەرمانی خوا دەبێ. بەڵام مەرج نیە هەمیشە ئیسلام ئیمانی لەگەڵ دابێ بەس لە یەك حاڵ دا ئیمان و ئیسلام هەمیشە تێك هەڵکێش دەبن (واتە ئیمان هەر لەگەڵ ئیسلام دەبێ) ئەویش ئەوەیە کە ئیسلام ئیسلامی تەواو بێ، جا چ بە مانای ئایین و شەریعەتی خوا بێ، چ بە مانای دینداریی و مسوڵمانەتی چاك بێ.

سبحانك اللهم وبحمدك اشهد ان لا اله الا انت استغفرك واتوب اليك.

# دەرسـی چـوارەم

# ئایا ئیمان زیاد و کەم دەکات وە هۆکارەکانیـــان چیـــن ؟!



الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله ومن اهتدى بهداه، وبعد:

بەڕێزان!

مەسەلەی زیاد کردن وکەم کردنی ئیمان وەك گەلێك باس و بابەتی دیکە لە بواری ئیمان وعەقیدەدا، لە نێوان ئەهلی سوننەت و جەماعەت و ئەهلی بیدعەت دا کێشەو مشت ومڕی لەسەر هەبووەو ئێستاش هەر هەیە.

هەرچی ئەهلی سوننەت و جەماعەتن بینا لەسەر بناغەی پێناسەیان بۆ ئیمان، کە ئیمان چوار پێکهێنەری بنەڕەتی هەن، دەڵێن: بەڵێ ئیمان گەشە و زیاد دەکات و کەمیش دەکات.

بەڵام ئەهلی بیدعەت بە (خوارج) و (معتزلة)وە و، بە (جَهْمية)و (مُرجئة) وە، وە تەنانەت هەندێك لە (الأشعرية) کان و (الماتريدية) کانیش دەڵێن: نەخێر ئیمان نە کەم دەکات و نە زیادیش دەکات، هەتا ئیمان هەبێت ئەوە ئیمانە و ئەگەر نەشما ئەوە یەکجاری نامێنێ و گەشە و زیاد ناکات.

جا هۆی بەهەڵەدا چوونی ئەهلی (بِدَع)[107] زیاتر ئەوەیە کە دەڵێن ئیمان یەك شتە، ئەویش بریتی یە لە (تصدیق) بە ڕاست زانین، بەڵێ دەڵێن:

ئیمان تەنها یەك حەقیقەتە کە بریتی یە لە بە ڕاست زانینی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ وە هەرچی لە لایەن خواوە هەواڵ بە پێغەمبەر ﷺ دراوە، ئینجا دیارە بە ڕاست زانین یەك شتە و پێچەوانەی بە ڕاست زانینیش بریتی یە لە بە درۆ زانین (تکذیب) ئەویش هەر یەك شتە، هەتا بە ڕاست

(107) (البِدَع) کۆی (بدعة) یە کە لە زاراوەی شەرع دا بەهەر داهێنراوو پەیدا کراوێك دەگوترێ کە لە دین دا دادەهێنرێ بە تایبەت لە بواری عەقیدە و عیبادەت دا.

زانین لە دڵی ئینسان دا هەبێ ئەوە ئیمانە، بەڵام لەگەڵ بە درۆ زانین هاتە پێش ئەوە (تکذیب)ە و (کفر)ە، جا ئەوان - واتە داهێنەرەکان (المبتدعون)- بۆیە بە هەڵەدا چوون، چونکە ئیمان لە یەك شت دا دەبینن کە بریتییە لە (تصدیق)، ئینجا ئەو (تصدیق)ەش بە چەمك و واتایەکی زۆر گچکە و هەڵە تێدەگەن کە بە ڕاســـت زانینی نێو دڵە (التصدیق القلبي)، واتە نە دان پێداهێنانی زمان و نە کردەوەی ئەندامەکانیان لەگەڵ حساب نەکردوون، وەك پێشتر باسمان کرد.

بەڵام لە راستی دا ئیمان بەشێك لە مانایەکەی بریتی یە لە (تصدیق)، وە (تصدیق)یش بەهەرسێك بەشەکانییەوە کە: (بە ڕاست زانینی عەقڵ و دڵ) و (دان پێداهێنانی زمان) و (جێبەجێ کردنی ئەندامەکان)، بەڵێ (تصدیق) بە هەرسێك بەشەکەیەوە، بەشێکە لە ئیمان، نەك هەموو ئیمان بریتی بێت لە (تصدیق) و (تصدیق)یش تەنیا ئەوە بێت کە بە دڵ بە ڕاستی بزانی!

جـا ئێمە لە چـوار خـاڵان دا مەســـەلەی کەم و زیادکردنـــی ئیمـــان دەخەینـــە ڕوو:

- سەرەتا چەند بەڵگەیەك دێنینەوە لەسەر زیاد کردنی ئیمان، کە کەم کردنیشی بە چەمکی پێچەوانە (مفهوم المخالفة) دەگەیەنن.
- دوایی بوارەکانی گەشە کردن و زیاد کردنی ئیمان و کەم کردن و لە کورتی دانی ئیمان دەخەینە ڕوو.
- دوایی پلەکانی (درجات)ی ئیمان دەخەینە ڕوو.
- وە پاشان و لە کۆتایی دا هۆکارەکانی زیادکردن و کەم کردنی ئیمـــــان، ئیمان بە چی گەشە و زیاد دەکات، وە بە چیش کەم دەکات، کە بێگومان ئەوەی کۆتایی یان لە هەموویان گرنگترە.

**خاڵی یەکەم: بەڵگەکانی زیاد و کەم کردنی ئیمان:-**

ئەو بەڵگانەی کە دەکرێ بە بەڵگە بهێنرێنەوە لەسەر ئەوە کە ئیمان زیادو گەشە دەکات وبەرەو پێش دەچێت وکامڵ دەبێت، وە بە پێچەوانەشەوە دەگونجێ کە وردە وردە کەم بکات وکەم وکوڕی ڕووی تێ بکات و لە نێو بچێ، ئەمانە هەندێکیانن:

1- ئایەتی (4) لە سوڕەتی (الفتح) کە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ **هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَعَ إِيمَانِهِمْ** ﴾(108)
واتە: خوا ئەو زاتەیە کە ئارامی دابەزاندۆتە سەر دڵی بڕواداران، بۆ ئەوەی وێڕای ئەو ئیمانەی هەیانە ئیمانی دیکەشیان زیاد بکات.

واتە: ئیمانیان هەیە، بەڵام لەو ئیمانە زیاد بکات، ئەصڵی ئیمانیان هەیە دوایی دەبێ بە ئیمانی (واجب)، یان ئیمانی (واجب) یان هەیە، بەڵام زیاد دەکات و دەبێ بە ئیمانی (مستحب)، وەکو دوایی باسی دەکەین، جا ئەصڵی ئیمانیش بۆ خۆی چەندان پلە (درجة) یە، وە ئیمانی (واجب)یش چەندان پلە (درجة)یە، وە ئیمانی (مستحب)و کامڵ و تێرو تەواویش چەندان پلە (درجة) یە.

2- لە ئایەتی (2)ی (الأنفال)یش دا دەفەرمووێ: ﴿ **إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ** ﴾(109) واتە: بڕواداران تەنیا ئەوانەن کە باسی خوا کرا دڵیان

---

(108) الفتـــح (4) .
(109) أنفـــال (2) .

ڕادەچڵەکێ، وە ئەگەر ئایەتەکانی خوایان بەسەردا خوێنرایەوە ئیمانیان پێی زیاد بێ وە تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، دیارە ئەم ئایەتەش دەقێکی زۆر ڕاشکاو و ڕوونە بۆ ئیسپاتی زیاد و کەم کردنی ئیمان.

3- وە لە سورەتی (التوبة) دا دەفەرموێ: **(وَإِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَذِهِ إِيمَانًا فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ)**[110] واتە: هەر کاتێك سوورەتێك بنێردرێتە خوارێ، هەندێك لە دڵ نەخۆشەکان، لە (منافق) و دەغەڵەکان دەڵێن: کامەتان بەم سورەتە ئیمانی زیاد بوو، ئەوە وەك ڕەخنە گرتن لە قورئان کە دەفەرموێ ﴿ **وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا** ﴾ بەڵام ئەوانەی ئیمانیان هەیە کاتێك سورەتێك یان چەند ئایەتێك بێتە خوارێ ئەوا ئیمانیان پێی زیاد دەبێ و پێی دڵخۆش دەبن.

4- ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە تێیدا باسی پلەکان (درجات)ی بەرەنگار بوونەوە لەگەڵ خراپە و نا شەرعییەکان دا دەکات:

کە دەفەرموێ: ﴿ **من رأى منكم منكرا فَلْيُغَيِّره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه، فإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الايمان** ﴾[111] واتە: هەر کامێکتان نا شەرعی یەکی بینی با بەهێز بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی با بە زمان باسی بکات و خەڵکی لێ ئاگادار بکاتەوە، ئەگەر هەر نەیتوانی با بە دڵ ڕقی لـــێی بێتەوە، پاشان وەك پێناسەیەکی ئەم هەڵوێستە

---

(110) التوبة (124) .

(111) رواه مسلم و أصحاب السنن.

سێیەمە لە بەرانبەر نا شەرعییەکان دا، دەفەرموێ: ﴿ **وذلك اضعف الايمان** ﴾ واتە: کەسێك تەنیا هەڵوێستی دەروونی لە بەردەم (منکر) و ناشەرعیی دا هەبێ، ئەوە لاوازترین ئیمانی هەیە.

ئینجا ما دام لاوازترین جۆرە ئیمان هەبێ، دیارە ئیمانی بەهێز و بەهێزترین ئیمانیش هەیە، ئەم فەرموودەیەش ئاماژەیە بۆ کەم کردنی ئیمان و پێمان دەڵێ کە کەسێك لە بەرانبەر نا شەرعیەکان دا تەنیا بە دڵ هەڵوێستی ئیجابی وەربگرێ ئەوە ئیمانێکی کەم و لاوازی هەیە.

5- ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە تێیدا دەفەرموێ: (**اكمل المؤمنين ايماناً احسنهم خُلُقا**)[112] واتە: ئیمان تەواوترینی بڕواداران ڕەوشت جوانترینیانە،کێ ڕەوشتی جوانتر بێ ئیمانی تەواوترە، دیارە مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیە کە ئینسان هەتا ئیمانی زۆر چاك نەبێ عیبادەتی زۆر باش ناکات، وە هەتا عیبادەتی زۆر باشیش نەکات، ڕەوشتی زۆر بەرزو جوانی نابێ وبرایەتیی زۆر باش ناکات لەگەڵ خەڵك دا، ئەمانە  واتە: ئیمانی پتەوو تەواوو عیبادەتی ڕاست و دامەزراو خوو و ڕەوشتی بەرزو جوان پێکەوە پەیوەست،(متلازم)ن و ئەگەر ئینسان ئیمانی باشی هەبوو، بەندەی باشیش دەبێ بۆ خوای بەرز و مەزن و برای باشیش دەبێ لەگەڵ مسوڵمانان.

ئەوە چەند دەقێك لەسەر ئەوە کە ئیمان زیادیش دەکات و کەمیش دەکات، کە بە ڕاستی بیدعەتچییەکان (أهل البدع) هیچ وەڵامێکیان بۆ

---

(112) رواه احمد و ابو داود وقال الترمذي حديث حسن صحيح، وصححه الحاكم، وحسنه الالباني، السلسلة الصحيحة، بەرگی -1- لاپەڕە 284.

ئەو بەڵگانە پێ نیەو ئەوەندەی من سەرنجی کتێبەکانیانم داوە تاکە شتێك کە لەو بارەوە بە بەڵگەی بێننەوە ئەوەیە کە هەندێکیان دەڵێن مەبەست لە (زادتهم ایمانا) ئەوەیە کە کردەوە چاکەکان کە ئیمان بەرهەمیان دێنێ زیاد دەکەن، یانی ئایەتیان بەسەردا دەخوێنرێتەوە، بۆ نموونە ئەو ئایەتە باسی زەکات دەکات، ئەوانیش زەکات دەدەن و کردەوەیەك لەو کردەوانەی کە پەیوەندییان بە ئیمانەوە هەیە زیاد دەکات!! ، بەلاّم زۆر ڕوونە کە ئەوە (تأویل)ێکی زۆر دوورە و (تکلّف)ێکی زۆری پێوە دیارە.

**(خـاڵی دووەم): بوارەکانی زیاد کردن و کەم کردنی ئیمان:-**

ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەسەر ئەو پێناسەیەی هەیانە بۆ ئیمان کە وەك ڕوونمان کردەوە پێناسەی ڕاســـت و دروست هەر ئەوەیە، زۆر بە ئاسانی وەلاّمی ئەوە دەدەنەوە دەڵێن: ئیمان چەندان پێکهێنەری هەنە و لە بواری هەموو پێکهێنەرەکانی دا بەهۆی تاعەتەوە زیاد دەکات وە لە ئەنجامی خراپە و سەرپێچیش دا کەم دەکات .

چونکە ئیمان وەك باســمان کرد چوار پێکهێنەری هەن، دوویان پەیوەندی یان بە عەقڵ و دڵ و دەروونەوە هەیە، سێیەمیشــیان بە زمان و چوارەمیشیان بە ئەندامەکانەوە جا یەکێك لە پێکهێنەرەکانی ئیمان کە پەیوەندی بە عەقڵ و دڵەوە هەیە بریتی یە لە : ناسین و بە ڕاست زانین (المعرفة والتصدیق) .

وە پێکهێنەری دووەمی ئیمان بریتی یە لە : خۆشــویستن وقبووڵ کردن و پەسند کردن ورازی بوون و ئیخلاص و ... هتد کە سەرجەمیان دیسان بە دڵ و دەروونەوە پەیوەستن.

پێکهێنەری سێیەم بریتی یە لە : دان پێداهێنان و دەربڕین بە زمان.

پێکهێنەری چوارەم بریتی یە لە : کردەوەی ئەندامەکان.

کەواتە ئینسان هەتا ناسینی بۆ خوا ﷻ زیاتر بێ و باشتر بیناسێ و لەسەر ئەو ناسینەش (تصدیق)ی خوای پەروەردگار بکات و بە ڕاستی بزانێ، خۆی و ناو و سیفەتەکانی و ئایەتەکانی، وە فەرمانەکانی بە ڕاست بزانێ و ئایین وبەرنامەکەی بە ڕاست بزانێ، پێغەمبەرەکانی (علیهم الصلاة والسلام) بە ڕاست بزانێ ئەوە هەتا ئەو بە ڕاست زانین (تصدیق)ەی زیاتر بێت، ئیمانەکەی چاکترە، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر زانین و بە ڕاست زانین (المعرفة و التصدیق)ەکەی کەم بکات، بۆ نمونە یەکێك گومانێکی بخاتە دڵ یا، شەیتانێك وەسوەسەیەکی بخاتە دڵ و (تصدیق)ەکەی کەم بێتەوە، ئەوە بێگومان لەو حاڵەتەدا ئیمانەکەی بەرەو کزیی دەچێ، چونکە کە (تصدیق)ەکەی کزو لاواز و کەم بوو، ئەوە کردەوە دڵیەکانیش (الاعمال القلبیة)ی کەم دەبن، کە ئەوانیش کەم بوون، کز و لاواز بووە، دان پێداهێنانی زمانیشی و کردەوەی ئەندامەکانیشی کەم دەبن، ئاوا بە زنجیرە.

زۆر کەس هەبووە مسوڵمانێکی باش بووە، بەڵام شەیتانێکی جینی یان ئادەمی چووە گومانێکی لە عەقیدەی دا بۆ دروست کردوە، دەربارەی خوای پەروەردگار، یان دەربارەی پێغەمبەر ﷺ ، یان ڕۆژی دوایی، ئەویش زانیاریی ئەوەندە پێ نەبووە بەرپەرچی بداتەوە، سەرەنجام ئەو گومانە لە دڵی دا بەهێز بووە و دوایی وردە وردە ئیمانەکەشی لابردوە، وە ئەم مەسەلەی (تصدیق)ەش هەر کە گومان ڕووی تێ کرد، تازە (تصدیق) نامێنێ و زانین و بە ڕاست زانین (المعرفة والتصدیق)یش وەك پێشتر گوتمان مەرجی یەکەمی دروست بوونی ئیمان و یەکەمین پێکهێنەر و بناغەیەتی و هەر کە گومان ڕووی تێ کرد شتەکانی دیکەش هەرەس دێنن و بەسەر یەك دا دەڕمێن، بۆیە خوای

پەروەردگار دەفەرموێ ﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا ﴾(113) واتە: بـڕواداران تەنیا ئەوانەن کە ئیمانیـــان بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە وە هیچ گومانیشیان نی یە.

پوختەی مەبەست:

بناغـــە و مەرجی یەکەمی پەیدا بوونی ئیمان بریتی یە لە زانین و بە ڕاســت زانین (المعرفة والتصدیق) و هەر کامێکیشیان چەندان پلەیان هەیە .

کەواتە ئەو ئیمانەش کە لەسەریان بنیات دەنرێ پلە پلەیە و بەرزیی و نزمی تێدایە.

وە هەر کام لە زاراوەکانی (علم الیقین و عین الیقیـن و حق الیقیـن) کە خوای کاربەجێ لە قورئانیدا بەکاری هێناون بۆ تەعبیـر کردن لە جۆرەکانی دڵنیایی (یقیـن) و پلەکانی بەڵگەیەکی دیکەی ڕوونە لەسەر هەبوونی پلان (درجات) لە بە ڕاست زانین (تصدیق)دا.

ئینجا پێکهێنـەری دووەمی ئیمـان کە کردەوەکانی دڵ (أعمال القلب)ن، وەك : خۆشویستنی خوای پەروەردگار(جل جلاله)و پشت پێ بەستنی ولـێ ترسانی و شــەرم لێکردنی و ... هتد ، وە خۆشویستنی پێغەمبەری خوا ﷺ و ڕێـــز لێگرتنی و... هتد. بێگومان ئەمانیش بەرزیی و نزمییان لە نێوان دا هەیە. بۆ نموونە: لە ڕووی خۆشەویستییەوە. خۆشویستنی بەهێز و بەهێزترین هەیە، وە هی لاوازیش هەیە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿....وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ ﴾ (البقرة – 165) .(114)

(113) الحجرات (15) .

(114) واتە : وە خۆشەویستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە بۆ خوا، زیاترە لە خۆشەویستی خەڵکی دیکە بۆ پەرستراوەکانی خۆیان کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن.

جا دەربارەی کردەوەکانی دڵ، هەرچەندە زانایان تا ڕاددەیەك کێشەیان لەسەر ئەوە هەیە کەوا کام کردەوانەن مەرجن بۆ ئەوەی کە ئیمان هەبێت، بەڵام هیچیان ڕاجیایی‌یان نیە لەو بارەوە کە کردەوەکانی دڵ بە گشتی مەرج و پێکهێنەری ئیمانن. وە لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە هەندێك لە کردەوەکانی دڵ دەبێ هەر هەبن بۆ هاتنە دی ئیمان، وەك: خۆشویستن (الحب) لێترسان (الخشیة) بە گەورەگرتن (التعظیم) و مل بۆ کەچ کردن و قبووڵ کردن (الإذعان والقبول) و خوا پێ مەبەست بوون (الإخلاص) ...

بەڵام بێگومان هەق لەو بارەوە هەر ئەوەیە کە هیچ کاتێك ئیمان بە ئیمان دانانرێ کە کەم وزۆر پشك و بەشی لە سەرجەم کردەوەکانی دڵ دا نەبێ.

واتە: کەسێك بە خاوەن ئیمان دادەنرێ کە پشك و بەشی لە لای کەمی سەرجەم کردەوەکانی دڵ (أعمال القلب) دا هەبێ.

کەواتە کورد گوتەنی: (کاکە شەرع زۆر قووڵە)!!، هەیە وا دەزانێ ئیمان تەنیا وشەیەکە بە زار دەیڵێ و تازە ئەوە ئیمانی هێنا! ، نەخێر بەڵکو مەسەلەکە زۆر قووڵە و کۆمەڵێك کردەوەی دڵ (اعمال القلب) هەن، دەبێ ئەوانە هەموویان هەبن ئینجا ئەو ئیمانە پەیدا دەبێ کە لە لای خوا ئیمانە.

جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئیمانداران بەرزیی و نزمیی (تفاضل) یان هەیە لە بەهرەمەند بوونیان لە کردەوەکانی دڵدا، بۆیە لەو ڕووەشەوە ئیمان بەرزیی و نزمیی و زیادیی و کەمیی ڕووی تێ دەکات.

ئینجا پێکهێنەری سێیەم: کە دەربڕینی زمان (إقرار اللسان) ە، کە ئەویش لای کەمییەکەی لە شایەتمان دا خۆی دەبینێتەوە، چونکە شایەتمان مەرجی بنەڕەتی یە بۆ ئەوەی ئینسان بە مسوڵمان لە قەڵەم بدرێ، بەڵام زیکرو

یـــادی خوای بەرز ومەزن (سبحانە و تعالی)، وە ســـــەڵەوات دان لەســـەر پێغەمبەر ﷺ ،وە دیفاع کردن لە ئیسلام و مسوڵمانان بە زمان و قەڵەم، وە ڕوون کردنەوەی ڕاستییەکانی ئیسلام(تبیـین حقائق الاسلام)و پووچەڵکردنەوەی بیـروبۆچوونە پووچەکانی نەیارەکـــــانی (إبطال أباطیل خصومە)، ئەمانە هەموویان بە هەبوونیان ئیمان زیاد دەکات و بە نەبوونیشیان کەم دەکات .

پێکهێنەری چوارەمی ئیمان کە کردەوەی ئەندامەکانن. بەهەمان شێوە، چونکە ئینسان هەتا کردەوەی چاکی زیاتر بن، دیارە ئیمانەکەشی زیاد دەکات، وە بە پێچەوانەوەوە هەتا کردەوە چاکەکانی کەمتر ببنەوە ئیمانەکەشی پێیەتی کەم دەبێتەوە.

کەواتە: ئێستا تا ڕاددەیەك ڕوون بوەوە کە زیاد کردن و کەم کردنی ئیمان لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا مەسەلەیەکی ڕوون و بێ چەند وچوون و مشت ومڕ هەڵنەگرە. هەر بۆیەش سەرجەم زانا و پێشەوایانی ڕەسەنی ئۆممەت لەسەری ڕێککەوتوون.

**(خـاڵی سـێیەم) : پلـەکانی ئیمان (مراتب الایمان)**

سەرجەم زانا و پێشەوایانی ڕەسەنی ئیسلام لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئیمان تەنها یەك پلە نیە، بەڵکو سێ پلەی سەرەکیی هەن و هەر کام لەو پلە سەرەکییانەش چەندان وردە پلەی دیکەیان هەن.

جا ئێمە بە کورتی دەربارەی هەر کام لە سێ پلە سەرەکییەکانی ئیمـــــان دەدوێین:

**پلـەی یەکـەم : ئەسڵی ئیمـان :**

پلەی یەکەمی ئیمان زانایان چەند وشە وزاراوەیەکیان بۆ بەکارهێناون وەك:

"الايمان المجمل" وە "أصل الايمان"وە "مطلق الايمان" واتە:

ئیمان بە کورتی ، بنەڕەتی ئیمان، ئیمان بە ڕووتی.

مەبەستیش لەم جۆر و پلەی یەکەمی ئیمانە کە بەو سێ وشە و زاراوەیە تەعبیری لێ دراوە ئەوەیە کە:

ئینسان لای کەمی ئیمانی هەبێ. لای کەمی ئیمان (الحدّ الادنی من الایمان) یش بریتی یە لەوە کە بابای ئیماندار لای کەمی هەر کام لە چوار پێکهێنەرەکانی ئیمانی هەبن، واتە لای کەمی:

1- زانین و بە ڕاست زانینی عەقڵ و دڵ

2- کردەوەکانی دڵ.

3- دان پێداهێنانی زمان

4- کردەوەی ئەندامەکان

چونکە هەر کام لەو چوارانە - وەك پێشتر باسمان کرد - بە پێکهێنەر (مکوِّن)ی ئیمان دادەنرێن و هەر کامێکیان نەبێ ئیمان نایەتە دی و پەیدا نابێ.

دیارە لای کەمی ئیمانیش- کە بە ئیمانی کورت و بنەڕەتی ئیمان و ئیمانی ڕووت پێناسە کراوە- ئینسانی پێ دەبێتە مسوڵمان و بڕوادارو پێی لە کوفر و شیرك و نیفاق قوتار دەبێ بەڵام خاوەنەکەی لە گوناهە زلەکان (الکبائر) ناپارێزێ، هەر بۆیەش لە دوا ڕۆژیش دا هەرچەندە خاوەنی ئەو جۆرە ئیمانە سەرەنجام بەهەشتی‌یە و لە دۆزەخ دا بە هەمیشەیی نامێنێتەوە، بەڵام مەگەر خوای بە بەزەیی خۆی بیبەخشێ ئەگەر نا بە گوێرەی خراپە و سەرپێچییەکانی دووچاری سزا و جەزرەبە دەبێ.

**پلەی دووەم : ئیمانی پێویست :**

پلەی دووەمی ئیمانیش کە زانایان هەر کام لە زاراوەکانی:

"الایمان الواجب" وە "الایمان المفصّل" وە "الایمان المطلق" یان بۆ بەکار هێناوە بریتی یە لەو جۆرە ئیمانەی کە خاوەنەکەی سەرجەم ئەو شتانەی کە فەرز و پێویستن لە:

1- بە ڕاست زانینی دڵ (تصدیق القلب).

2- کردەوەکانی دڵ (اعمال القلب).

3- دان پێداهێنانی زمان (إقرار اللسان).

4- کردەوەی ئەندامەکان (أعمال الجوارح).

لە خۆیدا بیانهێنێتە دی.

جا وەك چۆن " ئەســـــڵی ئیمان " کە پلەی یەکەم و لای کەمی ئیمانە خاوەنەکەی دەباتە ڕیزی ئیماندارانەوە ناهێڵێ بە(کافر ومشرك ومنافق) ناوزەد بکرێ. ئیمانی پێویستیش خاوەنەکەی دەباتە ڕیزی پارێزکارانەوە و ناهێڵێ بە (فاسق) دابنرێ. چونکە ئەم جۆرە ئیمانـــــە هێز و پێزی ئەوەی هەیە کە خاوەنەکەی لە گوناهە زلەکان (کبائر الذنوب) بگێڕێتەوە، واتە وای لێ بکات کە فەرزەکانی خوا نەچوێنێ و قەدەغەکانیشی نەشـــــکێنێ و سنوورەکانی نەبەزێنێ، هەر بۆیەش خاوەنـــــی ئەو جۆرە ئیمانە لە دوا ڕۆژدا بە بێ ئازار و جەزرەبە دێتە بەهەشتی ڕازاوە و نەبڕاوەی خوای بە بەزەیی و بەخشـــــندەی مسۆگەرە.

ئینجا هەرچەندە ئەم جۆرە دووەمەی ئیمان خاوەنەکـــــەی لە گوناهە گچکەکان (صغائر الذنوب)ناگێڕێتەوە. بەڵام کەسێك خاوەنی ئیمانی پێویست (الایمان الواجب) بێت خوای بەخشەر بە کەرەمی بێ سنووری خۆی وردە هەڵەو

گوناهەکانی لەسەر حیساب ناکات ودەیبەخشێ لە بەرەکەتی خۆپاراستنی لە گوناهە گەورەکان کە لە چواندنی فەڕزەکان و شکاندنی قەدەغەکان دا خۆی دەبینێتەوە، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ إِنْ تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُمْ مُدْخَلاً كَرِيمًا ﴾ (النساء- 31) .

واتە: ئەگەر خۆتان لەو گوناهە زلانە بپارێزن کە لێتان قەدەغە کراون، ئەوە خراپەکانتـــان (واتە گوناهە گچکەکـــان) لــێ دەسڕینەوە و دەتانخەینە شوێنێکی پڕ ڕێز و حورمەتەوە (کە بەهەشتە).

**پلـەی سـێیەم : ئیمـانی پەسـند و کـامڵ**

ئەم پلەی ســـێیەمەی ئیمانیش کە چاکترین و بەرزترین جۆر و پلەیەتی. زانایان چەند وشە و زاراوەیەکیان بۆ پێناسە کردنی بەکارهێناوە، وەك:

1- الايمان المستحب .

2- الايمان الكامل .

3- الايمان المطلق .

ئەم جۆرە ئیمانەش بریتی یە لە ئیمانێك کە خاوەنەکەی وا لــێ دەکات وێرای هەموو ئەرکە فەڕزو پێویستەکانی مسوڵمانەتی لە هەر چوار بوارەکانی:

(بە ڕاست زانین و تەســلیم بوون و دان پێداهێنان و جێبەجێکردن)دا سەرجەم ئەو ئەرکانەش جێبەجێ بکات کە سوننەت (مندوب)ن و، سەربارەی خۆپاراستــن لە قەدەغەکراوەکان (المحرَّمـــــات)، خۆی لە ناپەســـــندەکان (مکروهات)یش دەپارێزێ و نزیکیان ناکەوێ.

کەواتە: بەرهەمی ئەم جۆرە ئیمانە کە بە ڕاســـــتی بریتی یە لە ئیمانی پەسند وتێر و تەواو، لە دنیادا بریتـــی یە لەوە کە مسوڵمانەتییـــەکی پاك و پوخت وتەواو لە خاوەنەکەی دا دێنێتە دی، مسوڵمانەتییەك و بەندایەتییەك

کە پڕ پڕە لە تاعەت و چاکەکاریی و پاك و بێگەردیشـــە لە خراپە و لادان و لاریی، وە بەرهەمی ئەم جۆرە ئیمانەش لە دوا ڕۆژدا بریتـــی یە لە گەیشتن بە ڕەزامەندی خـــوای بەرزو مەزن و نیشـــتەجێ بوون لە بەهەشـــتە ڕازاوە و نەبڕاوەکانی دا بە بێ هیچ گرفت و ئازار و ئەشکەنجە و دەردەسەرییەك.

بەڵگـەش لەسەر ئەم سێ جۆرە ئیمانە و، دابەش بوونی ئیمان بە گشـتی بۆ ئەم سـێ پلەیە زۆرن کە ڕەنگـە ئەم ئایەتە بە پێـزە، بەهێـزترینیان و ڕوونتـرینیان بێ:

﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ ﴾ (فاطر-32).

واتە: پاشـــان کتێبـی خۆمانمان کردە میراتی ئەو بەندانەی کە هەڵمان بژاردوون (بۆ لێتێگەیشـتن و جێبەجێکردنی بە ڕاست ودروستی)، جا هەیانە ســـتەمکارە بەرانبەر بەخۆی، وە هەیانە میانجییە (واتە نە بەجێ ماوەو نە زۆریش پێشکەوتووە)، وە هەشیانە لە چاکەکان دا پێشکەوتۆتەوە بە ویستی خوا و یارمەتی و مۆڵەتی، وە ئەوە بەخششێکی گەورەی خوایە.

دیارە فەرمایشتی خوا(سبحانە وتعالی): ﴿ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ﴾ لـێی دەفامرێتەوە کە هەر کام لەو سێ کۆمەڵە کە خوا کتێبی خۆی کردۆتە میراتیان، ئەهلی ئیمانن چونکە بێجگە لە ئەهلی ئیمان هیچ کەس شایستەی ئەوە نیە کە بە هەڵبژاردەی خوا ناوببـرێ.

وشەی (ظالم لنفسە)یش مەبەست پێی ئینسانی مسوڵمانی گوناهکارە، واتە خاوەنی گوناهە زلەکان. چونکە گوناهکردنی ئینسان زوڵمێکە کە لە خۆی دەیکات.

مەبەستیش لە(مقتصد)ئەو جۆرە مسوڵمانەیە کە لە نێوان گوناهکاریی و زۆر چاکەکاریی دایە و، نە هێندە ئیمانەکەی بەهێز و کامڵە کە بیگەیەنێتە لوتکەی دینداریی و پارێزکاریی و نە هێنـدەش کز و بێ هێزە کە نەتوانی لە گوناهە گەورەکان دەربازی بکات و حاڵەتێکی میانجیی (وسط)ی هەیە .

بەڵام (سابق بالخـيرات) ئەوە بابایەکە کە ئیمانەکەی هێندەی بە گوڕو تین کردوە لە مەیدانی دیندایی و چاکەکاریی دا کە هەردەم لە ڕیزی پێشەوەیە و سەرقافڵە و پێشڕەوە.

هەروەها دەتوانین مەسەلەی دڵنیایی (یقیـن)یش کە خوای زانـــا و توانا (سبحانه وتعالى) کردوویەتە سێ جۆر بکەینە بەڵگەیەکـــــی دیکە لەسەر دابەش بوونی ئیمان بۆ ئەو سێ پلە و جۆرەی کە خستمانە ڕوو. چونکە:

لە لایەکەوە خوای کاربەجێ هەبوونی دڵنیایـــــی (یقین) لە ئیمان دا بە گشتی بە مەرج گرتوە و ڕایگەیاندوە کە تەنها کەسانێك بە ئیماندار دادەنرێن کە لە ئیمانەکەیان دا گەیشتبنە یەقین و هیچ جۆرە گومان و دوو دڵییەکیان نەمابێ، وەك فەرموویەتی:

﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمْ الصَّادِقُونَ ﴾[115] .

واتە: بێگومان بڕواداران تەنها ئەو کەســـــانەن کە ئیمانیان بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە و ئینجا هیچ دوو دڵییان نیە، بە سامان و گیانیان لە ڕێی خوادا جیهاد دەکەن ئا ئەوانەن ڕاستان..

(115) الحجرات (15) .

کەواتە: هەر کەسێك لە بواری بە ڕاست زانین (تصدیق) دا ئیمانەکەی یەقینی نەبێ و دوور نەبێ لە هەر جۆرە گومـــــان و لەرەلەرێك بە ئیماندار دانانرێ. مادام وابێ دڵنیایی (یقین) مەرجێکی پێویستە بۆ هەر کام لە سێ جۆر و پلەکانی ئیمان کە باسمان کردن.

بەڵام هەر کام لە سێ جۆرو پلەکانی ئیمان یەکێك لە سێ جۆر و پلەکانی یەقینیان شایستەیە کە هاوکوفیەتی. سێ جۆرە پلەکانی یەقینیش وەك لە قورئانیدا هاتوون ئەمانەن:

1- علم الیقین ﴿ كَلاَّ لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ الْيَقِينِ ﴾ (التكاثر-5) .

2- عین الیقین ﴿ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ الْيَقِينِ ﴾ (التكاثر- 7) .

3- حق الیقین ﴿ وَإِنَّهُ لَحَقُّ الْيَقِينِ ﴾ (الحاقة - 95) .

بۆ ڕوون کردنەوەی چەمك و واتای ئەو سێ جۆرە یەقین ودڵنیا بوونەش ئەم وێنەیە دێنینەوە:

یەکێك دێ هەواڵێکمان بۆ دێنێ کە لە شـــاری "هەولێر" فلان کارەساتە قەوماوە. جا ئەگەر بابای هەواڵدەر (مُخْبـــر) جێی متمانە بێ و باوەڕ (ثقة)ی تەواومان پێی هەبێ. ئەوە تەنها بە گوێ بیست بوونی قسەکانی دڵنیایی مان لە بارەی ڕوودانی کارەســـاتی ناوبــــراوەوە بۆ پەیـــــدا دەبێ. وە ئـــەو جـــــۆرە دڵنیایی یەمان پێی دەگوترێ: (علـم الیقین) چونکە زانیارییەکمـــــان چنگ کەوتوە کە تێیدا گەیشتووینە دڵنیایی. ئەمە جۆر و پلەی یەکەمی یەقین.

ئینجا هەر کات خۆمان چووینە (هەولێـــــر) و کارەســـــاتەکەمان یان شوێنەوارەکەیمان بینی ئەوە جۆر و پلەی دووەمی دڵنیایی مان وەدەست هێناوە کە بریتی یە لە (عین الیقین) کە بێگومان ئەمیان لە هی پێشوو بەهێزترە.

پاشان هەر کات لە (هەولێر) بە کردار بە شوێنی کارەساتەکەدا گەڕاین و دەستمان لە شوێنەوارەکان (اثار) ی دا ئەوە یەقینەکەمان پلەیەکی دیکەش بەرزتر بۆتەوە و گەیشتۆتە ئەوپەڕی کە (حق الیقین) ە.

شایانی باسیشـــە کە زانین و دەرك کـردنی ئەو ڕاستییەی خستمانە ڕوو لە بارەی ئیمانەوە - کە ســێ پلەیەو سێ جۆرە - یارمەتیمان دەدات بۆ ڕاست لێتێگەیشتنی گەلێك ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بۆ نموونە:

أ- خوای پەروەردگار (سبحانە وتعالـی) فەرمووبەتی:

﴿ وَأَنْتُمُ الأَعْلَوْنَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾ (ال عمران -139)، واتە: وە ئێوە زاڵ و سەرکەوتوو دەبن بەسەر دوژمـنانتان دا ئەگەر بڕوادار بن.

چونکە بێگومان لێرەدا مەبەست لە ئیمان ئیمانی پێویستە و ئیمانی موتڵەق و کامڵە. کەواتە کاتێك دەبینین ئەم گفت و بەڵێنەی خوای ڕاستبێژ (سبحانەوتعالی)بۆ کەسانێکی ئیمان نە کامڵ نایەتە دی با بزانین هۆکارەکەی چی یە !!

ب- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووبەتی:

((لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن..)) رواه البخاري، واتە: بابای زیناکەر کاتێك زینـا دەکات ئیمـــاندار نیە، کە بێگومان مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەفـی کردنی ئیمان لە بابای زیناکاری مسوڵمان لە کاتی زینا کردنەکەی دا. نەفـی کردنی ئیمانی پێویست یان ئیمانی پەسند و کامڵە نەك ئەسڵی ئیمان و موتڵەقی ئیمان، چونکە بێگومان قەتڵ لە زینا گەورەترە دەجا دەبینین خوای بە بەزەیی (سبحانە وتعالـی) نەفـی ئیمانی لە مسوڵمانان نەکردوە تەنانەت بەهۆی قەتڵیشەوە وەك فەرمووبەتی:

﴿ وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا....﴾ (الحجرات -9)، واتە: ئەگەر هاتوو دوو تاقم لە بڕواداران کوشتاریان لە یەکتر کرد..

ج- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

(( **ما من احد يشهد ان لا اله الا الله وان محمدا رسول الله صِدْقاً من قلبه الاّ حرَّمَه الله على النار**)) رواه البخاري و مسلم و الترمذي عن معاذ بن جبل ﷺ .

واتە: هەر کەسێك بە ڕاستیی لە دڵ و دەروونیەوە شـــایەدیی بدات کە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، وە کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ئەوە حەتمەن خوا لە ئاگری دۆزەخ قەدەغەی دەکات.

دیارە لێرەش دا مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو جۆرە مسوڵمانانەی کە بەهۆی بە ڕاستیی و لە دڵەوە گوتنی (لا اله الا الله) لە ئاگری دۆزەخ قەدەغە دەکرێ. ئەو ئیماندارەیە کە ئیمانەکەی لە گوناهە زلەکان یان لە وردو درشتی گوناح و سەرپێچیان دەیگێڕێتەوە و ناهێڵێ بە چڵکی گوناهان پیس و چڵکن بێت و بۆ پاکبوونەوەی پێویستی بە ئاگری دۆزەخ بێت!

**(خـاڵی چـوارەم) : هۆکارەکانی زیاد کردن و کەم کردنی ئیمان:-**

پێشتر خستمانە ڕوو کە سەرجەم زانا و پێشـــوایانی ڕاستەقینەی ئیسلام - ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لـێ بێ و خوا بە کەرەم و لوتفی بێ سنوری خۆی بە چاکترین شێوە پاداشتیان بداتەوە - لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە:

ئیمان بە فەرمانبەریی زیاد دەکات و بە گوناهـو سەرپێچی کەم دەکات:

(الايمان يزيـد بالطاعة و ينقص بالمعصـية) .

هەروەها تۆزێك لەمەوبەر باسی ئەوەشمان کرد کە ئەو تاعەتە - کە دەبێتە مایەی گەشـــە کردن وفراژوو بوونی ئیمان و زیاد کردنی - هەر شتێك و دوو شت نیە وەك نوێژوزەکات، بەڵکو هەر چوار پێکهێنەری ئیمان دەگرێتەوە:

هەم بە ڕاســـت زانینـــی عەقڵ ودڵ و هەم کردەوەکانـــی دڵ و هەم دان پێداهێنانـــی زمان و ســـەرجەم چالاکیـــەکانی دیکـــەی و هەم کـــردەوەی ئەندامەکانیش.

هەروەها ســـەرپێچی (معصیة)یش بە هەمان شـێوە هەر چوار بوارەکانی دەگرێتەوە.

کەواتە دەبێ بڵێـــین:

هۆکارەکانی زیاد کردن و گەشە کردنی ئیمان و کز بوون و لاواز بوونیشی دابەش دەبن بەسەر هەر چوار پێکهێنەرەکانی ئینسان دا:

عەقڵ و دڵ و زمان و جەستە.

جا ئێستا با بە کورتی تیشك بخەینە سەر چۆنیەتی زیاد کردن و گەشە کردنی ئیمان لە هەر چوار بوارەکانی کیان و بوون (وجود)ی مرۆڤ دا کە هەر کامێکیان یەکێك یان زیاتر لە پێکهێنەرەکانی ئیمانیان پێوە پەیوەستە:

1- هۆکارەکانی گەشەکردنی ئیمان لە بواری بە ڕاست زانین (تصدیق)دا کە پەیوەندیی بە هەر کام لە عەقڵ و دڵەوە هەیە:-

یەکەم: بەر لە هەر شتێك بە سەرنج دان و تێوە ڕامانی دروستکراوەکانی خوا (سبحانه وتعالـی) لە هـــەردووك بازنەی خۆ (نفس) و دەورووبەر و ئاسۆیەکان (الآفاق) دا بەهێز و پێز دەبێ و گەشە دەکات، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾ (فصلت -53) .

واتە: لەمەودوا نیشانەکانی خۆمانیان پیشان دەدەین لە ئاسۆیەکان دا و لە خودی خۆشیان دا تاکو بۆیان دەربکەوێ کە خوا (سبحانە وتعالی) (یان قورئان وئیسلام) هەق و ڕاستە. ئایا بەس نیە کە پەروەردگارت چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوە؟!

کەواتە لە ئەنجامی زۆر سەرنجدانی بوونەوەر و نەفسی خۆت دا، وە لە ئەنجامی دۆزینەوەی یاساکان (سنن)ی خوا (سبحانە وتعالی) لە نەفس و کۆمەڵگا و دەوروبەر و بوونەوەردا، ئینسان ئیمانی زیاد دەکات، بە پێچەوانەی بانگەشە و خەیاڵی بەتاڵی ئەوانەی کە پێیان وایە ئەگەر زانست بەرەو پێش بچێت ئیمان دەلەقێت!! نەخێر بەڵکو پێکهێنەری سەرەکی ئیمان بریتی یە لە زانیاری (علم)، زانیاری بە پەروەردگاریتی خوا، زانیاری بە سیفاتەکانی خوا، بە دروست کراوەکانی خوا، بە یاساکانی خوا وە زانیاری بە کاروبارەکان (شؤنات)ی، زانیاری دەربارەی کتێبی بینراوی خوا (کتاب الله المنظور) و کتێبی خوێنراوی خوا (کتاب الله المقرؤ)، چونکە ئینسان هەتا زیاتر سەرنج لەو دوو کتێبانەی خوای پەروەردگار بدات و تێیان دا شارەزاتر بێت و وردتر بێتەوە - کە ئەوە زانیارییە - چاکتر شوێن دەستی خوا دەبینێت و زیاتر ناوە چاکەکان و سیفەتە بەرزەکانی خوای باڵا دەستی بۆ دەدرەوشێتەوە.

دووەم:- سەرنج دان و لێورد بوونەوەی مێژوو و شوێنەوار و بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وە شوێن کەوتوانیان وە نەیار و

ناحەزانیان و سەرەنجامی شوومیان ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ ﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الأَرْضِ ثُمَّ انظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴾(116)

واتە: بڵێ بە زەوی دا بڕۆن وسەرنج بدەن داخۆ سەرەنجامی ئەوانە کە دینی خوایان بە درۆ دەزانی و پێغەمبەرانی خوایان بە درۆ دەزانی چۆن بووە!

سێیەم: هۆکارێکی دیکەی بەهێز لە بواری (تصدیق)دا بریتی یە لە: سەرگەرم بوونی عەقڵ وهۆش بە چاکترو زیاتر شارەزا بوون و تێگەیشتن لە فەرمایشتی خوا کە قورئانە ،وە شارەزا بوون بە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ، وە زیاتر شارەزا بوون بە پەرێزو بەرهەم و شوێنەواری دینی خوا لە ناو خەڵك و میللەتان لە مێژوودا ، بۆ نموونە تۆ سەیر بکە (عەرەب) چۆن بوون و چی بوون و دوایی بوون بەچی؟ لە (سیرة) ی (ابن هشام)دا هاتووە: عەرەبێك دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئێمە عادەتمان وا بوو بۆ هەر شوێنێك دەچووین (بت)ێکمان لەگەڵ خۆمان دا دەبرد بۆ پەرستن، وە لە شوێنێك دا کە (بت)مان پێ نەبایە و بەردێکی باش و جوانیشمان دەست نەکەوتبایە بۆ پەرستن وعیبادەت بۆ کردنی، ئەگەر خورمامان پێ بووایە لە خورما بتێکمان دروست دەکرد و کڕنووشمان بۆ دەبرد ولێی دەپاڕاینەوە، پاشان کە برسیمان دەبوو دەمان خوارد ، بەڵێ عەرەب بەو شێوەیە بوون، بەڵام خوای پەروەردگار بەهۆی ئەم (دین)ەوە بەرزی کردەوە وکردنی بەچی؟! بەڵێ ئەگەر ئینسان سەرنجی

(116) الأنعام (11) .

عەرەبان بدات کە لە چی یەوە بوون بە شتێکی تر، دەزانێ کە ئەو دینەی خوا حەقە.

جا خوای پەروەردگار لەو بارەوە کە لێتێگەیشتنی قورئان هۆکارە بۆ زیاد بوونی ئیمان دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ ﴾(117)

واتە: وە ئێمە قورئانمان بۆ تێگەیشتن ئاسان کردوە: ئایا کێ هەیە بێ لێی تێ بگات!

یانی: وەرن لە قورئان حاڵی بن و تێی بگەن تاکو خاوەنەکەی باشتر بناسن.

وە لەو بارەوە کە لێتێگەیشتنی سوننەت هۆکارە بۆ گەشە کردنی ئیمان فەرموویەتی: ﴿ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ (سورة النحل-44) واتە: وە قورئانمان بۆ لات ناردۆتە خوارێ تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی هاتۆتە خوار بۆیان ڕوون بکەیەوە و بەڵکو خۆشیان بیر بکەنەوە.

بەڵێ لە سۆنگەی ئەوەوە کە سوننەت ڕوون کەرەوەی قورئانە، هەتا زیاتر لە سوننەت دا شارەزا بی دیارە چاکتر لە قورئان تێدەگەی و، کە چاکتریش لە قورئان تێگەیشتی باشتر خاوەنەکەی دەناسی و سەرەنجام ئیمانت گەشە دەکات و بەرەو کامڵ بوون دەچی.

ئەوە دەربارەی پێکهێنەری یەکەمی ئیمان کە (تصدیق)ە و پەیوەندی بە هەر کام لە دڵ و عەقڵ و هۆشەوە هەیە و، هەتا دڵ و دەروون و عەقڵ و هۆشت زیاتر لە تێفکرین و سەرنج دانی دروستکراوەکانی خوا (سبحانە و

(117) القمر (16).

تعالـى)و لە فەرمایشتەکانی خواو لە پەرێزو بەرهەمی فەرمایشتەکانی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ دا بەکاربێنێ، ئەوە ئیمانت زیاتر و چاکتر گەشە دەکات و قووڵتر و کامڵتر دەبێ.

2- گەشـــەکردنی پێکهێنـــەری دووەمی ئیمان: کە کردەوەکانی دڵە، وەك خۆشویستنی خوا (سبحانه وتعالى)، ئیخصلاص بۆ خوا، قبووڵ کردن و پەسندکردنی بەرنامەو دینی خوا، خۆشویستنی پێغەمبەری خوا ﷺ و....

جا ئایا چۆن و بەچـــی کردەوەکـــانی دڵ بەهێز دەبن و دڵ بەچی زیاتر ڕۆشن دەبێتەوەو سەرەنجام ئەو پێکهێنەری دووەمی ئیمان گەشە کردووتر و کامڵتر دەبێ؟!

لە ڕاستی دا سەر دەبێ هۆشی تێدا بێ، هۆشێك کە خوای پێ بناسێ، دڵیش دەبێ جۆش[118] و خرۆش ومەحەببەتی بەرانبەر بە خوا(سبحانه و تعالى) و پێغەمبەری خوا ﷺ و بەوەی کە خواو پێغەمبەری خوا خۆشیان دەوێ تێدا بێ.

جا ئایا جۆش وخرۆشی دڵ ودەروون بەرانبەر بە خوا (سبحانەو تعالى)و پێغەمبەرەکەی ﷺ چۆن و بەچی زیاد دەبێت؟! هەر بە کورتی دەڵێین: بە دوو شتان: یەکەم: پاك کردنەوەی دڵ و دەروون لە خشپ و خاڵ و لیتە و لاڵی (کفر)و(شرك)و(نفاق)و(رذائل)،کە مەبەستم لە (کفر،شرك، نفاق) هەموو جۆرەکانیانە چ گەورە چ کچکە. وە مەبەســـتیشم لە (رذائل) کە

---

(118) مەحوی شاعیر گوتویەتی : سـەر کە جۆشـێکی نەبێ دڕکە تاڵم بۆ چی یە ؟!
دڵ کە هۆشـێکی نەبێ شـووشەی بەتاڵم بۆ چی یە ؟!
بەڵام بێگومان سەر (هۆش)ی هەیە و دڵیش (جۆش) نەك بە پێچەوانەوەوە !

کویَ (رذائل) کە کۆی (رذیلة)یە تێکڕای خەسڵەتە نزم وپەستەکانە وەك: (کبر و حسـد و بخل و جبن و رباء و عجب و بغض و غیبة و کذب و تملق و بذاءة .... هتند) کە هەموویان خەسڵەتی پیس و بەد وسیفەتی ناپەسندن و دڵ و دەروونی ئینسان پیس و نەخۆش دەکەن، وە دڵ و دەروونی نەخۆش و پیسیش ئیمانی تێدا دامەزراو مەحکەم نابێت.

دووەم: ڕازاندنەوەی دڵ ودەروون بە خەسڵەت وسیفەتە بەرزەکان: بە خوا بە یەکگرتن (توحید)ی تەواو، بە مەحەببەتی زۆر بۆ پێغەمبەر ﷺ و بۆ ئیسلام و مسوڵمانان، وە بە پێچەوانەشەوە ڕازاندنەوەی دڵ بە دوژمنایەتی کردن و ڕق لـێ بوونەوەی شەیتان و پێڕی شەیتان و دوژمنانی خواو، بیرو کردەوە نا شەرعی یەکان (المنکرات)، زۆر جار هەندێك لە مسوڵمانان لێرەدا بە هەڵە چوون و دەچـــــــــن، پێیان وایە کە دەبێ تۆ خواو پێغەمبەرەکەیت خۆش بوێن وە ئیسلامت خۆش بوێ، بەڵام قەینا کات ئەگەر شەیتان وتاغوت ودیکتاتۆرەکان نە بوغزێنی وشیرك وکوفرو نیفاق نەبوغزێنی و ڕژێمە تاغوتی یەکان نەبوغزێنی!، بەڵام نەخێر وا نیە، دڵ تەنیا بەوەندە ئیصلاح نابێ کە دۆستایەتی خوای پێ بکەی، بەڵکو دەبێ دوژمنایەتـی دوژمنانـی خواشـی پێ بکەی، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**من احب لله وأبغض لله وأعطى لله ومنع لله فقد استكمل الايمان**)) **رواه ابو داود.**

بەڵێ تەنها کاتێك دڵت ساغ و ســــەلیم و دوور لە نەخۆشی دەبێ کە لەبەر خوا (سبحانه وتعالـى) خەڵکی باشت پێ خۆش بوێ و لەبەر خواش خەڵکی خراپی پێ ببوغزێنی، وە لەبەر خوا (سبحانه وتعالـى)

دۆستایەتی ئیمانداران بکەی ولەبەر خواش دوژمنایەتی (کافر ومشرك و منافق)ەکان بکەی.

جا لەسەر ئەو شتانەی کە باسم کردن چەندەها دەق هەن، ئەوەتا خوای پەروەردگار دەفەرموێ ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَنْ تَزَكَّى ﴾[119] واتە: بە ڕاستی سەرفرازە ئەو کەسەی کە خۆی پاك و چاك کردوە چونکە وشەی (تزكیة) هەم مانای پاك کردنەوە دەگەیەنێ و هەم مانای چاك کردن و ڕازاندنەوەش، چونکە وشەی (زكاة) لە زمانی عەرەبی دا هەم بە مانای پاك بوونەوە دێت هەم بە مانای گەشە کردن کەواتە (قَدْ أَفْلَحَ مَنْ تَزَكَّى) یانی: بە ڕاستی سەرفرازە ئەو کەسەی خۆی خاوێن کردۆتەوە و بژار کردوە لە سیفەتی نزم و خراپ، وە خۆی ڕازاندۆتەوە بە سیفەتی پەسند و چاك هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَاهَا ﴾[120] کە بە هەمان مانا ومەبەست دێ. وە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: ((**اللهم إني اعوذ بك من الهم والحزن والعجز و الكسل والبخل والجبن وضَلَع الدَّين وغلبة الرجال**))[121]پەنای بردۆتە بە (خوا لە 1و 2: لە (هَمّ)و (حَزَن) (هَمّ) بریتی یە لە دڵتەنگیی و خەفەتباریی بۆ شتی داهاتوو. (حزن)یش خەم و پەژارەیە لەسەر شتی تێپەڕیوو ڕابردوو، دیارە هەردووکیشیان دوو جۆرە دەرد و نەخۆشی خراپن، 3و 4: لە : (عجز) و (كسل)، (عجز) (نەتوانین) ئەوەیە کە لە ئەصڵدا نەتوانی (كسل) (تەنبەڵیی) ئەوەیە کە بتوانی بەڵام خۆت تەنبەڵی وتەوەزەلیی بکەی،5, 6: لە: (بخل) و (جبن)،

---

(119) الاعلى (14) .

(120) الشمس (9) .

(121) رواه البخاري ومسلم .

(بخل) ڕژدیی و چروکی یە و(جبن) ترسنۆکی یە، بۆیەش پێکـــەوەی باس کردوون چونکە نە بەخشینیش جۆرێکە لە ترسان دەترسی کە لێت ببڕێ، وە ترسنۆکیش جۆرێکە لە (بخل)، ترسنۆکی لە جەنگ دا جۆرێکە لە ڕژدیی کە دڵت نایە ڕووحەکەت فیدای دینی خوا بکەی، 7، 8: لە: (ضلع الدَّين و غلبـــة الرجال) (ضلع الدين) قـــەرزی قورس و زەحمەتە و (غلبة الرجال) یش زاڵبوون و منەت کردنی خەڵکییـــــە، جا ئەوانە هەموویان پەیوەندی یان بە دڵ و دەروونەوە هـــەیە و دڵ و دەروونی ئینسان نەخۆش و ناڕەحەت دەکەن، بۆیە پێغەمبەری خوا(سبحانه وتعالى) پەنای لـــێ بە خوا گرتوون، تاکو دەروونی سەلامەت و پارێزراو بێ.

وە خوای کاربەجێ (سبحانه وتعالـى) لەو بارەوە کە دەبێ ئیمانداران ئیبلیس وتاقم و دارو دەستەکەی لە ئەهلی کوفرو شرك ونیفاق ببوغزێنن و دژایەتیی یان بکەن و بە هیچ جۆرێك دۆستایی تییان لەگـــــەڵدا نەکەن فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ﴾(122) واتە: دڵنیا بن شەیتان دوژمنی ئێوەیە وە ئێوەش دوژمنایەتی بکەن ، وە فەرموویەتی: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ ﴾(123) واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! دوژمنی من و دوژمنی خۆتان بە دۆست مەگرن. هەروەها فەرموویەتـــــی: ﴿ يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدْ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ ﴾ (التوبة -73). واتە: ئەی پێغەمبـــەر ! لە دژی کافر و دەغەڵەکان تێبکۆشـــە و لە بەرانبەریان دا زبر و توند بە..

---

(122) فاطر(6) .

(123) الممتحنة (1) .

پێغەمبەری خواش ﷺ دەربارەی پێکەوە سینە ساف بوونی مسوڵمانان و یەکتر خۆشویستن و بەزەیی و پەرۆش هەبوونیان بەرانبەر بە یەکدی فەرموویەتی: ((**مثل المؤمنين في توادهم و تعاطفهم و تراحمهم كجسد واحد اذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمّى**))[124] واتە: ئیمانداران لە یەکتر خۆشویستن و سۆز و پەرۆش بوون بۆ یەکتر و بەزەیی بە یەکتردا هاتنەوەیان دا وەك یەك جەستە وان، ئەگەر ئەندامێکی ئازارێك ڕووی تێ بکات هەموو ئەندامەکان شەونخوونی لەگەڵ دا دەکێشن و تا و نەخۆشی لەگەڵ دەگرن.

خوای پەنهانبینیش (سبحانه وتعالى) لە بارەی دڵپاکی ئەهلی ئیمان بەرانبەر بە یەکدی و نەبوونی کینە وبوغز وغەرەز بەرانبەر بە یەکتر فەرموویەتی:

﴿ وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالإِيمَانِ وَلاَ تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلاًّ لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴾ (الحشر -10) .

3- گەشەکردن و زیادکردنی پێکهێنەری سێیەمی ئیمان کە پەیوەندی بە زمانەوە هەیە بریتی یە لە سەر گەرم کردن و هەمیشە تەڕ و پاراو بوونی زمان بە یادی خوا (سبحانه وتعالى) بە تایبەت وشەی بەرز و پیرۆزی خوا بە یەکگرتن (لا اله الا الله) وە وشە بەرز و موبارەکەکانی دیکەی وەك: (سبحان الله، الحمد لله، الله اكبر)، وە قورئان خوێندن کە گەورەترین جۆری (ذكر)ەو سەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ، وە بەکارهێنانی زمان

(124) رواه البخاري و مسلم .

لە دیفاع کردن لە ئیسلام و خەڵك بانگ کردن بۆ دینـــی خوادا، وە لە بەرپەرچ دانەوەی کوفر و شیرك و ئیلحادی دوژمن و ناحەزانی ئیسلام و مسوڵمانان دا، خوای بەخشـــندە لە بارەی زیکـــر کردنەوە بە گشـــتی فەرموویەتی: ﴿ الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ ﴾ (125) واتە: ئەوانـــەی یادی خوا دەکەن بە پێوەو بە دانیشـــتنەوە و لەســـەر تەنیشتیان، وە دەربارەی سەڵاوات لـێ دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا))(126) واتە: خوا و فریشتەکانی سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر دەدەن، دەجا ئەی بڕواداران ئێوەش سەڵات و سەلامی بۆ بنێرن.

وە دەربارەی خەڵك بانگ کردن بۆ لای خوا و ئایینەکەی فەرموویەتی: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ (127) واتە: جا ئایا قسەی کێ لە ئی ئەو کەسە باشترە کە خەڵك بۆ خوا و دینی خوا بانگ دەکات وکردەوەی باش دەکا و دەڵێ من لە مسوڵمانانم!!، کەواتە باشترین قسە کە بیکەی ئەوەیە کە خەڵك بانگ بکەی بۆ لای خوا (سبحانه وتعالى)و ئایین و ڕێبازەکەی وە هەروەها لە بارەی بەرپەرچ دانەوەی قسەو قاڵی ئەهلی (کفر)، خوای پەروەردگار

(125) ال عمران (191) .
(126) الاحزاب (6) .
(127) فصلت (33) .

دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَاأَيُّهَا الْكَافِرُونَ ، لاَ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴾(128) واتە: بڵێ ئەی کافرەکـــــــان ئەوەی ئێوە دەیپەرستن من نایپەرستم .. هەروەها فەرموویەتی: ﴿ قُلْ هُوَ اللّهُ أَحَدٌ ﴾ (129) واتە: بڵێ ئەو خوایەکی تاکە. کەواتە بەکارهێنانی زمان لە سەرجەم ئەو بوارانەدا کە ئاماژەمان بۆیان کرد و گەلێك بواری دیکەش ئەرکێکی شەرعیی یە و جێبەجێ کردنیشی مایەی زیاد بوون و گەشە کردنی ئیمانە چونکە ئیمان بە تاعەت زیاد دەکات و گێڕانی زمانیش لە قسەی خێر و چاکەدا جۆرێکە لە تاعەت و جۆرێکی یەکجار گرنگیشە.

4- هۆکارەکانی زیادبوونی پێکهێنـــــەری چوارەمی ئیمـــان کە بریتی یە لە کردەوەی ئەندامەکان:- چۆنیەتی زیادکردنی ئیمانیش بەهۆی کردەوەکانەوە ئەوەیە کە تۆ ئەندامەکانت سەر گەرم بکەی بە تاعەت و فەرمانبەریی خواوەو لە کاتی نوێژدا نوێژ بکەی ولە کاتی ڕۆژودا ڕۆژوو بگری ولە کاتی جیهاددا جیهاد بکەی، لە کاتی ماڵ بەخشین دا ماڵ ببەخشی، لە کاتی زانیاری (علم) فێربوون دا زانیاری فێر بـی ولە کاتی (زانیاری) فێری خەڵك کردن دا زانیارییان فێر بکەی، وە هەروەها ......... واتە: مسوڵمان دەبێ بە کردەوەو ئەندامەکانی هەمیشە خەریك بێ بەردەوام لە تاعەتی خوادا بێت هەر جۆرە تاعەتە لە کات و شوێنی خۆیدا. ئینجا کەوایکرد ئەوە ئیمانی هەمیشە تەڕو تازە دەبێت و لە نوێبوونەوە و گەشە کردن دا دەبێت، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ

(128) الكافرون (1-2) .
(129) الاخلاص (1) .

**وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا ، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾**(130) واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە پارێز لە خوا بکەن وقسەی ڕاست ورێك بکەن - جا ئەو کاتە خوا - لە گوناهتان دەبووریّ و کردەوەکانتـــان چاك دەکات وە هەر کەسێکیش فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە بێگومان بەسەرفرازیی یەکی مەزن سەرفراز بووە. مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە خوا فەرمووویەتی: ﴿ **وَمَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَ رَسُولَهُ** ﴾ هەر کەسێك فەرمانبەریی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە بەسەر فرازی یەکی مەزن سەرفراز بووە، ئینجا لە سورەتی (المؤمنون)یش دا خوای کاربەجێ (سبحانە وتعالی) سەرفرازیی و بە مراد گەیشتنی تایبەت کردوە بە ئیماندارانەوە: ﴿ **قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ** ﴾ (1-2) کەواتە: دیارە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بەشێکی ئیمانە و مایەی سەرفرازیی ئینسانیشە.

ئینجا پێویستە لە کۆتایی باسی هۆکارەکانی زیادکردنی ئیمان دا ئەو ڕاستییەش بلێین کە: بە بێ خۆپاراستن لە گوناهان ولە قەدەغە کراوەکانی ئیمان زیاد ناکات، تۆ هەرچەند نوێژی زۆر بکەی بەلام دوایی (حەڕام) بخۆی مانای وایە هیچت نەکرد، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی دا باسی ئەو جۆرە کەسانەمان بۆ دەکات و دەفەرموێ: کابرا سەفەرێکی دوورو درێــژ دەکات، ســەر قرژن و ئالــۆزە چلکــن و کولکنە، وە لە خوا دەپاڕێتەوە پەروەردگارم ! پەروەردگارم ! بەلام خواردن وخواردنەوە وبەرگ و

---

(130) الاحزاب (71) .

پۆشاکی حەرامە و جەستەی بە حەرام پەروەردە کراوە ، خوا چۆن وەڵامی بابای وا بداتەوە؟!!

کەواتە بەهۆی خواردنی حەرامەوە تاعەتەکەش بە کەڵك نایەت و قبووڵ نابێ بۆیە دەبێ خۆت لە گوناهەکان و لە شکاندنی قەدەغەکانی خوا بپارێزی جا ئەو جاریش تەوفیقی تاعەتت دەبێ چونکە ئینسان هەتا زیاتر گیرۆدەی گوناهــو سەرپێچی ببێ کەمتریش توفیقی تاعەتی دەبێ یەکێك لە زانایان گوتوویەتی: ڕۆژێك ڕوانینێکی حەرام (نظر)م ئەنجام دا ئەو شەوە مەحرووم بووم لەوەی کە شەونوێژ بکەم، یەکێکی دیکە دەڵێ: ڕۆژێکی قسەیەکی خراپم کرد ئەو زانیارییەی کە بە چەندان ساڵ فێری ببووم هەموویم لە بیر چۆوە، دیارە هەر بۆیەشە کە (شافعي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ گوتوویەتی:

شکوت الــی وکیع سوء حفظي فأرشدني الى ترك المعاصي
واخبــرني بــأن العلـــم نـــور و نور الله لا يُهدى لعاصي

واتە: سـکاڵای چاك شــت بۆ لەبەر نەکرانم لە لای (وکیع) کرد، ئەویش ڕێنمایـــی کردم کە واز لە گوناهان بێنم و هەواڵیشـــی پێ دام کە زانیاری ڕووناکییە و ڕووناکی خواش بە بابای سەرپێچی کەر نادرێ.

دیارە (وکیع) مامۆستای (شافعي) بووە ڕەحمەتی خوایان لێ بێ و کاتێك قوتابی ســـــکاڵای چاك شــت پێ لەبەر نەکرانی لای مامۆســـتا کردوە. مامۆستاکەی ئامۆژگاری کردوە بە دوورە پەرێزی لە گوناهــو سەرپێچی بۆ ئەوەی بەهۆی پەرێز پاکییەوە شایستەی پێ بەخشرانی زانست بێت.

بەڵێ بەبێ خۆپاراستن لە سەرپێچی وگوناهان ئینسان توانای ئەنجام دانی تاعەتی نابێ تاکو ئیمانەکەی بەرەو پێشەوە بەرێت و گەشە بکات.

شایانی باسیشە کە مەبەست لە گوناهو سەرپێچی هەموو جۆر و شێوەکانی گوناهو سەرپێچیە چ پەیوەندییان بە عەقڵ و هۆشەوە هەبێ چ بە دڵ و دەروونەوە. چ بە زمان و زاراوە و چ بە ئەندامەکانەوە.

ئینجا وەك پێشتریش باسم کرد بیدعەتچییەکان (اهل البدع) بڕوایان وایە کە ئیمان کەم وزیاد ناکات جا هەرچی (مرجئة)ن دەڵێن : هەرچەندە گوناهان بکەی زیانی بۆ ئیمان نیە بەڵام (خوارج)دەڵێن: تەنیا یەك سەرپێچی بکەی ئیمانت نامێنێ، کەواتە: بە پێی بۆچوونی ئەمان ئەگەر کابرا گوناهێکی گەورەی کرد ئیمانەکەی هەر نامێنێ، مانای وایە نەك کەمی کردوە بەڵکو هەر نەماوە!!

وە بە پێی ڕەئی (مرجئة)کانیش هەرچەند گوناهان بکەی زیانی بۆ ئیمان نیە، بەڵام (خوارج) دەڵێن: تەنیا یەك سەرپێچی بکەی ئیمانت نامێنێ بۆیە هەردووك لایان دەڵێن، ئیمان کەم و زیاد ناکات .

بەڵام جەماوەری زانا وپێشەوایان دەڵێن:نەخێر، گوناهی گەورە بە مەرجێك گوناحە گەورەکە بۆ خۆی لە خۆی دا (کفر) نەبێت چونکە هەندێك گوناهی گەورە هەیە(کفر)ە، وەك: گوتنی قسەی کوفرو شیرك و، ڕازی نەبوون بە حوکمی خوای پەروەردگار و، حوکم و دادگایی بردن بۆ لای (طاغوت)[131]، ئەوانە کوفرن، بەڵام ئەگەر گوناهە گەورەکە (کفر) نەبێ، ئەوە هەرچەندە ئیمان کەم دەکات و پێی کز دەبێت، بەڵام ئینسان لە بازنەی ئیمان ناباتە دەرێ، بۆیە هەر کەسێك گوناهان واز لێ بێنێ ئیمانی زیاد دەکات، وەك چۆن ئەگەر تاعەت زیاد بکات ئیمانی زیاد دەکات و گەشە دەکات.

---

(131) (الطاغوت) بریتی یە لە هەرکەس ولایەنێك کە ڕەفزی شەریعەت بکات و بە گوێرەی بەرنامەیەکی دیکە کە هەڵقوڵاوی بۆچوون و ئارەزووی خۆی یان غەیری خۆیەتی حوکم بکات.

لە کۆتایی دا دەڵێم: زانایان باسی گوناحی گەورە و بچووکیان کردوە، جا یەکێك بۆی هەیە بلێ باشە گوناحی گەورە وگچکـە جیاوازیـــی و سـنووریان چی یە و چۆن لە یەکیان جیا بکەینەوە؟!

لە ڕاستی دا زانایان لە کتێبەکانیان دا زۆریان باسی ئەم مەسەلەیە کردوە، هەندێکیان گوتوویانە: گوناحە گەورەکان حەوتن، هەندێکی دیکەیان گوتوویانە: حەڤدەن، ژمارەیەکی زۆریشیان گوتوویانە: حەفتان، هەشیانە ڕای وایە حەوسەد (700)ن!!

بەڵام بە ڕای بەندە باشـتـرین پێناسە کە من بینیبم و زۆربەی زانایانیش ڕایان وایە و لە سـەری پێك هاتوون - دیارە هەر کات پێناسـەی گوناحە گەورەکانیشمان کرد مانای وایە غەیـری ئەو گوناحــە گەورانــە ئەوانی دی گوناحی بچووکن - جا باشترین پێناسە ئەوەیە کە (الماوردي)[132] هێناویەتی و گوتوویەتی: (الكبيرة ما وجبت فيه الحدود في الدنيا و توجَّه اليها الوعيد فـي القيامة) واتە: گوناهی گەورە ئەوەیە کە لە دونیادا سزای لەسەر پێویست بێ وە لە دوا ڕۆژدا هەڕەشە لە خاوەنەکەی کرابێت.

جۆری یەکەم: کە سزای دنیایی لەسەرە وەك: قەتڵ، زینا، دزیی، مەی خۆریی، بوختان کردن بە داوێن پیسی، ڕێگریی، ئەوانە هەموویان سزایان لەسەر پێویست بووە، جۆری دووەمیش :کە لە قیامەت بکەرەکانی هەڕەشەیان لـێ کرا بێ، وەك: گومانی خراپ بە خەڵك بردن، حەسەد، بوغز، جنێو بە

(132) (ماوردي) زانایەکی شافعی بووە لە (فروع)دا ،(فتح الباري) لە بەرگی دەیەم لاپەڕە (410)دا لـێ یەوە نەقڵ کردوە، وە (احمد) و (قرطبي) (ابن تيمية) و (ذهبي) و زۆرێکی دیکە لە زانـایـان ئەم پێناسـەیەیـان پەسند کردوە.

خەڵك دان، قسە هێنان وبردن و غەیبەت و ... هتد كە هەموویان هەڕەشەی قیامەتی ئاڕاستەی خاوەنەكانیان كراوە بەڵام سزای دونیایی یان لەسەر نیە.

جا بە ڕاستی ئەم پێناسەیە پێناسەیەكی زۆر تێرو تەواوە و هەر گوناحێك سزایەكی دونیایی لەسەر بێ یان هەڕەشەیەكی قیامەتی، لە دەقێكی قورئان دا یان لە فەرموودەیەكی ڕاست (صحیح)[133]ی پێغەمبەر ﷺ دا ئەوە گوناحی گەورەیە، غەیری ئەوە بە گوناحی بچووك لە قەڵەم دەدرێ.

لێرەش دا دێینە كۆتایی ئەم دەرسی چوارەمە.

سبحانك اللهم وبحمدك اشهد الا اله الا انت

استغفرك واتوب اليك.



(133) واتە فەرموودەیەك كە لە ڕێیەكی ڕاست و بێ گرێ وگۆڵەوە پاڵدرابێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و دڵنیا بین كە هی ئەوە و بە زاریەوە هەڵنەبەستراوە، ئەگەر نا هەرچی ئەو فەرموویێ بێگومان هەر ڕاست و تەواوە .

# دەرسی پێنجەم:

# شایەتمان
# دەروازەی هاتنە نێو ئیمان و
# ئیسلام و کلیلی دەرگای بەهەشتە،
# چۆن و بۆچی؟!.





الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله وصحبه ومن اهتدى بهداه.

بەڕێزان!

وشەی (شایەتمان)کە لە هەندێك ناوچە پێی دەگوترێ (شـــادە هێنان)، تەرجەمەی وشە عەرەبی یەکەیە کە بریتی یە لە (كلمة الشهادة) واتە: وشەی شایەدیی دان، کە مەبەست پێی هەردووك ڕستەی (أشهد ان لا اله الا الله، و اشـــهد ان محمـداً رسول الله)یە چونکە هەردووکیـــان وشەی (اشـــهد)یان لە سەرەتاوەیە، وشەی (اشهد)ش واتە: شایەدیی دەدەم، شایەدی دانیش ئەوەیە کە تۆ ئاگات لە شتێك بێ ئینجا داوات لێ بکەن یان هەر بۆ خۆت بچی بڵێی: بۆ ئاگاداریتان من ئاگام لە فلان شتە هەیە ئاوا و ئاوا بووە.

بۆیەش لە وشەی بەرز و پیرۆزی شایەتمان دا وشەی (اشهد) بەکاردێ کە (اسم الفاعل) ەکەی (شاهد)ە، چونکە دەبێ کەسێك شایەدیی بدات و هەواڵ لە ڕووداوێك بدات کە بینیبێتی، وە (شَهِدَ يَشْهَد شهوداً) یانی: بینی دەبینێ بینین، کەواتە کەسێك مافی ئەوەی هەیە شایەدیی لەسەر شتێك یان ڕووداوێك بدات کە ئەو ڕووداوەی بە چاوی خۆی بینیبێ، ئەگەر نا هەر لە خۆیەوە بڵێ: وایان گوت، ئەوە پێی ناگوترێ شایەدیی دان، بگرە ئەوە نەهی لێ کراوە وەك لە پێغەمبەر ﷺ ەوە هاتوە کە: (گوترا وگوتی) قەدەغەکردوە: (نهى رسول الله ﷺ عن قيل و قال)[134] کەواتە هەر کەسێك لە کاتی شایەدی دان و

(134) رواه البخاري .

هەواڵدانێك دا بەو شێوازە بدوێ و نەقڵی قسە لە ملاولا بكات وخۆی بێ ئاگا بێ. ئەوە هیچ ئیعتبارێكی نیە، بەڵكو دەبێ خۆی ئاگای لـێ بێ ئەوجار بە شاهیید دەشێ.

جا وشەی شایەتمان (الشهادة)یش كە خوا و پێغەمبەر ﷺ بۆ دەربڕینی ئیمان هەڵیان بژاردوە؛ لەبەرئەوەیە كە تەنها كەسێك بە بڕوادار لە قەڵەم دەدرێ: كاتێك كە دەڵێ: شایەدیی دەدەم كە جگە لە خوا پەرستراوێكی دیكە نیە، ئەو گوتنەی و ئەو هەواڵ دانەی بە شێوەیەك بێ كە بە چاوی عەقڵ و دڵ یەكتایی (وحدانیة)ی خواو تەنیا پەرستراوێتی خوای بینیبێت، وە كە دەڵێ: (أشهد ان محمدا رسول الله) بە چاوی عەقڵ و دڵ بینیبێتی كە (محمد) ﷺ ڕەوانە كراوی خوایە (سبحانه وتعالـی) .

كەواتە كەسێك نەگەیشتبێتە (یقین)كاتێك كە دەڵێ: (اشهد ان لا اله الا الله) ئەوە قسەكەش ناڕاستە و پێچەوانەی واقیعە هەروەها كاتێك كە دەڵێ (اشهد ان محمدا رسول الله) بەهەمان شێوە قسەكەی پێچەوانەی واقیعە، واتە: نابێ دوو دڵی مابێ لەوەدا كە شایەدیی لەسەر دەدات كە بریتی یە لە : تەنها پەرستراوێتی خوا (سبحانه وتعالی)و ڕەوانە كراوێتی موحەممەد لە لایەن خواوە، بەڵكو وەك چۆن كە بە چاوی سەر شتێك دەبینێ، بە دڵنیایی یەوە دەڵێ دەیبینم (شـــهدته)، بە هەمان شـێوەش دەبێ بە چـــاوی دڵ و عەقڵیشـــی پەروەردگارێتی خواو پەرســتـراوێتی ببینێ، ئەوجار كە دەڵێ: (اشهد ان لا اله الا الله) قسەكەی ڕاست دەردەچێ و شایەدیی دانەكەی لە جێگەی خۆی دایە، هەروەها كە دەڵێ: (واشهد ان محمدا رسول الله) شایەدیی دانەكەی ڕاست و بەجێ دەبێ.

دیارە ئێمە لە داهاتووش دا لەبەر ڕۆشنایی چەند ئایەت و فەرموودەیەك دا ڕوونی دەكەینەوە كە دەبێ شایەتمان هێنان وگوتنی: (لا اله الا الله محمد رسول الله) بە دڵێكی ڕاست وساغ و بە (یقین)ێكی تەواوەوە بێ و چەندان مەرجی تێدا هاتبنە دی ئەوجار دادی خاوەنەكەی دەدات و لە فریای دێ.

جا ئەوە لە سێ خاڵان دا باسی ئەو بابەتە گرنگە دەكەین:

## خاڵی یەكەم: گەورەیی و بەرزیی وشەی شایەتمان:

بە شایەتمان (اشهد ان لا اله الا الله وان محمدا رسول الله) دەگوترێ: وشەی شایەتمان (كلمة الشهادة) چونكە لە زمانی عارەبی دا وشە (كلمة) بۆ ڕستە (جملة)ش بەكاردێ، بگرە بۆ زیاتر لە ڕستەیەكیش وبۆ وتاریش بەكاردێ بۆ نموونە: ئێستا باوە لە ئاهەنگ و بۆنەكان كە وتاریان تێدا دەدرێن دەگوترێ: ئێستاش با فلانكەس بفەرموێ بۆ پێشكەش كردنی وتەكەی (والان فلیتفضل فلان لتقدیم كلمته).

جا هەرچەندە شایەتمان دوو ڕستەیە: (اشهد ان لا اله الا الله) وە (اشهد ان محمدا رسول الله) بەڵام لە عورفی شەرعزانان دا بە وشەی شایەتمان (كلمة الشهادة) یان دوو شایەتمانەكان (الشهادتین) یان دوو وشەكانی شایەتمان (كلمتي الشهادة) تەعبیری لێ كراوە.

دەربارەی گەورەیی و بەرزیی شایەتمان دەقی قورئان و سوننەت زۆرن كە ئەمانە چەند نموونەیەكیانن:

1- خوای بەرز و مەزن (سبحانه وتعالى) فەرموویەتی:

﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَ

**فَرْعُهَا فِي السَّـــمَاءِ ، تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِيـنٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا وَ يَضْرِبُ اللّهُ الأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾** ( ابراهيم 24– 25) .

واتە: ئایا سەرنجت نەداوە چۆن خوا وێنەیەکی هێناوەتەوە: وشەیەکی پاك و چاك وەك دەرختێکی پاك وچاك وایە، کە بنکەکەی لە (زەوی)دا جێگیرە و لق و پۆپەکەیشـــی بەرەو سەرەوە بەرز بۆتەوە، هەموو کاتێك بە ویســــتی پەروەردگاری میوەکەی دەردەکات. وە خوا وێنان بۆ خەڵکی دێنێتەوە بۆ ئەوەی پەند وەربگرن.

وەك دەبینین خوای کاربەجێ بۆ پێناسە کردنی وشەی شایەتمان کە بە: وشەی پاك و چاك (كلمة طيبة) ناوی هێناوە و ســــەرجەم توێژەرەوانی قورئان گوتــوویانە کە مەبەســـت پێی وشەی شــایەتمانە، وێچواندن (تشبيه)ێکی کردوە لە نێوان ئەو وشە موبارەکە ودرەختێکی ساغ وپاك و چاك دا وە لە کۆتایی وێچواندنەکەش دا فەرموویەتی ﴿ **وَيَضْرِبُ اللّهُ الأَمْثَالَ لِلنَّـــاسِ لَعَلَّهُـمْ يَتَذَكَّرُونَ** ﴾ (ابراهيم – 25) کەواتە دیارە حیکمەتی ئەم وێنە هێنانەوە و وێچواندنە لێرەدا ئەوەیە کە خەڵکی لە مانا و نێوەڕۆك و حەقیقەتی وشەی بەرز و بە پێزی شایەتمان تێ بگەن و پێی ئاشنا بن.

ئینجا شایانی باسیشە کە خوای بە بەزەیی هەر کام لە وشەی شایەتمان و ئەو درەختەی کە پێی شوبهاندوە بە (طيِّبة)وەصف کردووە، بۆیە پێویستە ســەرەتا هەڵوێســتەیەك لە بەرانبەر ئەو وشەیەدا بکەین: وشەی (طيب) کە خوای پەروەردگار لە قورئانیدا گەلێك لەو شتانەی کە جێگای پەسندیی و ڕەزامەندینی پێی وەسف کردوون، وەك ئینسانی ئیماندار و

چاکە کار، سەر زەمینی بە پیت و پێز، خواردن و خواردنەوەی باش و بەسوود، قسەی چاك و شـیرین و بەسوود... وەك لەم ئایەتانەدا دەبینرێ:

1- ﴿ وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ وَالطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ... ﴾ (النور- 26).

2- ﴿ الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمْ الْمَلاَئِكَةُ طَيِّبِينَ.. ﴾ (النحل -32).

3- ﴿ وَالْبَلَدُ الطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُ بِإِذْنِ رَبِّهِ.. ﴾ (الأعراف -58) .

4- ﴿ يُحِلُّ لَهُمْ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمْ الْخَبَائِثَ.. ﴾ (الأعراف -157) .

5- ﴿ وَهُدُوا إِلَى الطَّيِّبِ مِنْ الْقَوْلِ.. ﴾ (الحج -24) .

بە سەرنج دانی ئەو وشەیە لە سـەرجەم ئەو سیاقانەدا کە تێیان دا هاتوە بۆمان دەردەکەوێ ماناکەی بریتی یە لە:(پاك و چاك) ،کەواتە خوای زانا و شـارەزا (سبحانه وتعالى) هەر کام لە وشەی شـایەتمان و ئەو درەختەش کە پێی چواندوە بە پاك وچاك وەسف کردوون، ئاشکراشە کە هیـچ وشەیەك لە وشەی خـوا بە یەکگرتن (كلمـة التوحيـد) پاکتـر و چاکتـر نیە و نابێ، هەروەها درەختێکیش بەو شێوەیە بێ کە خوا وەسفی کردوە وچوار فەسڵەی ساڵ میوە و بەری هەبێ و هەمیشە تەڕ و تازە و بەدەو بێت دیارە درەختێکی پاك و چاکە.

لێرەدا خوای کاربەجێ (سبحانه وتعالـى) سێ شتان لەو درەختە پاك و چاکە باس دەکات:

1- أصـل : بنـك و ڕەگ و ڕیشە.

2- فـرع : قـەد و لق و پۆپ.

3- أكـل: بەر و میوە.

جا (أصل)ەکەی بە چەسـپا و(ثابت) وەسف دەکات چونکـە بە ناخـی زەوی دا چۆتە خوارێ و مەحکەم دامەزراوە.

وە (فرع)ەکەیش بەوە وەسف دەکات کە بەرەو سەریێ هەڵچوە و بەرز بۆتەوە، کەواتە قەد ولق و پۆپەکانی بەرز و چڕ و پڕن وە میوە (أکل) کەیشی بەوە وەسف دەکات کە هەمیشەیی و چوار فەسڵەیە، دیارە ئەم وەسفانەش چاکترین شتن کە درەختیان پێ وەسف بکرێت و هیچ جۆرە درەختێك لە درەختی ئاوا چاکتر نیە و نابێ.

ئینجا مادام خوای زانا وپەنهانبین (سبحانه وتعالى) وشەی شایەتمانی لەگەڵ ئەو جۆرە درەختە پاك و چاکەدا بەراورد (مقارنة) کردوەو پێی چواندوە دیارە شایەتمانیش وەك ئەو درەختە لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتوە و، بەشی یەکەمی بریتیی یە لەو بە ڕاست زانین (تصدیق) و قبووڵ کردن و خۆشویستن و گەردن کەچ کردن و تەسلیم بوون (القبول و الحب والأذعان والتسلیم)ەی کە لە دڵ و دەروون دایە و وەك بنك و ڕەگ و ڕیشەی درەختەکە پەنهان و شێرراوەیە بەڵام بناغەو بنەڕەتیشە، بەشی دووەمیشی بریتی یە لە دان پێداهێنانی زمانو پابەندیی ڕواڵەتیی ئەندامەکان کە وەك قەد ولق و پۆپ و گەڵای درەختەکە بەرچاوو ئاشکرایە و لەسەر بنك و ڕەگ و ڕیشەکەش وەستاوە و لە قەدەر ویشە، بەشی سێیەمی شایەتمانیش لەو سیفەت و ئاکار و ڕەوشت و خووە بەرز و پەسندانەی کە شایەتمان هێنانی ڕاستەقینە و تاعەت وپابەندیی ڕاست و ساغ لە خاوەنەکەی دا بەرهەمیان دێنێ وئەمیش وەك میوەو بەرە بەردەوام و چوار فەسڵییەکەی درەختەکە، هەردەم لە خاوەنەکەی دا دەبینرێ و بۆتە بەشێکی پێکهێنەر و لێ دانەبڕاوی کەسایەتیی ئیماندارانە و خوا بە یەکگرانەی.

2- هەروەها خوا ﷻ فەرمووویەتی:

﴿ مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ وَالَّذِينَ يَمْكُرُونَ السَّيِّئَاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَكْرُ أُولَئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴾ (فاطر -10) . واتە: هەر کەسێك عیززەتی دەوێ ئەوە عیززەت هەمووی هی خوایە، وشەی پاك وچاك بەرەو لای بەرز دەبێتەوە و کردەوەی چاکیش بڵندی دەکات،وە ئەوانەی کە فێڵ وپیلانی خراپ دەگێڕن سزایەکی توندیان هەیە و فێڵ و پیلانی وانیش سەرەنجامی هەر بەزایەچوونە.

لێرەش سەرجەم توێژەرەوانی قورئان یان زۆربەی هەرە زۆریان وشەی (الكلم الطیب)یان بە وشەی خوا بە یەکگرتن (کلمة التوحید) تەفسیر کردوە.

مەبەستی ئایەتەکەش ئەوەیە کە عیززەت و سەربەزیی و قەدر و ڕێز تەنها لە لای خوا چنگ دەکەوێ، ئەویش لە ڕێی وشەی بەرز و بەڕێزی شایەتمانەوە دەبێ ئەو وشەیەی کە شایستەی بەرزبوونەوەیە بۆ لای خوا، بەڵام ئەویش بە بێ‌کرداری چاك و فەرمانبەریی و پابەندیی ناتوانێ بەرز بێتەوە.

کەواتە: تەنها وەسیلە وهۆکاری ڕێز و پایە وەدەست هێنان لە لای خوای پەروەردگار (سبحانە وتعالى) بریتی یە لە لەخۆدا هێنانە دی ئیمان و خوا بە یەکگرتن کە وشەی شایەتمان تەعبیری لێ دەکات، بەڵام هەموو شایەتمان هێنانێك نا، بەڵکو شایەتمان هێنانێك کە ڕەسەن و ڕاستەقینە بێت و خاوەنەکەی وا لێ کردبێ کە ملکەچ و فەرمانبەری خوای بەرز و مەزن بێت.

3- هەروەها زۆربەی توێژەرەوانی قورئانی بە پێز گوتوویانە مەبەست لە: (القول الثابت) لە ئایەتی:

﴿ يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَ يُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ ﴾ (ابراهيم -27) ، دا بریتییە لە وشەی خوا بە یەکگرتن جا دیارە ئەوەش موژدەیەکی گەورەیە بۆ شایەتمان هێنەران و ئەهلی ئیمان و تەوحید کە خوای کاربەجێ بەڵێنیان پێ بدات کە لە ژیانی دنیا و لە دوا ڕۆژیش دا بەهۆی وتەی چەســـپاو (القول الثابت)ی نێو دڵ و دەروونیانەوە ڕاوەستاو دامەزراویان بکات !

4- دیسان سەرجەم توێژەرەوان گوتوویانە کە مەبەست لە (الحُسْنى) لە هەردووک ئایەتی: ﴿ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى ﴾ (الليل -6) واتە: وە چاکترین وشەی بە ڕاست زانی و بڕوای پێکرد. ﴿ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى ﴾ (الليل -9) واتە: وە چاکترین وشەی بەدرۆ زانی و بڕوای پێ نەکرد.

وشەی شایەتمان و خوا بە یەکگرتن (كلمة الشهادة و التوحيد)ە، کە دیارە سیفەتی وەسفکراوێکی لابراو (صفة موصوف محذوف)ە، کە بریتی یە لە (الكلمة) و لە ئەسڵ دا (الكلمة الحسنى)یە، واتە: وشەی هەرە چاک و پەسند و شـیریـن.

5- پێغەمبەری خواش ﷺ لە بارەی گەورەیی و پایەی بەرزی وشەی شایەتمان فەرموویەتی:

(( ان الله حرم على النار من قال لا اله الا الله يبتغي بذلك وجه الله عز وجل )) رواه البخاري و مسلم.

واتە: بێگومان هەر کەسێك لەبەر داوا کردنی ڕەزامەندیی خوای زاڵ و پایە بەرز گوتبێتی (لا اله الا الله) بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین ئەوە خوا لە ئاگری دۆزەخ قەدەغەی کردوە.

6- وە لە فەرموودەیەکی دیکەی دا فەرموویەتی:

(( **اسعد الناس بشفاعتي من قال لا اله الا الله خالصا من قلبه** )) رواه البخاري. واتە: بەختەوەرترین و بەهرەمەندترین کەس بە هۆی شەفاعەتمەوە کەسێکە کە بە ساغیی لە دڵییەوە گوتبێتی: (لا اله الا الله ) .

7- وە هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەی دا هاتووە:

(( **ما من احد يشهد ان لا اله الا الله وان محمدا رسول الله صدْقا من قلبه الاّ حرمه الله على النار** )) رواه البخاري و مسلم.

واتە: هەر کەسێك بە ڕاستیی و لە دڵییەوە شایەدیی بدات کە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، وە کە موحەممەد ڕەوانە کراوی خوایە ئەوە مسۆگەر خوا لە ئاگری قەدەغەی دەکات.

لەم دەقانەی کتێبی خوا (سبحانە وتعالی)و سوننەتی پێغەمبەری پێشەواشمانەوە ﷺ زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە وشەی شایەتمان هەتا بڵێی وشەیەکی بەرز وبەرێز و بەپێزەو مایەی هەموو خێر و خۆشیی و بەختەوەریی و سەربەرزییەکی دنیا ودوا ڕۆژە؛ بەڵام بە مەرجێك وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی بە ڕاست و ساغیی و لە دڵ ودەروونێکی پاك و چاکەوە بگوترێ.

هەر بۆیەش بە پێویستی دەزانم کە لە خاڵی دووەم و سێیەمی ئەم بابەتەدا باسی مانا و نێوەڕۆکی وشەی شایەتمان و پاشان مەرجەکانیشی بکەین:

## خاڵـی دووەم: مانـــا و مەبەســتی شـــایەتمان:-

باوترین صیغەی شایەتمان بریتی یە لە:

(اشهد ان لا اله الا الله وان محمدا رسول الله) .

بەلاٌم لە چەند دەقێکی دیکەی سوننەت دا ئەم صیغەیەش هاتوە:

(اشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له واشهد ان محمدا عبده و رسوله)

ئێستاش با بە کورتی و پوختی مانای شایەتمان بکەین و نێوەڕۆکەکەی شی بکەینەوە:

(اشهد) واتە: شایەدیی دەدەم: یانی بە عەقڵ زانیومە و بە دڵ قبووڵم کردوە و بە زمان دانی پێدادێنم و بە کردەوەش دەیسەلمێنم.

(ان لا اله الا الله) کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوی دیکە نین، یانی پەرستراوی بە هەق ئەگەر نا پەرستراوی ساختە و بە ناهەق زۆرن.

(واشهد ان محمدا رسول الله) واتە: وە شایەدیی دەدەم کە موحەممەد ڕەوانە کراوی خوایە ،یانی (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەلیب) ﷺ خوا (سبحانە وتعالــی) کردوویەتە نوێنەری خۆی بۆ لای بەندەکانی و کتێب و بەرنامە ویەیامی خۆی پێدا ناردوە نەك هەر لە خۆوە بلێ خوا ڕەوانەی کردووم!

وشەی: (وحده لا شريك له)ش کە لە صیغەی دووەمی شایەتمان دا هاتووە.

یانی: تەنهایە و هیچ هاوبەشی نین، جا دیـــــارە ئەم ڕستەیە هەر زێدە تەئکیدێکە بۆ ڕستەی (لا اله الا الله) .

وە ڕستەی (واشهد ان محمدا عبده و رســوله)ش :وە شـــایەدیی دەدەم کە موحەممەد بەندە و نێرراویەتی، هەمان واتای ڕستەی : (واشهد ان محمدا رسول الله)ی هەیە وحیکمەتی جەخت کردنەوەش لەسەر بەندایەتی (عبودیة)ی پێغەمبــەری خوا ﷺ ئەوەیە کە هیـــچ کەس گومـــــــــانی وا نەبێ کە (موحەممەد) ﷺ بە هۆی پێغەمبەرایەتییــەکەیەوە لە بەندایەتی بە سەرەوەتر چووە، چونکە ئینسان هەر کەسێك بێ وهەرچی یەك بێت هەر بەندەی خوایە و بەندایەتی ئینسان بۆ خوا بەرزترین پایە و مەقامیەتی و هەتا بەندەتریش بێ لە لای خوا بەرزتر دەبێ و بەڕێز تر دەبێ، بۆیەش خوای کاربەجێ لە بەرزترین پایە و مەقام دا کە تەنانەت پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) پێی نەگەیشتوون کە بریتی یە لە : شەو ڕۆو بەرز بوونەوە لە کاتێك دا کە مەدح و سەنای پێغەمبەری کۆتایی خۆی (محمد) ﷺ دەکات بە سیفەتی (عبد) وەسفی دەکات وەك فەرموویەتی: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى...﴾ [135] واتە: پاکی بۆ ئەو خوایەی کە (شەو ڕۆ)ی کرد بە بەندە (عبد)ەکەی خۆی لە مزگەوتی حەرامەوە (کە لە مەککەیە) بەرەو مزگەوتی ئەقصا (کە لە قودسە).

ئینجا شایانی باسە و پێویستە بگوترێ کە ئەوە هەڵەیە کە هەندێك لە مامۆستا (مەلا)ی کوردەواری و غەیری کوردەواریش تەفسیر و مانای (لا اله

(135) الاسراء (1) .

الا الله) بەو شێوەیە بۆ خەڵك كردوە و دەكەن كە دەڵێن: (لا اله الا الله) یانی: جگە لە خوا هیچ خوا دیكە نین !

بەڵێ لە ڕاستی دا ئەو جۆرە لێكدانەوەیە ڕاست نیە چونكە (إله) واتە: پەرستراو (معبود)، (لا اله الا الله) واتە: هیچ پەرستراوێك نیە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا، (اله) جیایە لە (ﷲ)،(ﷲ) تەنیا هەر یەكە و هیچ كەسێكیش لەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا بڕیار داوە نەیانگوتوە دوو خوا هەن، بەڵكو هەڵەكەیان ئەوە بووە كە شتێكیان كردوە بە هاوبەش (شریك) بۆ خوا (سبحانه وتعالـی) ، وەك خوای پەروەردگار لە بارەیانەوە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴾[136] واتە: ئەگەر لـێیان بپرسی كێ ئاسمانەكان وزەوی دروست كردوون؟ بە دڵنیاییەوە دەڵێن خوا (ﷲ)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ ﴾[137]، واتە: وە ئەگەر لێیان بپرسی كێ دروستی كردوون؟ بە دڵنیاییەوە دەڵێن خوا، كەواتە چۆن لادەدرێن؟! [138]

وە تەنانەت (نصرانی)یەكانیش كە دەڵێن (إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلاَثَةٍ)[139] هەر دەڵێن یەك خوا هەیە،بەڵام ئەو خوایە كە تەنها خۆی بەدیهێنەر و پەروەردگارە چۆتـــە نێو جەستەی هەر كام لە (عیسی) و (روح القدس) یان (عیسی) و

---

(136) (الزمر –38) .

(137) (الزخرف –87) .

(138) واتە مادام هەر خوا بەدیهێنەر و پەروەردگاریانە كەواتە بۆچی و چۆن چۆنی غەیری وی دەپەرستن و دەیكەنە هاوبەشی خوا لـە پەرستران و بەندایەتی بۆ كران دا !!

(139) (المائـدة –73) .

(مریم)ی دایکییەوە و لاهوت و ناسووت یەکیان گرتوە. بۆیە پێویستە ئەو دووانەش لەگەڵ خوادا بپەرسترێن !

هەروەها (ثنوي)یە مەجووسـییەکان و (یەزیدیی)یەکانیش کە هەردووك لایان بڕوایان بە دوو لایەنی خێر و شەڕ هەیە بەهەمان شێوە دەزانن کە خوای بەدیهێنـەر هەر یەکێکە و هەر ئەویش پێچەوانەکەی خۆی - کە (ئەهریمەن) یان (شەیتان)ە بەڵام یەزیدییەکان (مەلەك تاووس)ی پێ دەڵێن - دروست کردوە !

جا جێی سـەرسـوڕمان ئەوەیە کە یەزیدیـیەکان یاساو و بیانوویان بۆ پەرستنی شەیتان ئەوەیە کە دەڵێن:

خوا بە بەزەیی و چاکەکارە و ئەگەر نەشی پەرستین هیچ زەرەر و زیانمان لێ نادات بەڵام شەیتان (مەلەك تاووس) ئەگەر بێت و نەیپەرستین تۆڵەمان لێ دەستێنێ و زەرێ دەدات !!

دیارە ئەو خوای شەڕ (ئەهریمەن)ەی مەجووسیەکان وئەو مەلەك تاووسەی یەزیدییەکانیش هەر ئیبلیسە پیس و نەگریسەکەیە کە خوای پەروەردگار لە کتێبەکانی خۆی داو لەسەر زمانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بۆی باس کردووین، بەڵام ئەوان لێیان تێکچووە و زلیان کردوە و کردوویانەتە هاوتا و هاوبەشی خوا (سبحانه وتعالـی) .

مەبەسـتیشـم لەم برە ڕوون کردنەوەیە ئەوە بوو کە بزانین پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هیچ کاتێك کێشـە و گرفتیـان لەگەڵ ئۆممەت و گەلەکانیان دا لەسەر ئەوە نەبووە کە خەڵکەکە گوتبێتیان دوو خوا یان زیاتر هەن و پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) بڵێن: نەخێر هەر یەکێکە !

بەڵکو هەردووك لا لەسەر یەکتایی خوای بەدیهێنەر یەکدەنگ بوونە، بەڵام کێشە لەسەر ئەوە بووە کە پێغەمبەرانی خوا فەرموویانە: ﴿ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ﴾ تەنها خوا بپەرستن پەرستراوی دیکەتان نیە ! بەڵام گەلەکانیان گوتوویانە: نەخێر پێویستە وێڕای خوا چەند شتێکی دیکەش بپەرستین وەك مانگ وخۆر و ئەستێرەکان یان بت و صەنەمە دروستکراوەکان، یان تاغووت و سەرکردە سیاسی و ڕووحییەکان، کەواتە: کێشە لەسەر پەرستراوێتی خوا (الوهیة الله) بووە نەك لەسەر بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خوا (خالقیة الله و ربوبیته) !

جا بە ڕاستی ئەوە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە و پێویستە لە بەرچاومان زۆر ڕوون بێت و بزانین کە زۆربەی خەڵك کاتێك دەڵێن (لا اله الا الله) ئەو مەفهووم و مەبەستەیان لێ حاڵی نابێت، کە نابێ هیچ کەس بپەرسترێ جگە لە خوا (ﷻ)، بەڵکو دەڵێن: (لا اله الا الله) یانی: هەر یەك خوا هەیە و هەموومان دەزانین و تەواو !

بەڵام نەخێر وا نیە، بەڵێ خوا فەرموویەتی تەنیا هەر یەك خوا هەیە، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە دەبێ دان بەوەدا بێنی کە هەر ئەو خوایەش شایانی بەندایەتی بۆ کرانە و دەبێ تەنها ئەو بپەرسترێ و تەنها یەك پەرستراو (معبود) هەیە.

ئینجا کاتێك کە تۆ شایەدیی بدەی کە غەیری خوا هیچ کەس و هیچ شتێکی دیکە پەرستراو نیە ئەوە هەر لە سوێند بە غەیری خوا نەخواردنەوە تاکو لە غەیری خوا نەپاڕانەوە و بەرنامە وەرنەگرتن جگە لە خوا لە هیچ کەس و مل کەچ نەکردن بۆ هیچ کەس، وە تاکو هەموو ئەو شتانەی دی کە لە هەرسێك بواری (ایمان) و (شعائر) و (شرائع) دا دێنە پێش دەبێ هەمووی

لە خۆت دا بێنیە دی بۆ ئەوەی قسـەکەت ڕاسـت بێ و شایەتمانەکەت وەربگیرێ.

واتای پەرستنیش هەر بە کورتی دەڵێین: (چونکە دوایی باسی دەکەین) بریتی یە لە: ئەوپەڕی خۆشـەویستی و ئەوپەڕی مل کەچی و ئەوپەڕی بە گەورەگرتن بۆ خوا، هەرسێکی بە یەکەوە، جا کە ئەو سێیانەت بۆ خوا بوون، ئەوە خوات پەرستوە، بەڵام ئەگەر یەکێکیان بۆ کەس و شتێکی دی بوو دیارە ئەو کەس و شـتەت پەرسـتوە یان کردووتە بە هاوبەشـی خوا. وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ أَفَرَأَيْتَ مَنْ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ ﴾[140] واتە: نابینی ئەو کەسەی ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی، یانی ئارەزووەکانی خۆی زۆر لە لا خۆشـەویسـترە لە خوای بێ وێنە و هاوتا ! وە زۆر لە لای گەورەترن بۆ ئەوەی فەرمانەکانیان جێبەجێ بکات، زۆریش بۆیان مل کەچە و پێوەیان پابەندە، کەواتە ئەو کەسە ئارەزووی خۆی دەپەرستێ.

وە کە (فرعون)و دەستەڵاتدارێك بەو شێوەیە دەپەرستێ یان پارە و سامان یان سەرکردەی حیزبێـك و دەوڵەتێك یان کەسـێك لە بەرگی (دین) دا وەك ئەوەی کە شێخێکی هەیە و وەك خوا (سبحانه وتعالـى) یان لە خوا زیاتری خۆش دەوێ و سیفەتەکانی خوای کە بۆ خوا نەبێ ناشێن پاڵ دەداتە لا و پێی وایە غەیب دەزانێ و شیفای نەخۆش دەدات و ئەگەر حەڕامی بۆ حەڵاڵ بکات و حەڵاڵی لـێ حەڕام بکات هەر بە قسەی دەکات، ئەوە هەمووی پەرستنە، وەك لە فەرموودەکەی پێغەمبەریش دا ﷺ لە کاتی هاتنی (عَدي) کوڕی (حاتم الطائي)دا بۆ لای زۆر بە ڕوونی ڕاگەیەنراوە کە پەرستن تەنیا سوجدە و ڕکوع

---

(140) (الجاثيـة- 23) .

نیە، بەڵکو بە قسە کردنی هەر کەسێك کە حەڕام حەڵاڵ بکات و حەڵاڵ حەڕام بکات ئەوەش هەر پەرستنە[141].

ئینجا بە نسبەت ڕستەی دووەمی (شـــایەتمان)ەوە (أشهد ان محمدا رسول الله) شایەدی دەدەم کە (محمد) ﷺ ڕەوانە کراوی خوایە، واتە هەرچی کە (مُحَمَّدٌ) ﷺ فەرموویەتی و کردوویەتی و دانی پێداهێناوە هیچی لە خۆیەوە نەبووە و وەك خوای پەروەردگار دەربارەی دەفەرمووێ ﴿ **وَمَا يَنْطِقُ عَنْ الْهَوَى ، إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى** ﴾[142] واتە: وە لە ئارەزووەوە قسە ناکات بەڵکو ئەوە هەر وەحی یە و پێ ی ڕا دەگەیەنرێ، جا ئەوە هەم قورئان دەگرێتــــەوە و هەم ســونەتیش بە هەرسێك جۆرەکانییەوە کە بریتین لە: (قول، فعل، تقریر)، جا (السنة القولیة) ئەوەیە کە بە زاری موبارەکی فەرموویەتی کە پێ ی دەڵێن: (الحدیث) ، وە (الســـنة الفعلیـــــة) ئەوەیە کە بە کردەوە ئەنجامی دابێت وەك فەرموویەتی (**صلّوا كما رأيتموني أُصلي**)[143] واتە: منتان چۆن بینی لە نوێژ کردن دا ئێوەش ئاوا و بەو شێوەیە نوێژ بکەن، وە فەرموویەتی: (( **خذوا عني مناسككم..** )) رواه مسلم، واتە: خوا پەرستیەکانی حەج و عومرەم لێوە فێر بن و تەماشام بکەن چۆنیان ئەنجام دەدەم.

---

(141) عن عدي بن حاتم قال : أتيتُ النّبيَّ ﷺ وفي عُنُقي صليبٌ مِن ذَهَبٍ ، فَقالَ : يا عدي إطرحْ هذا الوهن من عنقكَ . فقرأ هذهِ الآية ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ قال : قلتُ يا رسول الله إنا كنّا نعبدهم : فقال : أليس يُحرّمونَ ما أحلّ الله فتحرّمونه و يُحلّون ما حرّمَ الله فتحلّونه ؟ قال : قلت : بلى :قال فتلك عبادتهم . بڕوانە (تفســير الطبري) ج 10 ص 120 ژمارە: 16559

(142) (النجـم 3-4).

(143) رواه البخـــاري.

(السنة التقريرية) ش ئەوەیە کە کەسێك شتێکی گوتبێ یان کردبێ، پێغەمبەریش ﷺ پەسندی کردبێ و لێی بێ دەنگ بووبێ، واتە دانی پێداهێنابێ کە دیارە ئەو زاتە لە ئاست ناهەق و خراپە بێدەنگ نەبووە. بۆیە ئەمیش جۆرێکە لە جۆرەکانی سوننەت.

کە تۆ دەڵێی (واشهد ان محمدا رسول الله) دەبێ لە دڵ دا یەقین و دڵ دامەزراویت بۆ دروست بووبێ کە هەرچی(محمد) ﷺ، ڕای گەیاندوە لە خواوە وەك دین و شەریعەت، ئەوە هەمووی هی خوایە، چونکە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ يَاأَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ ﴾[144] واتە: ئەی پێغەمبەر! ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت نێرراوەتە خوارێ ڕای بگەیەنە، ئەگەر وا نەکەی ئەوە پەیام و بەرنامەی خوات ڕانەگەیاندوە، کەواتە نابێ پێت وابێ کە پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێکی شاردبێتەوە، یان لە بەرانبەر ناحەق دا بێ دەنگ بووبێت بەڵکو هەرچی فەرموویەتی و کردوویەتی و پەسندی کردوە ڕاستە و حەقە.

بەڵام نابێ ئێمە هەندێك عادەتی پێغەمبەر ﷺ کە لە جوغزی هەڵس و کەوتی ڕۆژانەی دنیایی دا لەگەڵ ئەوەی کە وەك وەحی و دین لە لایەن خواوە (سبحانه وتعالى) ڕایگەیاندوە تێکەڵ بکەین.

بۆ نموونە:

بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو گەلی عارەب دا بووە و لە ڕووی بەرگ وپۆشاك و پێڵاوو کەل و پەل و پێداویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەوە ڕەچاوی داب ونەریت و شێوەی ژیان و گوزەرانی کۆمەڵگایەکەی خۆی کردوە، واتە وەك

---

(144) (المائدة -67).

وان پۆشاکی درێژی عارەبانەی پۆشیوە و نەعلی دەپێ کردوە و سواری وشتر و ئێستر و گوێ درێژ بووە وە لەو جۆرە خواردنانەی ئەوسای خواردوە و... هتد

بۆیە ئەو جۆرە شتانە هیچیان ناچنە قاڵبی سوننەتەوە و بەشێك نین لە دینداریی و مسوڵمانەتیی.

بەڵێ شـــێوە و چۆنیەتی بەرگ پۆشین و پێڵاو دەپێ کردن و سوار بوون و دابەزین وخواردن وخواردنەوە و ... هتد بەشێکن لە سوننەت، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ بە (أنس بن مالك) ی فەرمووە:

(( **يا غلام سمِّ الله وكل بيمينك وكلْ ممّا يليك** )) رواه البخاري.

واتە: ئەی کوڕیژگە: ناوی خوا بێنە و بە دەستی ڕاســتت بخۆ و لە بەردەم خۆتەوە بخـــۆ!

یان وەك (عائشة) خوا لــێی ڕازی بێ لە بارەی پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: (( **كان يحبّ التيامُنَ في شأنه كلّه: في تَنَعُّلِه و ترجُّلِه وفي شأنه كله** )) رواه البخاري، واتە: ئەو لە هەموو کاروبارێکی دا حەزی لــێ بوو بە لای ڕاست دەست پێ بکات: لە پێڵاو دەپێ کــردنی و سەردا هێنــانی دا، وە لە هەموو کاروبارێکی دا..

هەربۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ لە بواری هەڵس وکەوتە دنیایی یەکان و لەو مەسەلانەدا کە پسپۆڕیی و شارەزایی و کارامەیی تایبەت دەوریان تێدا دەبینێ دەســـــتی ئوممەتی خۆی ئاوەڵا کردوە و بیــرو زەینیانی ئازاد کردوە کە کۆششیان تێدا بکەن و هەوڵ بدەن نیشانەیان تێدا بپێکن.

بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستیەی گوتمان زۆرن بەڵام ئێمە تەنها ئاماژە بۆ دووانیان دەکەین:

یەکەم: لە جەنگی (بدر)دا پێغەمبەری خوا ﷺ بارگەو بنەی سوپایەکەی خۆی لە شوێنێك خست، جا (الحباب بن المنذر) ﷺ لێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا ئەم شوێنە خوا لە ڕێی وەحیەوە بۆی دیاری کردوی کە بۆمان نیە قسەی تێدا بکەین، یان هەر خۆت وات پێ باش بووە وەك پلان و تەکتیکی جەنگی؟! ئەویش فەرمووی: بەڵکو ئەوە تەنها ڕا و بۆچوونی خۆمە وەك پلان و نەخشەی جەنگ، ئینجا (الحباب) شوێنێکی دیکەی بۆ پێشنیار کردو حیکمەتەکەیشی بۆ ڕوون کردەوەو پێغەمبەریش ﷺ ڕاو بۆچوونەکەی وی پەسند کردو فەرمووی: (الرأي ما رأيت) ڕای ڕاست و بەجێ ئەوەی تۆیە[145].

دووەم: جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای هەندێك لە هاوەڵانی دا ڕەت بوو کە دار خورماکانیان متوربە (تلقيح) دەکرد - واتە تۆوی نێرەکانیان دەگواستەوە بۆ مێیەکان - ئەویش فەرمووی: پێم وا نیە پێویست بەوە بکات ! ئیدی ئەوانیش وای تێگەیشتن کە ئەوە فەرمانە و شتێکی هەڵقوڵاوی وەحی یە بۆیە دەستیان لە کارەکەیان هەڵگرت. جا کاتێك دارخورما متوربە نەکراوەکان بەریان نەگرت و پێغەمبەری خوا ﷺ بە مەسەلەکەی زانی. ئەو بە هەڵە تێگەیشتنەی ئەو هاوەڵانەی ڕاست کردەوە و فەرمووی:

هەرکات شتێکم بە ناوی خواوە (سبحانه وتعالى) وەك دین پێ ڕاگەیاندن ئەوە یەکسەر وەری بگرن، بەڵام ئەگەر بیروبۆچوونێکی خۆمم لە بارەی مەسەلەیەکی دنیایی یەوە بۆ خستنە ڕوو ئەوە مەرج نیە یەکسەر وەری بگرن و

(145) بڕوانە (سيرة ابن هشام) ج2ص66. وە (السيرة النبوية) للصلابي ص 397.

پێوەی پابەند بن، وە لەو بارەوە فەرمووی: (..**فأنتم أعلم بامور دنياكم**) ئەوە ئێوە لە کاروباری ڕۆژانەی دنیاتان دا شارەزاترن(146).

**( خاڵی سێیەم ) مەرجەکانی شایەتمان :-**

دیارە شایەتمان هێنان تەنها کاتێك ئامانجەکانی خۆی دەپێکێ، کە کۆمەڵە مەرجێکی تێدا بێنە دی، جا من (10) مەرجم هێناون و ڕەنگە لەوە زیاتریش لە کتێبەکانی (عقیدە)دا باس کرابن، وە دەشگونجێ هەندێکیان بخرێنە نێو یەکدی یەوە.

مەرجی یەکەم : گوتن و بێژتنی (شایەتمان) :

سەرەتاییترین مەرجی شایەتمان بریتی یە لە گوتن و دەربڕینی ئەو وشە بەرز و پیرۆزە و هەرئەوەندە بەس نیە بڵێی بڕوام پێی هەیە، بەڵکو دەبێ ئەو وشەیە بە زار بڵێی و دەری ببڕی.

بەڵگەشمان لەو بارەوە زۆرن یەکێکیان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە نەخۆشی مردنی (أبو طالب)ی مامی دا، پێی فەرموو: (قل لا اله الا الله اشهد لك يوم القيامة) بڵێ (لا اله الا الله) تاکو ببمە شایەدت بە هۆی ئەم وشەیەوە کە تۆ ئیماندار و مسوڵمانی لە ڕۆژی دوایی دا، کەچی (ابو طالب) ئاوای وەڵام دایەوە :

(لولا ان تعيرني نساء قريش يقولون: إنما حَمَلَهُ على ذلك الجَزَعُ لأمررْتُ بها عينك)(147)

(146) بڕوانە : (صحيح مسلم).

(147) رواه مسلم و غيره عن ابي هريرة رضي الله عنه.

واتە: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبا کە ئافرەتانی قوڕەیش عەیب و ڕەخنەم لــێبگرن و بڵێن (ابو طالب) لە مردن ترســـــا یان لە دۆزەخ، دڵی تۆم بەو وشەیە خۆش دەکرد و دەرم دەبڕی، ئینجا خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿ إِنَّكَ لاَ تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ ﴾ [148] تۆ ئەو کەسەی کە حەزت لــێیە ناتوانی هیدایەتی بدەی، بەڵام خوا هەر کەسێك بیەوێت هیدایەتی دەدات.

کەواتە گوتنی ئەو وشەیە مەرجە و پێویستە.

مەرجی دووەم : - زانیاری هەبوون بەم وشەیە:

وەك پێشتر باسم کرد (لا الە الا الله) ماناکەی ئەوەیە کە: هیچ پەرستراو (معبود) نین و هیچ مل بۆ کەچ کراو،(مُطاع)نین جگــە لە خــوا، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ (فَاعْلَمْ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)[149] واتە: بزانە کە جگە لە خوا پەرستراوێکی دیکە نیە.

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (( من مات وهو يعلم انه لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ دخل الجنة ))[150] واتە: هەر کەسێك بمرێ و بزانێ (بە زانینێك کە کردار و ڕەفتار بە بەرهەم بێنێ) کە جگە لە خوا پەرستراوێکی دیکە نیە ئەوە دەچێتە بەهەشت.

مەرجی سێیەم: - دوو دڵی نەمان و دڵنیا بوون (عدم الشك وحصول اليقين):

وەك خوای پەنهان بین فەرموویەتی :

---

(148) (القصص –56) .
(149) محمد – 19) .
(150) رواه مسلم .

﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَ رَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا ﴾ [151]

واتە: بڕواداران تەنیا ئەوانەن کە ئیمانیان بە خوا و پێغەمبەرەکەی هەیە و پاشان هیچ گومان و دوو دڵی یەکیان نەماوە.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (( **من يشهد ان لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مستيقنا بها قلبه فبشره بالجنة** ))[152] واتە: هەر کەسێك شایەدیی بدات کە جگە لە خوا پەرستراوێکی دیکە نیە بە دڵنیایی و دڵی دامەزراوەوە، ئەوە موژدەی بەهەشتی پێ بدە.

مەرجی چوارەم :- لە خۆ دارنین وبێ بڕوا بوون بە تاغووت، (البرآءة من الطاغوت والكفر به) .(طاغوت) یش وەك (الطبري) گوتویەتی هەر پەرستراوێکە جگە لە خوا، لە دار و بەردو جند وئینسان و شتی ماددی و مەعنەوی و شتی ئەفسانەیی و ... هتد [153]، چونکە وشەی (شایەتمان) (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) پیی دەگوترێ (كلمة النفي والاثبات) و هەم لابردنی (نفي) پەرستراوێتی غەیری خوا و هەم چەسپاندنی (اثبات)ی تەنیا پەرستراوێتی خوا دەگرێتە خۆی، کەوابوو (اثبات)ەکە بە کەڵك نایەت تاکو (نفی)یەکەی پێش نەکەوێت، دەبێ پاکسازی یەکە هەبێت ئینجا چاکسازیی یەکە جێگەی خۆی دەگرێت، خوای زاناش دەفەرموێ:

---

(151) الحجرات (15) .

(152) رواه مسلم .

(153) بەڵام من وای بۆ دەچم کە وشەی (تاغوت) تایبەتە بەو حوکمڕانە خۆ بە زلگرانەی کە هەواو ئارەزوو و بۆچوونی خۆیان یان غەیری خۆیان بۆ خەڵکی دەکەنە دین و بەرنامەی ژیان و گوزەران.

**﴿ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدْ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لاَ انفِصَامَ لَهَا ﴾**(154)

**واتە: هەر کەسێك کوفر بە تاغووت بکات و ئیمان بە خوا بێنێ ئەوە دەستی دە گرێ و قوڵفەی ڕێسمانێکی مەحکەم گرتوە.**

**دیارە کەسێکیش دەست دەگرێ وقوڵفەی مەحکەم بگرێ سەردەکەوێ و بە مراد دەگات.**

**کەواتە: بابای بڕوادار و تەنها خوا پەرست دەبێ سەرەتا مێشك و دڵ و دەروونی خۆی لە تاغووت پاك وخاڵی بکاتەوە ئەوجار دەتوانێ میوانداریێتی لە (توحید) خوا بە یەکگرتن بکات ولە دڵ ودەروونی خۆی دا نیشتەجێی بکات.**

**وە پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (( من قال لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ وكفر بما يُعْبَدُ من دون الله حُرِّم ماله ودَمُه وحسابه على الله ))(155) واتە: هەر کەسێك بڵێ (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ) و کوفر بکات بە هەرچی کە جگە لە خوا دەپەرسترێ ئەوە ماڵ و خوێنی حەرامە، وە حیسابیشی لەسەر خوایە.**

**(مەرجی پێنجەم) ڕاست کردن (الصدق): مەرجی پێنجەمی وەرگیرانی شایەتمانیش ئەوەیە کە دەبێ لەو گوتن و دەربڕینەی شایەتمان دا ڕاست بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( ما من أحد يشهد ان لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ وان مُحَمَّدا رسول الله صِدْقاً من قلبه الاّ حرَّمه الله على النار ))(156)**

---

(154) (البقـرة -256).

(155) رواه مسلم.

(156) رواه البخـاري.

واتە: هەر کەسێك شایەدیی بدات کە بێجگە لە خوا پەرستراوی دیکە نیە وە کە (مُحَمَّد) ڕەوانە کراوی خوایە، بەلاّم بە ڕاستیی و لە دڵی یەوە وای گوتبێ، ئەوە حەتمەن خوا لە ئاگر قەدەغەی دەکات و ناچێتە دۆزەخ.

ڕاست کردن یانی دوایی شتێك نەکات و نەڵێ کە پێچەوانەی (شایەتمان)ەکەی بێت، واتە: ئەگەر بە فەرمانێکی خوا ڕازی نەبوو، ئەوە لە گوتنی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)دا ڕاستی نەکردوە، یانی ئەگەر گوتی: فلاّن سوننەتەی پێغەمبەر بە ناتەواو دەزانم ودەشی زانی کە سوننەتە، دیارە لە گوتنی (مُحَمَّدٌ رسول الله) دا ڕاستی نەکردوە، بە کورتی: هەر کەسێك شایەتمان بێنێ و پاشان شتێکی لێ بپشکوێتەوە لە قسە و دەربڕین، یان کردەوەو ڕەفتار کە شایەتمانەکەی هەڵوەشاندەوە، ئەوە دیارە شایەتمانەکەی هەر لە بنەڕەتەوە (صدق)ی لەگەڵ نەبووە.

مەرجی شەشەم :- ساغ کردنەوە (الإخلاص) کە لە (خَلُصَ)ەوە هاتوە، (أَخْلَصَ)ش ئەوەیە کە شتێك لە شتێکی دیکە جیا بکەیەوە وساغی بکەیەوە، مەبەست لە ساغ کردنەوەش ئەوەیە کە کاتێك دەڵێی جگە لە خوا پەرستراوێکی دیکە نیە، دەبێ هەرچی زیان لەو تەنیا پەرستنەی خوا (سبحانه وتعالى) دەدات لە (شرك)و (ریاء)و (نفاق)و ... هتد هەمووی دەبێ دوور بخەیەوە لە گشت بوارەکانی قسەو کردەوە و دڵ و نیەت دا، وە دەربارەی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ)ش نابێ ڕێباز و دەستوور و فرمانی هیچ کەسێك بهێنیە ڕیزی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ وەدەبێ پابەندییت بە ڕێبازی پێغەمبەرەوە ﷺ ساغ وجیا بکەیەوە لە هەر جۆرە خڵتەو خاڵێك، وەك خوای بە بەزەیی دەفەرموێ: ﴿أَلاَ لِلَّهِ

**الدِّينُ الْخَالِصُ﴾**(157) واتە: ئاگادار بن دینداریی ساغ و بێ خلتە هەر شایستەی خوایە دیارە وشەی (دین) لێرەدا بە مانای مل کەچی یە، کەواتە: دەبێ بە قسە کردن و گوێ ڕایەڵیی بابای مسوڵمان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی بێ قەید و شەرت و مەرج بێت، بەڵام بۆ غەیری ئەوان لە ئەمیر و کاربەدەستانی مسوڵمان، ئەوە دەبێ لە سەر بنچینەی (انما الطاعة في المعروف) رواه البخاري ، بێت و لە دەرەوەی بازنەی شەرع فەرمانبەریی بۆ کردنی کاربەدەستانی حەرامە و دروست نیە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( **أسعد الناس بشفاعتي من قال لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ خالصا من قلبه او نفسه**))(158)

واتە: بەختەوەرترین کەس بە هۆی شەفاعەتی منەوە لە ڕۆژی دوایی کەسێکە کە لە دڵ و دەرونێکی ساغەوە گوتی: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ.

مەرجی حەوتەم:- وەرگرتن و تەسلیم بوونی دەروونی (القبول والاذعان القلبي): واتە: گوتنی : (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) چ داخوازیی دەکات هەمووی قبووڵ بکەی وبۆی گەردن کەچ بی، هەروەها گوتنی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ) چ شتێك پێویست دەکات قبووڵت بێت و بۆشی تەسلیم بی، دیارە پێچەوانەی قبووڵ و تەسلیم بوونیش، بریتی یە لە (انکار) و (رفض) (جحود) واتە: نکووڵی لێ کردن و وەرنەگرتن و دان پێدانەهێنان، وەك خوای پەروەردگار دەربارەی (آل فرعون) فەرموویەتی: ﴿ **وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنْفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا** ﴾(159) واتە: نکووڵیان لێ کرد لە

(157) (الزمر -3) .
(158) رواه البخاري .
(159) ( النمل -14) .

کاتێك دا کە لە ڕاستیشی دڵنیا بوون لە ناخیانەوە، بەهۆی ستەم و خۆ بە زلگرییەوە.

واتە: هەرچەندە دارودەستەی فیرعەون دڵنیا بوون لە پەیام و ئایەتەکانی مووسا ﷺ کە ڕاست وتەواوە، بەڵام دانیان پێدانەهێنان وقبووڵیان نەکردن.

بەڵێ جاری وا هەیە ئینسان (یەقین)ی هەیە دەربارەی ڕاستیی شتێك و دەڵێ دەزانم کە ئەو شتە ڕاستە، بەڵام دانی پێدا ناهێنم و ڕەفزی دەکەم، بۆیە دەبێ حەتمەن ئەو دان پێدا هێنان و قبووڵ و تەسلیم بوونەش لە شایەتمان دا هەبێ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ ﴿ فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾[160] واتە: سوێند بە پەروەردگاری تۆ بڕوا ناهێنن تاکو تۆ نەکەنە دادوەر لەو شتانەی کە تێیدا کەوتوونەتە کێشە و نیزاع، پاشان هیچ هەست بە سەغڵەتی و دڵ تەنگی نەکەن سەبارەت بە حوکم و بڕیاری تۆ (ئەگەر بە ڕواڵەت زەرەریشیان کردبێ) وە هەتا بە تەواوی گەردن کەچ دەبن.

مەرجی هەشتەم :- خۆشویستن و پەسند کردن (المحبة والرضا) .

واتە: دەبێ هەموو داخوازی یەکانی وشەی (شـــایەتمان)ی خۆش بوێ و پەسندیان بکات، بۆ نموونە یەکێك لە داخوازی یەکانی وشـــەی (شایەتمان) جیهاد کردنە، دەبێ جیهادی زۆر خۆش بوێ وپێی خۆش بێ و پەسندی بکات، یەکی دیکەیـــان نوێژ کردنە دەبێ نوێـــژی خۆش بوێ و پەســـندی بکات، نەك بڵێ هەرچـــەند خوا فەرزی کردوە بەڵام زۆرم پێ ناخۆشـــە، بگرە بەوە ئەگەر گریمان پێشتـــر مسوڵمانیش بووبێ، کافر دەبێ و لە دین دەردەچێ.

---

(160) (آل عمـران –65) .

هەر بۆیەش پێشتر گوتمان و سەلماندیشـــمان کە (ئیمان) تەنیا بە ڕاست دانان (تصدیق) نیە، تاکو پێچەوانەکەی بەس بە درۆ دانان (تکذیب) بێت، ئەوەتا دەبێ بابای مسوڵمان ئیمانەکەی خۆی بە هەموو پێکهێنەرەکانییەوە خۆش بوێت و پەســـندی بکات وەك خوای پـەروەردگار لەو بارەوە دەفەرمـوێ: ﴿ وَ الَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ ﴾(161)

واتە: ئەوانەی بڕوادارن خوایان لە هەموو شـتێك خۆشـتر دەوێت، کەواتە: هەرچی خواش خۆشـــی دەوێت و فەرمانی پێ کردوە لە هەموو شـــتێکیان خۆشتر دەوێت.

وە لە سـورەتی تەوبەدا کە بە ڕاستی بۆ ئیمان پێوەر و تەرازوویە، خوای پەروەردگار (8) هەشت شتی بە پێغەمبەری ﷺ فەرمووە: پێیان بڵێ (واتە بە مسوڵمانان): ئەگەر خوا و پێغەمبەرەکەی وجیهاد لە ڕێی خوادا لای ئێوە خۆشەویستر نەبێ لەو (8) هەشت شتانە، ئەوە چاوەڕێی تۆڵەی خوا بکەن پاشان حوکمی (فسق) و لە دین دەرچوونیان بەسەردا دەدات وەك دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴾(162) واتە: بڵێ ئەگەر باب و باپیـرانتان و کوڕانتان و برایانتان و هاوسەرانتان وتیـرە و هۆزتان و ئەو دارایی یانەی کە وەدەســتتان هێناون و بازرگانییـــەك کە لە زیان تێـــداکردنی دەترســـن و خانوو و بەرەیەك کە

(161) (البقــرة 165) .
(162) (التـوبة 24) .

دڵپەسندتانە لە لاتان خۆشەویست ترن لە خواو پێغەمبەرەکەی وتێکۆشان لە ڕێی خوادا، ئەوە چاوەڕێ بن تاکو فەرمانی خوا دێ (بە تۆڵە لـێ ستاندنەوە و جەزرەبە دانتان) وە بێگومان خوا ڕێڕوونیـی کەسانی لارێ ناکات.

کەواتە: دەبێ بابای مسوڵمانی شایەتمان هێنەر خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ و جیهادکردن لە ڕێی خوادا لە هەموو کەس و هەموو شتێك لە لا خۆشەویستر بێ و لە سەرووی هەموو شتێکەوە دایان بنێ.

وە پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (( **ثلاث من كن فيه وجد بهن حلاوة الإيمان: أن يكون الله و رسـوله أحب إليه مما سـواهما، وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله، وأن يكره أن يعود في الكفر كما يكره أن يقذف في النار** ))[163] سێ شت لە هەر کەسێك دا هەبن ئەوە ئەو کەسە شیرینایەتی ئیمانی چێشتوە: یەکەمیان ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەری خوای لە هەموو کەس و شتێك لا خۆشەویستتر بن، وە کە یەکێکی خۆش دەوێ لەبەر خوا خۆشی دەوێ وە چۆن پێی ناخۆشـە فڕێ بدرێتە نێو ئاگری ئاواش پێی ناخۆش بێ بۆ کوفر بگەڕێتەوە.

مەرجی نۆیەم :- فەرمانبەریی و جێبەجێ کردنی کردەیی (الطاعة والتطبيق العملـــــي):

بێ گومان ئەگەر کەسـێك مەرجەکانـــــی ڕابردووی تێدا بن و لە خۆی دا هێنابنیەدی ئەم مەرجەشی هەر تێدا دەبێ، خوای پەروەردگار لەو بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ **وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَمَا أُولَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ** ﴾[164] واتە: وە دەڵێن بڕوامان بە خواو

---

(163) رواه البخاري و مسلم .

(164) (النـور 47) .

پێغەمبەرەکەی هەیەو فەرمانبەریی وبە قسە کردنیشمان هەیە، کەچی دوایی کۆمەڵێکیان پشت هەڵ دەکەن وە بێگومان ئەو جۆرە کەسانە بڕوادار نیـــن .

مەرجی دەیەم :- مردن لەسەر شایەتمان: (الموت على كلمة الشهادة).

مەرجی کۆتایی جێی خۆگرتـــن و قبووڵ کرانی شـــایەتمانیش ئەوەیە کە دەبێ بابای مســـوڵمان لەســـەر ئەو وشەیە کۆتایی ژیانی بێت، ئەگەر نا با (شایەتمان)یشی هێنا بێت و هەموو مەرجەکانیشی جێبەجێ کردبن، مادام دوایی (کفـــر)ی لـێ ڕوو بدات و کوفـــر بناغـــەی دینەکـــەی نەهێڵـــێ و هەڵـی بوەشێنێتەوە و سەرەنجام لەسەر شایەتمان نەمرێ، دیسان بە ئەهلی ئیمان وشایەتمان دانانرێ و لە ئاکامیش دا ناچێتە بەهەشت.

دیارە مەبەستیش لە (مردن لەسەر شـــــایەتمان) ئەوەیە کە دەبێ بابای مسوڵمان ئەو وشەی شایەتمانە دوایین وشە بێت کە بە دەم دەیڵێ و دوایین وشە بێ کە لە دڵ و دەروونی دا هەیە و کاری پێ دەکات و لەسەری بمرێ، ئینجا پێی دەچێتە بەهەشت وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( **ما من عبد قال لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ثم مات على ذلك الاّ دخل الجنة** ))[165] واتە: هەر بەندەیەك بڵێ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) دوایی لەسەر ئەوەش بمرێ، ئەوە حەتمەن دەچێتە بەهەشت.

لە کۆتایی ئەم بڕە توێژینەوەیەش دەڵێم:

کەواتە: ئەو کەسانەی کە دەڵێن هەر کەسێك بڵێ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) دەچێتە بەهەشت، وە ژمارەیەك فەرموودە بە بەڵگە دەهێننەوە،ئەوانە بە هەڵە لە فەرموودەکان حاڵی بوون، چونکە هیچ فەرموودەیەك بە (مطلق)ی

(165) رواه مسلم .

ئاوای نەگوتوە، وە ئەگەر گریمان فەرمووەدەیەکیش بە (مطلق) ی هاتبێ ئەوە هەر ڕەوا نیە لەو بارەوە بە بەڵگە بهێنرێتەوە، چونکە لەو بارەوە بنچینە (قاعدة) یەك هەیە کە دەڵێ: (يُحْمَلُ الْمُطْلَقُ على الْمُقَيَّد) واتە: وشە ڕەهایەکان لەبەر ڕۆشنایی وشە مەرجدارەکان دا فام دەکرێن.

کەواتە: گوتنی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) دەبێ (صدق) و (اخلاص) ی لەگەڵ بێت وەك لە فەرمووەدەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە و پێشتر باسمان کردن.

کۆتایی ئەم باسەش بەم کورتە وتووێژە دێنم: دەڵێن ڕۆژێکیان پیاوێك دەربارەی ئەو فەرمووەدەیەی کە دەفەرموێ: (( **ان مفتاح باب الجنة لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ** ))[166] پرسیار لە (وَهَب بن مُنَبِّه) دەکات کە یەکێکە لە زانا بەرزەکان و دەڵێ ماموستا ئایا هەر کەسێك گوتی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) دەچێتە بەهەشت چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) کلیلی دەرگای بەهەشتە؟! ئەویش لە وەڵام دا دەڵێ:

بەڵێ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) کلیلی دەرگای بەهەشتە بەڵام هەموو کلیلەیەك ددانی خۆی هەن کە بە بێ ئەو ددانانە دەرگای پێ ناکرێتەوە، ددانەکانی کلیلی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) ش بریتین لە مەرجەکانی ئەو وشەیە و کردەوە و بەرهەمەکانی.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون. وسلام على المرسلين .

والحمد لله رب العالمين.

---

(166) رواه احمد، وە (ضعيف) ە بە پێی ئەوە کە ( تحقيق ) کراوە لە کتێبی ( معارج القبول ) بەرگی دووەم لاپەڕە (429).

## دەرسی شەشەم

# هەڵوەشێنەرەوەکانی شایەتمان و ئیمان
# ( نواقض الشهادة والايمان )

بەڕێـــزان !

لەم دەرسی شەشـــەمە و دەرسی حەوتەمیش دا باسی هەڵوەشێنەرەوەکانی شایەتمان وئیمان دەکەین، ئاشکراشە کە (شایەتمان) یەکێکە لە پێکهێنەرەکانی ئیمان چونکە شایەتمان بریتی یە لە دان پێداهێنانی زمان (إقرار اللسان) و ئەمیش بەشێك و پێکهێنەرێکی ئیمانە وەك پێشتر بە تێر و تەسەلی قسەمان لە بارەوە کرد.

ئینجا لە سونگەی ئەوەوە کە ئیمان چوار پێکهێنەری هەن کە بریتین لە:

1- قسەی دڵ. 2- کردەوەی دڵ. 3- قسەی زمان. 4-کردەوەی ئەندامەکان.

وەك زۆربەی هەرە زۆری زانا و پێشـــــەوایانی ئیسلام بەو جۆرە پێناسەی ئیمانیان کردوە و گوتوویانە:

﴿الإيمان: قول القلب و اللسان و عمل القلب والجوارح﴾. کەواتە:

دەبێ هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمانیش-کە شایەتمانیش دەگرێتە نێوخۆی- چوار جۆر بن:

جۆرێکیان دژ و پێچەوانەی زانین و بە ڕاست زانینی دڵە و، جۆرێکیشـــیان لەگـەڵ کردەوەکانـــی دڵ دا تێـك دەگیرێ و، جۆرێکیشـــیان پێچـــەوانەی دان پێداهێنـــانی زمانو، جۆری چوارەمیشیان پێچـەوانەی کـردەوەو پابەندیـــی ڕواڵەتیی و جەستەیی یە.

جا ئێمە بەرلەوەی بچینــــە سەر باسی ئەو چوار جۆرە هەڵوەشێنەرەوانەی ئیمان دوو ڕوونکردنەوەی گرنگ دەخەینە ڕوو کە تیشـــکی زیاتر دەخەنە سەر ئەم بابەتە:

یەکەم: شایەتمان پێکهێنەرێکی ئیمان و دەروازەی هاتنە نێو ئیسلامە :

بەڵێ بەڕێزان شایەتمان هێنان، واتە گوتنی:

(أشهد ان لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ و أشهد ان مُحَمَّدٌ رسول الله)

واتە :- شایەدیی دەدەم کە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوی بە هەق نین، وە شایەدیی دەدەم کە موحەممەد ڕەوانە کراوی خوایە - یەکێکە لە چوار پێکهێنـــــەرەکانی ئیمان وە دەروازەیەکیشە کە ئینسان لێیەوە دێتە نێو ئیسلامەتییەوە.

پێشتـریش خستـمانە ڕوو کە مەبەست لە پێکهێنەرەکانی ئیمان ئەو شتانەن کە بە بێ هەر کامێکیان ئیمان نایەتە دی و پێی ناگوترێ ئیمان.

وە مەبەستیش لە دەروازە بوونی شایەتمان هێنان بۆ ئیسلام ئەوەیە کە هەر کەسێك بیەوێ بێتە نێو ئیسلامەتییەوە و مسوڵمان ببێ و ئیعلانی مسوڵمانەیتی خۆی بکات دەبێ شایەتمانی بەسەر زاردا بێت.

ئێستاش چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنینەوە لەسەر ئەوە کە شایەتمان هێنان دەرگا و دەوازەی هاتنە نێو ئیسلامی ئینسانن و ئەو فەرموودانەش زۆر جێی سەرنجن وشایستەی ئەوەن کە باش تێیانەوە ڕامێنین و هەڵوەستەیان لە بەرانبەردا بکەین، چونکە وەك دەزانین لەم چاخ و سەردەمەمان دا دیاردەی بە ناهەق و بە گۆترە و هەوەنتە بە کافر دانان

(تکفیر) زۆر تەشەنەی کردوە لە نێو کەسانێکی تازە پێگەیشتوو و کەم شارەزادا.

1- فەرموودەی یەکەم:

**(( عن اسامة بن زيد ﷺ قال: بعثنا رسول الله ﷺ الى الحَرَقة (أو الى الحرقات) من جُهَيْنة. قال فَصَبَّحنا القوم فهزمناهم، قال: ولحقت انا و رجلٌ من الأنصار رجلاً منهم، قال فلما غَشيناه، قال لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ ، فكف الأنصاري ، فَطَعَنْتُهُ برمح حتى قتلته، فلما قدمنا، بلغ ذلك النبي ﷺ، قال فقال لي يا اسامة اقتلته بعد ما قال لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ ؟! قال قلت يا رسول الله انه انما كان متعوذا، قال قتلته بعد ما قال لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ ؟! فما زال يكررها حتى تَمَنَّيْتُ أني لم اكن اسلمت قبل ذلك اليوم))**[167]

واتە : لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێت گێڕدراوەتەوە دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ ئێمەی نارد بۆ شوێنێك بە ناوی (حَرَقة) یان (حَرَقات) لە نزیکی هۆزی (جُهَيْنة)، دەڵێ : شەبەیخوونمان کردە سەر ئەو قەومە و تێکمان شکاندن دەڵێ: جا من و پیاوێکی ئەنصاری گەیشتین بە پیاوێك لەو قەومە و بەسەری دا زاڵ بووین و ویستمان بیکوژین، کابرا گوتی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ)، کابرای ئەنصاری وازی لە کوشتنی هێنا، بەڵام من بە ڕمبە کەم لێم دا و کوشتم، کاتێك گەڕاینەوە بۆ(مەدینە)، ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ و لە دوای ناردم و پێی فەرمووم: ئەی ئوسامە! چۆن کابرات کوشت دوای ئەوەی

(167) رواه البخاري و مسلم .

گوتی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) ؟!، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بێ گومان کابرا هەر ویستی بەو وشەیە خۆی لە دەستی کوشتن دەرباز بکات، دیسان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کوشتت دوای ئەوەی گوتی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)؟!، پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەوەندەی دووبارە کردەوە، خۆزگەم دەخواست کە تا ئەو ڕۆژە مسوڵمان نەبوومایە، - بۆ ئەوەی ئەو گوناحە گەورەیەم لەسەر حیساب نەکرابایە- .

(وفي رواية لمسلم) ((**قال: قلت يا رسول الله انما قالها خوفا من السلاح، قال: أفلا شَقَقْتَ عن قلبه حتى تعلم اقالها** أم لا!!)).

وە لە یەکێك لە ڕیوایەتەکانی ئیمام (مسلم)دا هاتووە کە : ئوسامە دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا لە ترسی چەك ئەو وشەیەی بە دەم دا هات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەدی مادام وایە بۆچی سینەت لەت نەکرد، بۆ ئەوەی سەیری نێو دڵی بکەی و بزانی کە ئایا بە دڵ و قەناعەتەوە گوتوویەتی یان هەر بە زمان و لە ترسان !!

دیارە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوە نیە کە ئوسامە بچێ بە کردەوە دڵی کابرا تەماشا بکات ئینجا ئەگەر گریمان واش بکات ئەوە هەر ناتوانێ هیچ بە هیچ بکات، بەڵکو مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە ئێمە حوکم بە ڕواڵەت (ظاهر) دەکەین بۆ بە مسوڵمان یان نا مسوڵمان لە قەڵەم دانی خەڵك. کابرا کە شمشێری لێ بەرز کراوەتەوە لەو دەمەدا هەر فریای ئەوە کەوتوە کە بڵێ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) و ئیعلانی مسوڵمانەتی خۆی بکات، جا ئایا لە ترسانە یان بە قەناعەتەوەیە، تۆ بۆت نیە لایەکیان دیاری بکەی.

کەواتە ڕاستە (شایەتمان) هێنان دەروازەی هاتنە نێو ئیسلامە.

2- (فەرموودەی دووەم):

**(عن المقداد بن عمرو الكندي انه قال لرسول الله ﷺ ، أرأيت إنْ لَقِيتُ رجلا من الكفار فاقْتَتَلْنا، فضرب إحدى يَديَّ بالسيف فَقَطعها ثم لاذ مني بشجرة ثم قال أسلمت لله، أأقتله يا رسول الله بعد ان قالها؟! فقال رسول الله ﷺ لا تقتله، فقال يا رسول الله إنه قطع إحدى يديَّ ثم قال ذلك بعدما قطعها! فقال رسول الله ﷺ لا تقتله، فإن قتلته فأنه بمنزلتك قبل ان تقتله وأنت بمنزلته قبل أن يقول كلمته التي قال))** رواه البخاري و مسلم.

واتە: میقدادی کوڕی عەمری کیندی دەگێڕێتەوە و دەڵێ بە پێغەمبەری خوام ﷺ گوت: ئەی پێغەمبەری خوا: ئەگەر هات و من لەگەڵ پیاوێك لە کافرەکان بەشەرهاتم لە کاتی جەنگ دا و ئەو زەبرێکی لێدام و قۆڵێکی پەڕاندم، پاشان چووە پاڵ درەختێك و خۆی لێ پەنادام، بەڵام من بەسەریدا زاڵ بووم و کاتێك ویستم زەبری لێ بدەم و بیکوژم گوتی: مسوڵمان بووم و بۆ خوا گەردن کەچم. جا ئایا ئەی پێغەمبەری خوا لەو کاتەدا بیکوژم یان نا ؟! فەرموی : مەیکوژە! گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاخر دوای ئەوەی کابرا دەستێکی پەڕاندووم ئەوجار ئەو وشەیە دەڵێ ! دیسان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەیکوژە چونکە ئەگەر بیکوژی - لە کاتێك دا کە دەڵێ مسوڵمانم - ئەوە ئەو وەك ئەو کاتەی تۆی لێ دێ و دەچێتە ئەو حاڵەتەی تۆوە کە پێش کوشتنی هەتبوە، تۆش دەچیە ئەو حاڵەتەی ویەوە کە پێش ئەوەی قسەکەی بکات هەیبوە !

جا ئێستا با لەبەردەم ئەم فەرموودەیەدا هەڵوەستەیەك بكەین بۆ ئەوەی بە هەڵە لـێی تێ نەگەین. چونكە ڕواڵەتی فەرمایشتەكە ئەوە دەگەیەنێ كە ئینسانی مسوڵمان بە كوشتنی بابایەكی تازە مسوڵمان بوو لە ئیسلام دەچێتە دەرێ و كافر دەبێت !!

بەڵام بێگومان مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە نیە چونكە پێشتر باسمان كرد كە كردەوە خراپەكان - مادام لە خودی خۆیان دا كوفر نەبن - نابنە مایەی لە دین دەرچوون وكافربوونی خاوەنەكانیان!

(خطّابي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ كە یەكێكە لە شارەزایانی سوننەت وەڵامی ئەو ئیشكالە دەداتەوەو دەڵێ: (معناه ان الكافر مباح الدم بحكم الدين قبل أنْ يُسْلِمَ، فإذا أسلم صار مُصان الدم كالمسلم، فإن قتله المسلم بعد ذلك صار دمه مُباحا بحق القِصاص فالكافر مباح الدم بحق الدين والمسلم بحق القصاص وليس المراد الحاقه به في الكفر كما يقول الخوارج من تكفير المسلم بالكبيرة)[168] دەڵێ: مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە كە كابرای كافر لە كاتی جەنگ دا خوێنی ڕەوایە بە حوكمی (دین) چونكە دین دەفەرمووێ ﴿ وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ ﴾، كەواتە پێش ئەوەی مسوڵمان بێ خوێنی ڕەوایە[169]، بەڵام كاتێك كە مسوڵمان بوو خوێنی پارێزراوە وەك مسوڵمانە كە (فلما اسلم صار مصان الدم كالمسلم) ئینجا كە پێغەمبـــەر ﷺ دەفەرموێ ئەگەر تۆ بیكوژی ئەو دەچێتە پلەی تۆوە پێش ئەوەی تۆ بیكوژی، دیارە پێش

---

(168) فتح الباري.

(169) مادام لە حاڵەتی جەنگ و كوشتار دابێ دژی مسـوڵمانان.

ئەوەی ئەو (صحابی)یە (قتل)ێك بكات خوێنی پارێزراوە و كەس بۆی نیە بە ناحەق خوێنی بڕێژێ، بەڵام كاتێك (قتل)ی كرد، ئەوە خوێنی ڕەوا دەبێ بە حوكمی تۆڵە (قصاص)، واتە هی كافرەكە بە حوكمی (دین) ڕەوا دەبێ و (دین) دەڵێ بیكوژە، بەڵام هی مسـوڵمانەكە بە حوكمی تۆڵە (قصاص) ڕەوا دەبێ چونكە مسـوڵمانێكی كوشتوە و تۆڵەی كەوتۆتە سەر.

كەواتە لە ئەصڵی خوێن ڕەوا بوونەكەدا ئەو مسوڵمانەی كە كافرێك دەكوژێت كە شایەتمانی هێناوە، وەك كافرەكەی لێ دێت، بەڵام كافرەكە هەم لە خوێن پارێزرانی دا و هەم لە بەهەشت بۆ مسۆگەر كرانی دا وەك مسوڵمانێكی لـێ دێت مادام شایەتمانەكەی بە ڕاستی بووبێت.

3- (فەرموودەی سێیەم)

(عن انس ﷺ ان رسول الله ﷺ قال: مَنْ صلّى صلاتنا و استقبل قبلتنا وأكل ذبيحتنا فذلك المسلم الذي له ذمة الله و ذمة رسوله فلا تُخْفِروا الله في ذِمَّته)[170]

واتە: هەر كەسێك وەك نوێژی ئێمە نوێژ بكات و ڕووی بكاتە ڕووگە (قبلة)ی ئێمە و سـەر بڕدراوی ئێمە بخوات، ئەوە ئەو مسوڵمانەیە كە بەڵێنی خوا و پێغەمبەری خوای پێ دراوە (كە ماڵ و نەفس و خوێنی پارێزراو بن) جا كەواتە پەیمان و بەڵێنی خوای پەروەردگار مەشكێنن.

(170) رواه البخـاري.

واتە: هەر کەسێك کە ئاوا درووشم و نیشانەکانی مسوڵمانانی پێوە دیار بن بە ڕواڵەت، ئەوە بەڵێنی خوا (سبحانه وتعالى) و پێغەمبەری ﷺ پێدراوە کە حیسابی مسوڵمانانی بۆ بکرێ لە پارێزرانی ئەو شتانەدا کە باسمان کردن (گیان و سامان و کەرامەت و ... هتد).

هەڵبەتە دوایی باسی ئەوە دەکەین کە ئەگەر کوفری ئاشکرا (بواح)ی لێ ببینرێ چۆن ئەو ئیمان و شایەتمانەی لێ هەڵدەوەشێتەوە.

4- (فەرموودەی چوارەم)

هەروەها (انس) خوای لێ ڕازی بێ گێڕاویەتەوە و گوتوویەتی: (بلغ عبدالله بن سلام مَقْدِمَ النبي ﷺ المدينة، فأتاه ...)

واتە: (عبدالله)ی کوڕی (سلام) هەواڵی پێ گەیشت کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتۆتە شاری مەدینە، - واتە لە سەرەتای کۆچکردنییەوە لە مەککەوە بۆ مەدینە - ئەویش هات بۆ خزمەتی و سێ پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردو گوتی: ئەو پرسیارانە تەنیا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وەڵامەکانیان دەزانن، جا پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دانەوەو لە ئەنجام دا (عبدالله) مسوڵمان بوو و گوتی (أشهد انك رسول الله) شایەدیی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوای، (ثم قال يا رسول الله ان اليهود قوم بُهْت، إن علموا بإسلامي قبل أن تسألهم بَهَتوني عندك، فجاءت اليهود و دخل عبدالله البيت، فقال رسول الله أيّ رجل فيكم عبدالله بن سلام، قالوا: أعلمنا وابن أعلمنا وأخيرنا وابن أخيرنا، فقال رسول الله ﷺ أفرأيتم إنْ أسلم عبدالله، قالوا أعاذه الله من

ذلك، فخرج عبدالله اليهم فقال أشهد ان لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وأشهد ان مُحَمَّداً رسول الله، فقالوا شَرُّنا وآبن شرِّنا و وقعوا فيه)(171)

(عبدالله) پاش مسولّمان بوونی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (یهود) قەومێکی زۆر بوختان کەرن، وە ئەگەر بزانن من مسولّمان بووم پێش ئەوەی لێیان بپرسی هەر لە خۆوە کەم و کوڕیی و ناتەواوی پالّ دەدەنە لام (مەبەستی عبدالله ئەوە بوو کە ئەی پێغەمبەری خوا جولەکەکان بانگ بکەو دەربارەی من پرسیاریان لێ بکە کە من کێم و لە نێویان دا چۆنم) ئینجا جوولەکەکان (یهود) هاتن بۆ لای پێغەمبەر و (عبدالله) چووە ژوورێکەوە بۆ ئەوەی نەیبینن و نەزانن کە لەوێ‌یە و مسولّمان بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ لێیانی پرسی کە (عبدالله)ی کوڕی (سلام) چ جۆرە کەسێکە لە نێوتان دا؟، گوتیان لە هەمووانمان زاناترە و کوڕی گەورەترین زاناشمانە وە لە هەموومان باشترە و کوڕی پیاو چاکترینمانە، پێغەمبەری خوا فەرمووی ئەدی ئەگەر (عبدالله) مسولّمان بوو ئێوە دەلّێن چی وڕاتان چۆن دەبێ؟،گوتیان: خوا چەپالّەی بدات لە مسولّمان بوون و بیپارێزێ، (عبدالله) هات بۆ لایان و گوتی: (أشهد ان لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وأشهد ان مُحَمَّداً رسول الله) شایەتمانی هێنا، جا جووەکان هەر لەو دانیشتنەدا ،گوتیان: پیاو خراپترینمانە و کوڕی پیاو خراپترینیشمانە، وە تا پێیان کرا زەمیان کرد و خراپەیان پالّ دایە لای !

(171) البخـاري.

لێرەدا دەرکەوت کە (عبدالله)ی کوڕی (سلام) بە چی مسوڵمانەتی خۆی ئیعلان کردوە؟ بە شایەتمان هێنان، کەواتە ڕاستە شایەتمان دەروازەی هاتنە نێو ئیسلامە.

(ابن تیمیة)ش ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەو بارەوە گوتوویەتی: (وقد عُلِمَ بالإضطرار من دين الرسول ﷺ واتفقت الأُمة عليه أن أصل الاسلام وأول ما يؤمر به الخَلْقُ شهادة ان لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ وان مُحَمَّدا رسول الله، فبذلك يَصير الكافِرُ مسلما والعدو ولياً والمباحُ دمُهُ ومالُه مَعْصوم الدم والمال، ثم ان كان ذلك من قلبه فقد دخل في الإيمان، وان قاله بلسانه دون قلبه فهو في ظاهر الاسلام دون باطن الايمان)(172)

واتە: لە (دین)ی پێغەمبەردا ﷺ زۆر بە ئاشکرا زانراوە و ئۆممەت هەمووی لەسەری یەك دەنگە کە ئەصلی ئیسلام و یەکەمین وشە کە دەبێ خەڵکی بۆ بانگ بکرێ بریتی یە لە (شایەتمان) هێنان جا هەر کەسێك شایەتمانی هێنا ئەگەر کافر بێ دەبێتە مسوڵمان، ئەگەر دوژمن بێ دەبێتە دۆست، وە ئەگەر هەتا ئێستا خوێن و ماڵی لە کاتی جەنگ دا ڕەوا بووە بۆ مسوڵمانان، ئەوە لە مەودوا خوێن و ماڵی قەدەغە دەکرێ، ئینجا ئەگەر لە دڵی یەوە گوتبێتی ئەوە وەك چۆن هاتۆتە نێو ئیسلامەوە هاتۆتە نێو ئیمانیشەوە، ئەگەر هەر سەر زارەکیش بووبێ ئەوە نەچۆتە نێو ئیمانەوە بەڵام هاتۆتە نێو ئیسلامەوە (وەك کابرایەکی (منافق) کە لە دڵ دا کافر و بە ڕواڵەت مسوڵمانە).

(172) تيسير العزيز الحميد لاپەڕە (127).

دووەم: هەرچی شایەتمان هەڵبوەشێنێتەوە هەمیشە ئیمانیش هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام مەرج نیە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان هەموو جارێ شایەتمان هەڵبوەشێننەوە:

ئەم بنچینە (قاعدة)یە یەکێکە لەو بنچینانەی کە زانا و پێشەوایان لەسەریان پێکهاتوون و لە ئەنجامی تێوەڕامان (استقراء)ی سەرجەم دەقەکانی قورئان و سوننەتەوە کە لەو بارەوە هاتوون، پێی گەیشتوون.

جا ئێستاش با تۆزێك تیشکی بخەینە سەر:

گوتمان شایەتمان یەکێکە لە چوار پێکهێنەرەکانی ئیمان، کەواتە ئاشکرایە کە هەرچی شایەتمان هەڵبوەشێنێتەوە ئیمانیش هەڵدەوەشێنێتەوە. چونکە مادام شایەتمان یەکێك بێ لە پێکهێنەرەکانی ئیمان دیارە بە هەڵوەشانەوەی وی ئیمانێکیش کە لێی پێکهاتوە هەڵدەوەشێتەوە.

ئینجا شایانی باسیشە کە شایەتمان بە دوو جۆرە شتان هەڵدەوەشێتەوە:

یەکەم: قسەی زار - هەروەها نووسینیش -.

دووەم: کردەوەی ڕواڵەتی ئەندامەکان.

کەواتە: بابای مسوڵمان و خاوەن شایەتمان هەر کات کوفر و شیرکێکی بە دەم دا هات - یان نووسی - یان کردەوەیەکی ئەنجام دا کە بە کوفر و شیرك دادەنرا ئەوە (پاش چەسپاندنی بنچینەی: هاتنە دی مەرجەکان و لاچوونی پەرچەکان)[173] شایەتمان و مسوڵمانەیتیەکەی بە هەڵوەشاوە دادەنرێ .

بەڵام مەرج نیە هەر شتێك ئیمانی هەڵوەشاندەوە شایەتمانیش هەڵبوەشێنێتەوە، چونکە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان (نواقض الايمان) چوار

---

(173) دواتر باسی بنچینەی : (ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) دەکەین.

جۆرن، دوو جۆریان پەیوەندییان بە دڵ و دەروونەوە هەیە و هیچ کەس لێیان ئاگادار نیە و هیچکەس بۆی نیە حوکمیان لەسەر بینا بکات و بۆی نیە بڵێ: فلان کەس ! تۆ بە دڵ خوات خۆش ناوێ و کافری ! یان بڵێ: دەزانم تۆ بە دڵ ئیسلام بە ڕاست نازانی !!

ئەدی حوکم لەسەر چی بنیات دەنرێ؟! زانایان کردوویانە بە بنچینە (قاعدة)و دەڵێن: (نحن نحكم بالظاهر والله يتولـى السرائر) "ئێمە حوکم بە ڕواڵەت دەکەین وپەنهان و شـــێردراوە حـــەواڵەی خوایە" واتە: ئێمە تەنها حەقمان بەسەر ئەوە دایە کە دەبیینین یان دەبیستین بەڵام ئەوەی کە نایبینین و نایبیستین خوا دەیبینێ و دەیبیستێ و تەنها هەقی خۆیەتی کە لە دوا ڕۆژدا چۆن حوکم دەدات.

بەڵام لێرەدا مەسەلەیەکی گرنگ هەیە پێویستە لــێی ئاگادار بین:

کە دەڵێین هەر شـــتێك ئیمان هەڵبوەشــێنێتەوە مەرج نیە شایەتمان هەڵبوەشــێنێتەوە ئەوە لە بواری حوکمـــــی دنیایــــی دایە کە ئێمە لــێی ئاگادارین، بەڵام بە نسبەت دوا ڕۆژ و لای خوای پەروەردگارەوە بێ گومان هەر شتێك ئیمان هەڵبوەشێنێتەوە حەتمەن شایەتمانیشی هەڵوەشاندۆتەوە.

ئێســـــتاش دوای خستنە ڕووی ئەم دوو ڕوون کردنەوەیە با بچینە سەر ئەسڵی مەبەست و بزانین: هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان (نواقض الايمان) چین ؟!

پێشتر باسمان کرد کە ئیمان بریتی یە لە: قسەی دڵ و کردەوەی دڵ وقسەی زمان وکردەوەی ئەندامەکان، ئینجا با ئەوەتان لەبەرچاو ڕوون بێ کە مەبەست لە: قسەی دڵ (قول القلب) زانینی عەقڵ و دڵ و بە ڕاست زانینیانە بۆ پایەکانی ئیمان، واتە: بە عـــەقڵ و دڵ بزانـــی کە خوا (سبحانە وتعالى) و

پێغەمبەر ﷺ و ئەوەی فەرموویانە هەقە، بیزانی و بە ڕاستیشی بزانی و بە دڵ دانی پێدا بێنی، وە مەبەست لە: کردەوەی دڵ (عمل القلب) قبووڵ کردنی هەموو ئەو شتانەیە کە عەقڵ و دڵ دەرکیان لە بواری عەقیدەدا پێ کردوە و بە ڕاستیان زانیوە، واتە: دەبێ هەرچی شەریعەت بە (ئیمان)ی داناوە قبووڵی بکەی و تەسلیمی بی و خۆشت بوێ.

وە مەبەست لە: قسەی زمان (قول اللسان) دان پێداهێنانی زمانە (إقرار اللسان) بە هەموو ئەو شتانەدا کە لە بواری ئیمان و عەقیدەدا عەقڵ و دڵ زانیویانن و بە ڕاستیان داناون و قبووڵیان کردوون. وە مەبەست لە: کردەوەی ئەندامەکان (عمل الجوارح) یش ئەنجامدان و ڕاپەڕاندنی ئەو ئەرك و کارانەیە کە دەبێ ئینسانی مسوڵمان پێیان هەستێ. وەك: نوێژ بەرپا کردن و ڕۆژوو گرتن و فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە و... هتد.

کەواتە: هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان و هۆکارەکانی کافر بوون و لە دین دەرچوون هەموو ئەو شتانەن کە دژ و پێچەوانەی یەکێك لە چوار پێکهێنەرەکانی ئیمانن.

کەواتە: هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان سەرجەم چوار جۆرن کە لەم چوار خاڵەی خوارێدا دەیانخەینە ڕوو. بۆ هەر جۆرێکیان خاڵێکی تایبەت تەرخان دەکەین و جاری واش هەیە هەر خاڵێك لە چەند بڕگەیەك دا دەخەینە ڕوو.

بەڵام پێویستە بگوترێ کە ئێمە مەرج نیە بتوانین سەرجەم تاکەکانی هەر کام لە چوار جۆرەکە بخەینە ڕوو، بەڵکو هەوڵ دەدەین ئاماژە بە وانەیان بکەین کە گەورەتر و بنەڕەتی ترن:

**1- جۆری یەکەم : ئەو شتانەی کە پێچەوانە و دژی (قسەی دڵ)ن:**

کە لەم حەوت بەشە سەرەکییانە پێك دێ:

**یــەك:** بە درۆ زانین (التکذیب):

وەك خوای کاربەجێ دەربارەی کافرەکان فەرموویەتی: ﴿ بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ﴾ (یونس -38) ، واتە: بەڵکو (کافرەکان) ئەو  قورئان - ە بە درۆ دەزانن کە زانیاریی یان لە بارەیەوە نیە و جارێ سەرەنجامەکەیشیان بۆ نەهاتۆتە دی، (واتە ئەو شتانەی کە قورئان هەواڵی پێداون لە بارەی دوا ڕۆژو حیساب و سزا و پاداشت).

کەواتە: بەدرۆ زانین (تکذیب)ی شتێك کە خوا فەرموویەتی، یان پێغەمبەری خوا ﷺ جۆرێکە لە جۆرەکانی کوفر، چونکە بە درۆ زانینی قسەی خوا(سبحانە وتعالـی) و پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاستەو ڕاست دژ و پێچەوانەی بە ڕاست زانینی دڵە و باسیشمان کرد کە بە ڕاست زانینی بە دڵی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی یەکەمین پێکهێنەری ئیمانە و هەر مسوڵمانێك یەکێك لە فەرمانەکان و فەرموودەکانی خوا(سبحانە وتعالی) وپێغەمبەرﷺ بە ڕاست نەزانێ و بە هەڵە و درۆ لە قەڵەم بدات، ئەوە ئیمانەکەی هەڵدەوەشێتەوە، بەڵام بە مەرجێك ئەو شتە بە ئاشکرا زانراو بێت، ئەگەر نا کەسێك بڵێ: ئەو فەرموودەیە ڕاست نیە وە مەبەستی ئەوە بێت کە فلانە قسەیە فەرموودەی پێغەمبەر نیە و هەڵبەستراو (موضوع) ە، ئەوە بەوە کافر نابێت، بەڵام وا باشترە بڵێ: ئەو فەرموودەیە کە دەڵێن فەرموودەی پێغەمبەرە ڕاست نیە و فەرموودەی وی ﷺ نیە.

بەلاّم ئەگەر بلّێ: دەزانم فەرموودەی پێغەمبەرە بەس ڕاست نیە ئەوە کافر دەبێت.

کەواتە: بە درۆ زانین (تکذیب) هۆکارێکە بۆ کافر بوون و هەلّوەشاندنەوەی ئیمان.

(**دووەم**): دان پێدانەهێنان (الجحود) : کە جیاوازیان لەگەلّ (تکذیب) دا هەیە، چونکە (تکذیب) ئەوەیە بلّێی فلاّن شتە ڕاست نیە، بەلاّم (جحود) ئەوەیە کە دەیزانی ڕاستە بەلاّم دانی پێدانەهێنی و نکوولّیی لێ بکەی لەبەر خۆ بە زۆر و زل گرتنی، وەك خوای بالاّ دەست دەربارەی کافرەکان فەرموویەتی: ﴿ **فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ** ﴾[174]

واتە:(ئەی موحەممەد !) ئەوانە تۆ بە درۆ نازانن، بەلّکو ئەو ستەمکارانە بڕوا بە ئایەتەکانی خوا ناکەن، واتە: هەرچەندە کە دەشزانن ئایەتەکانی خوا حەقن و تۆش پێغەمبەری خوای، بەلاّم دانی پێدا ناهێنن، کەواتە (جحود) یانی زانین و دان پێدانەهێنان.

(قاضي عياض) بە ناوی زانایانی ئوممەتەوە دەلّێ: (وكذلك نَقْطَعُ بتكفير كلِّ من كذَّب وانكر قاعدة من قواعد الشرع وما عُرِفَ يقيناً بالنقل المتواتر من فعل الرسول ووقع الإجماع المتصل عليه كمن أنكر وجوب الصلوات الخمس أو عدد ركعاتها وسجداتها)[175]

---

(174) الانعـام (33).

(175) ( الشفاء في التعريف بحقوق المصطفى ) ، بەرگی (2) لاپەڕە 1076–1077.

واتە: هەروەها بە تەئکیـــد حوکم دەکەین بە کـــــافر دانانی هەر کەسێك کە یەکێك لەو بنچینانەی شەرع بە درۆ بزانێ و نکوولّی یان لـێ بکات کە بە ئاشکرا زانراون، وە هەر شتێك کە بە شێوەی هەواڵێکی (متواتر)[176] بە ئێمە گەیشتبێ لە کردەوەی پێغەمبەر ﷺ وە یەك دەنگی زانایانی لەسەر دروست بووبێ، وەك ئەوەی ئینکاریی بکات کە پێنج نوێژەکان فەرزن، یان ئینکاریی ژمارەی ڕکاتەکانیان یان ژمارەی سەجدەکانیان بکات.

(نووي)یش لەو بارەوە گوتوویەتی:

(إنَّ مَنْ جَحَد ما يُعْلَمُ من دين الاسلام ضرورة حُكم بردتـــه و كفره الاّ أن يكون قريب عهد بالاســـلام أو نشـــأ ببادية بعيدة و نحوه ممّا يَخْفى عليه فيُعَرَّفُ ذلك فإن استمر حُكِمَ بِكُفْرِهِ)[177] دیارە (نەوەوی) وردتر و جوانتری هێناوەو دەڵێ: هەر کەسێك یەکێك لەو شتانەی کە لە دینی ئیسلام دا بە ئاشکرا زانراون دانی پێدانەهێنێ ئەوە بە هەڵگەڕاوە و کافر لە قەڵەم دەدرێ، مەگەر یان تازە مسوڵمان بێ، یاخود لە شوێنێکی بیابان و لاپەڕو دوور لە کۆمەڵگای ئیسلامی گەورە بووبێ، کە ڕاستییەکانی ئیســـــلام و یاساکانی لـێ پەنهان و شارراوە بوو بن، ئەوە لەو حاڵەتانەدا یەکسەر بە کافر دانانرێ، بەڵکو جوان ئەو مەسەلەیەی بۆ ڕۆشن دەکرێتەوە و تێی دەگەیەنرێ، جا

---

(176) هەواڵی موتەواتیر: بریتی یە لەوەی کۆمەڵێك کە نە گونجێ لەسەر درۆ کۆببنەوە هەواڵێك نەقڵ بکەن بۆ کۆمەڵێکی دیکە و ئاوا بە زنجیرە بڕوات.

(177) ( شرح صحيح مسلم )، بەرگی -1- لاپەڕە (128).

ئەگەر هەر بەردەوام بوو لەسەر ئینکاری کردنەکەی ئەو کاتە حوکمی (کفر)ی بەسەردا دەدرێ.

(**سێیەم**) :- بە حـــەڵاڵ زانینی گوناحێك یان حەڕامێك (اســـتحلال ذَنْبٍ أو مُحَرَّمٍ):

گوناح، وەك: زینا، قەتڵ، دزیی، حەڕام کراویش وەك: سووخۆریی، ڕێگریی، زوڵم، قومار..،(طحاوي) لەو بارەیەوە دەڵێ: (ولا نكفر أحداً من أهل القبلة بِذَنْب مالم يستحله)[178] واتە: وە ئێمە هیچ کام لە ئەهلی (قیبلە) بە کافر دانانێین بەهۆی کردنی گوناحێکەوە مەگەر گوناحەکە بە حەڵاڵ بزانێ، چونکە گوناح بە حەڵاڵ زانین دەچێتەوە نێو بە درۆ زانین (تکذیب)، (ابن قدامة)[179]ش هەمان مەسەلەی هەر بەو شێوەیە هێناوە هەروەها هەر کام لە (بغوي)[180]، وە (ملا علي القارئ)[181] ئەوانە هەموویان هێناویانە و گوتوویانە کۆڕا (اجماع)ی زانایان لەسەر ئەوەیە هەر کەسێك گوناحێـــك و حەڕام کراوێك بە حـــەڵاڵ بزانی پیِّی کافر دەبێ، بەڵام لێرەدا (ابن الوزير اليماني) تێبینی یەکی ورد دەخاتە ڕوو و دەڵێ: (ان المتواتر نوعان: احدهما ما علمه العامة مع الخاصة كمثل كلمة التوحيد و اركان الاسلام فكيفر

(178) شرح العقيدة الطحاوية / لاپەڕە (300).
(179) المغني  بەرگی (8) لاپەڕە (131).
(180) شرح السنة  بەرگی (1) لاپەڕە (103).
(181) شرح فقه الاكبر  لاپەڕە (126).

جاحده مطلقاً لأنه قد بلغه التنزيل، و ثانيهما مالا يَعْرِف تواتُرَهُ الاّ الخاصة فلا يكفر مُسْتَحِلُّه من العامة لانه لم يبلغه)(182)

واتە: تەواتور (التواتر) دوو جۆرە ، جۆرێکیان خەڵکی تایبەت و خەڵکی گشتی دەیزانن (زانایان و خەڵکی عەوام) وەك شایەتمان و ڕوکنەکانی ئیسلام جا ئەوەیان هەر کەسێك بڵێ بڕوام پێی نیە پێی کافر دەبێ.

جۆری دووەمی (تەواتور) ئەوەیە کە تەنیا زانایان دەیزانن ئەم جۆرەیان کە جگە لە کەسانی پسپۆر کەمتر وایە خەڵکی بیزانن، ئەوە ئەگەر بابایەکی (عوام) ئینکاریشی بکات پێی کافر نابێ. چونکە پێی نەگەیشتوە تێی نەگەیشتوە.

بە کورتی: ئینسان وەختێك بە ئینکاریی کردنی شتێکی ئیسلام کافر دەبێ ، کە بزانێ ئەو شتە (دین) ە و ئینکاریی بکات ، هەروەها (شیخ الاسلام ابن تيمية) ڕەحمەتی خوا لەویش و لەسەرجەم زانا و پێشەوایانی دیکەشمان بێ، ئەو مەسەلەیەی زۆر جوان ڕوون کردۆتەوەو لە چەند شوێنێکی (مجموعة الفتاوی)دا ئەو بەسەرهاتە باس دەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هـــــاوەڵانی گێڕاوەتەوە و (مسلم) لە (صحيح)ەکەی دا هێناویەتی، واتە بەسەرهاتی ئەو کابرایەی کە لەبەر (جهل)و نەزانین ئینکاریی صیفەتی (قدرة)ی خوای پەروەردگار دەکات کە بە کوڕەکانی دەڵـــــێ: ئەگەر مردم بم ســـــووتێنن و خۆڵەمێشـــــەکەم بە (بـــــا) دا بکەن نیوەی ڕووە و دەریا و نیوەکەی

---

(182) ( العواصم والقواصم في الذب عن سنة أبي القاسم ) بەرگی (4) لاپەڕە (173–174).

دیکەشی ڕووە و وشکانی چونکە زۆر گوناح بارم و نەبادا خوا زیندووم بکاتەوە و سزام بدات، ئەگەر وا بکەم زیندووم ناکاتەوە، کوڕەکانیشی وەسیەتەکەی بەجێ دێنن و بەو جۆرەی لــێ دەکەن کە پێی گوتوون. پاشان خوای بالا دەست (سبحانه وتعالــی) زیندووی دەکاتەوە و لــێی دەپرسێ: بۆچی وات کرد ؟! دەڵێ ئەی خوایە لە ترســـــی تۆ، خوای پەروەردگاریش لــێی خۆش دەبێ چونکە ئەوەندە لە خوا ترســـــاوە و شەرمی لــێکردوە لە پێش سەرە مەرگی دا.

سەیر بکەن! چونکە ئەو ئینکاریی کردنەی بە نەزانین (جهل) بووە پێی کافر نەبووە، بەلام هەڵبەتە عوزر بە (جهل) یش بۆ هەموو کەسێك نیە، بەس وا دیارە ئەو کابرایە دوور بووە و لە شوێنێکی وا بووە نەیتوانیوە کە (علم) فێر ببێ و هیچی پێ نەگەیشتوە، ئەگەر نا چۆن ئینکاریی صیفەتێکی خوا بکات و کافر نەبێ !!

(**چـــوارەم**): دوو دڵی وگومان (الشك)، لە یاســـایەکی خوادا، یاخود لە هەواڵێکی (وحی)دا: هەر هەواڵێکی (وحي) لە ڕێگـــای قورئان و سوننەتەوە بە ئێمە گەیشتبێت، یان هەر حوکمێکی خوای پەروەردگار کەسێك گومانودوو دڵــێی لە ڕاستیی وتەواویی یان دا هەبێ ئەوەش ئیمان و شایەتمان هەڵدەوەشێنێتەوە، بەلام هەڵوەشانەوەی شایەتمان بە حیسابی قیامەت نەك دونیا، چونکە ئێمە پێشتر چەندان دەقمان هێنایەوە لەسەر ئەوە کە یەکێك لە مەرجەکانی ئیمان بریتی یە لە دڵنیایی (یقین)ودڵ دامەزران، هەر بۆیەش خوای پەروەردگار دەربارەی

(منافقين) دەفەرموێ ﴿ إِنَّمَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَارْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴾[183]

واتە: ئەی موحەممەد! تەنیا ئەوانە مۆڵەت لە تۆ وەردەگرن کە نەچن بۆ جیهاد کە بڕوایان بە خواو ڕۆژی دوایی نیە و لە گومانی خۆیان دا هەر خەریکی هاتن و چوونن. کەواتە چونکە دەغەڵەکان گومانیان هەیە، بەو هۆیەوە ئیمانیان نیە هەروەها خوای زانا و پەنهـــان بین (سبحانه وتعالى) دەربارەی پێناسەی ئیمانداران فەرموویەتی:﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا... ﴾(الحجرات -15).

(**پێنجەم**): قەناعەت هەبوون بە بەشداربوونی غـــەیری خـــــوا لە بەدیهێنەرایەتی یان پەروەردگاریێتی یان لە پەرستراوێتی یان یەکێك لە ناو و ســـیفەتەکانی خوادا: هەر کەســـێك پێی وا بێت یەکێك لە دروســت کراوان (مخلوقات)ی خوا (سبحانه وتعالـى) بەشدارە لە بەدیهێنەرایەتی خوادا یان پەروەردگاریێتی خوادا یان لە پەرستراوێتی دا یا لە یەکێك لە ناو و سیفەتەکانی دا، ئەوە مانای وایە ئەو کەسە (قول القلب)ی هەڵوەشاوەتەوە و بە ڕاست زانینەکەی (تصدیق)ەکەی هەڵوەشاوەتەوە، بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەش دەڵێین: خوا تاکە پەروەردگارو بەدیهێنەرە، جا هەر کەسێك پێی وابێت غەیری خوا شـــتێکی بەدیهێناوە، دیارە غەیری خوای بەشـــدار کردوە لــە پەروەردگاریێتی و بەدیهێنەرایەتی خوادا، هەروەها تەنها خوا(ســـبحانەو تعالى) شیفا هێنە ﴿ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴾(الشعراء-80). بۆیە هەر کەسێك

---

(183) التوبة (45).

ئەگەر قەناعەتی وابێت کە پزیشکێك یان شێخێك بۆ خۆی ڕاستەوخۆ شیفا دەدا، ئەوە دیارە لە یەکێك لە سیفاتەکانی پەروەردگارێتی دا کە شیفاهێنانە مەخلوقێکی خوای بەشدار کردوە، هەروەها زانینی (غەیب) پەنها تایبەتە بە خـواوە: وەك فەرموویەتی: ﴿قُلْ لاَ يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ الْغَيْبَ إِلاَّ اللَّهُ..﴾(النمل–65) بۆیە هەر کەسێك پێی وابێ کە خۆی یان کەسێك غەیب زانە یان ئاگاداری دڵ و دەروونی خەڵکە، ئەویش هەمان حوکمی هەیە.

هەروەها لە بواری پەرستراوێتی خوا (الوهیة الله) دا هەر کەسێك یەکێك لەو شتانەی کە تایبەتن بە خواوە و تەنها بۆ وی ئەنجام دەدرێن وەك: لـێ پاڕانەوەو هاوار تێ بەستن (الدعاء والاستغاثة) و، ڕکووع و سەجدە بۆ بردن و، پشت پێ بەستن (التوکل) و ..هتد، بۆ غەیری خوا بکات، یان یەکێك لەو شتانەی لە غەیری خوا چاوەڕوان ناکرێن و بە موتڵەقی بە غەیری وی ناکرێن لە غەیری خوا چاوەڕێ بکات و داوا بکات وەك: دیاری کردنی حەڵاڵ و حەڕام سـەرکەوتن و ژێر کەوتن، ساغیی و نەخۆشیی... هتد. ئەوە ئەو غەیرەی لە پەرسـتراوێتی دا کردۆتە هاوبەشی خوا.

دیسان هەر کەسێك. کەسێك یان شـتێك لە یەکێك لە ناوەکانی خوا یان سیفەتەکانی دا بەشدار بکات و ناوێك یان سیفەتێکی خوای بۆ بەکار بێنێ، ئەوە دووچاری هاوبەشی بۆ خوا دانان (الإشراك بالله) بووە و ئیمانەکەی هەڵوەشاتەوە، هەر بۆیەش نەصڕانییەکان بە کافر و موشـریك دادەنرێن چونکە هەر کام لە (عیسی)و (روح القدس) و

(مريم) کە هەرسێکیان بەندەی خوان و دروست کراوو پەروەردەکراوی خۆینی، بە هاوبەشی خوا دادەنێن لە پەرستراویێتی دا، وەك خوای زانا و توانا فەرموویەتی:

﴿ لَقَدْ كَفَـرَ الَّذِيـنَ قَالُـوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلاَثَةٍ..﴾ (المائدة –73).

وە دەشتوانین بۆ جۆری هاوەڵ بۆ خوا دانان لە ناووسیفەتەکانی دا ئەو شیعرە نەفامیی یە بە نموونە بێنینەوە کە شاعیرێکی لاڕێ و موشریك بەرانبەر بە یەکێك لە حوکمڕانە تاغووتەکـــان و لە پێدا هەڵگوتنی دا گوتوویەتی:

ما شئت لا ما شاءت الأقدار فأحكم فأنت الواحد القهّار

واتە: ئەوەی تۆ دەتـــەوێ هەر ئەوە دەبێ نەك ئەوەی قەدەری خوا دەیەوێ، حوکم بکە هەر تۆی تاکی مل پێ کەچکەر !

وەك دەبینین شاعیری ماسـتاوچی کۆمەڵێك ناووسیفەتی خوای بێ وێنە وتاکی بۆ پادشایەکی تاغووتی بێ هێزو گوناهبار بەکارهێناون و خۆی دووچاری شیرك و کوفر کردوە.

(**شـەشـەم**) : قەناعەت هەبوون بەوەی کە کەسانێك هەن بۆیان هەیە بە شەریعەتی خواوە پابەند نەبن: ئەمانەش چەند جۆرێکن. جۆرێکیان بریتین لە (الباطنیون)، وە (باطني)یەکان کەسانێك بوون کە کاتی خۆی هەبوون و لە ئەصڵ دا بڕوایان بە (دین) نەبووە، بەڵکو هەر بە ڕواڵەت (ظاهر)خۆیان بە مسوڵمان نیشان داوە و کارێکیان کردوە کە بتوانن هەر لە ژێر پەردەی ئیسلام دا دینی مسوڵمانان تێك بدەن، هەستاون هەر کام لە ئەرکەکانی ئیسلام کە ئاشکرا و دیارن، وەك:

پێنج فەرزەی نوێژ و جیهـاد و زەکات و حەج و ڕۆژوو... هتد، هەر کام لە وانە مەفهوم و واتایەکی پەنهان (باطني)یان بە بێ هیچ بەڵگەیەك بۆ هەڵ تاشیون[184]، تاکو هەم سەر لە مسوڵمانان بشوێنن و هەم زەمینەی پابەند نەبوون و بێ بەند و بارییش بۆ خۆیان خۆش بکەن

جۆرێکی دیکەش لەوانەی قەناعەتیان ئاوایە و پابەند نەبوون بە شەریعەتیان پێ ڕەوایە، بریتین لە هەندێك لەوانەی کە لە ژێر پەردەی (طريقة) و (تصوف) سۆفـی گەریی دا بوون، کە چەند شتێکیان وەك (سفسطة) بە بەڵگە هێناوەتەوە لەسەر ئەو بیرە پووچەی خۆیان: بۆ وێنە ئایەتی ژمارە (99) لە کۆتایی سوورەتی (الحجر) کە خوای پەروەردگار ڕوو بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

﴿ وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ﴾

واتە: وە پەروەردگاری خۆت بپەرستە تاکو (يقين)ت بۆ دێ، کە مەبەست پێی مردنە، بەڵام ئەوان گوتوویانە : (يقيـن) واتە دڵنیایی کەواتە غایە و مەبەستی عیبادەت (يقيـن)ە و هەر کاتێك ئینسان (يقين)ی بۆ پەیدا بوو ئەوە گەیشتۆتە کۆتایی ئەو ڕێیەی کە لە عیبادەتەوە بۆی دەچێ وە پێویست ناکات چی دیکە خوا بپەرستێ !!، بەڵام بێگومان وا نیەو لێرەدا مەبەسـت لە (يقيـن) مردنە و لە قورئانیدا لە شوێنی دیکەش دا (يقين) بە مانای مردن هاتوە، بۆ

(184) بۆ وێنـە: گوتوویانە : ڕۆژوو گرتن بریتی یە لـە نەدرکاندنی نهێنییەکان – واتە نهێنیی یەکانی ئەو پیرە لارێیە ، وە حەج بریتی یە لـە سەردان و زیارەتی سەر گەورە و شێخەکەیان !!

نموونە خوای کاربەجێ لەسەر زمانی دۆزەخی یەکان دەفەرموێ:﴿ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ ،حَتَّى أَتَانَا الْيَقِينُ ﴾(185)

واتە: ئێمە بڕوامان بە دین (یاخود ڕۆژی دوایی) نەبوو، هەتا مردنمان گەیشتە سەر، لێرەدا ئەوە هەرگیز ناگونجێ (یقین) بە مانای (مردن) نەبێ، چونکە دواتر باسی (شـــفاعة) دەکات و دەفەرموێ، ﴿ فَمَا تَنْفَعُهُمْ شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ ﴾

واتە: ئێستاش تکای تکاکەران سوودیان پێ ناگەیەنێ، کەوابوو وشـــەی (یقین) لە: ﴿ وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ ﴾ دا بە مانای مردنە، وە دوێندراو لەم ئایەتەدا پێغەمبەری خوایە ﷺ، وەك لە سیاقی ئایەتەکان دا ئاشکرا و ڕوونە و ئایەتەکانی قورئان و ئەمر و نەهی یەکانیش پێش هەموو کەس ئاڕاستەی پێغەمبەر ﷺ کراون، ئینجا پێغەمبەری خواش دەبینین کە تاکو وەفاتی کردوە هەر لەسەر خوا پەرستی بەردەوام بووە، ئەگەر نا بێگومان پێغەمبەر ﷺ هەر لە یەکەمین هەنگاوەوە دڵنیایی (یقین)ی هەبووە.

جۆرێکی دیکەش لە پێڕەانی ئەو بیرۆکە پووچە کە لەم چاخ و سەردەمەی ئێمەدا سەریان هـــەڵداوە و پێشتر نەبوون یان بەو زەقییە نەبوون، ئەوانەن کە دەیانەوێ (ئیســـلام)یش وەك دینی شوێنراوی مەسیح عليه السلام لە جوغزی شەخسی و ڕووحی دا کورت هەڵبێنن و لایەنی حوکم و سیاسەت و ئابووریی و بگـــرە کۆمەڵایەتی و دادوەریشی لـێ

(185) المدثر (46-47).

دابڕنن وکەچ وکردووچی بکەن، ئەوانەش بە زۆر ناوونیشانی دەناسرێن بەلام عەلمانییەت و بێ دینایەتی هەموویان کۆ دەکاتەوە !

جا زانایان دەربارەی ئەو بیرۆکە و ڕێـــرەوە، کە دەڵێت: ئینسان بۆی هەیە یان کەسانێك بۆیان هەیە کە لە شـــــەرعی خوا دەربچن و پێوەی پابەند نەبن بە گشتی یان لە هــەندێك لە بوار و لایەنەکانی دا هەڵوێستیان ئاوایە:

1- (قاضي عیاض) ڕەحمەتی خوای لێ بێ کە زانایەکی (مالکی)یە دەڵێت: (اجمع المسلمون علی تکفیر من قال من الخوارج ان الصلاة طرفي النهار، وقول بعض المتصوفة : ان العبادة وطول المجاهدة اذا صفت نفوسهم افضت بهم الی إسقاطها و اباحة کل شـــــيء لهم ورفع عُهْدة الشرائع عنهم)(186) دەڵێت سەرجەم مســولّمانان یەك دەنگن لەسەر ئەوە کە هەر کەسێك ئەو جۆرە قسانە بڵێ: نوێژ کردنی فەرز تەنها بەیانیان و ئێوارانە لە (خوارج)ەکان (دیارە کاتی خۆی هەندێك لە (خوارج) هەبوون گوتوویانە: نوێژ تەنها دوو نوێژە، بەیانیان نوێژێك و ئێواران نوێژێك، ئەوەشیان بەو بیانووەوە گوتوە چونکە لە قورئانیدا ئاماژە بەوە کراوە کە بەیانیان نوێژ بکەن و ئێواران نوێژ بکەن بەلام هەڵبەتە مەبەست ئەوەیە کە ئێواران و بەیانیان یادی خوا بکەن،یان مەبەست ئەوەیە کە لە سەرەتاوە کە نوێژ فەرز بوو، بەیانیان نوێژێك وئێواران نوێژێك بووە بەلام دوایی لەو ئەندازەیەی پێشوو زیاد کراوەو وەك ئێستا کراوە بە پێنج فەرزە و کاتەکانیشیان بەم شێوەی ئێستا دیاری کراون)

---

(186) ( الشفاء في التعریف بحقوق المصطفی ) . بەرگی دووەم لاپەڕە (1074).

جا دەڵێ: ئێستا هەر کەســـێك بڵێ: تەنیا دوو نوێژ فەرزن پێی کافر دەبێت، بە کۆڕای سەرجەم مسوڵمانان، پاشان دەڵێت: قسەی هەندێك لە ســـۆفی یەکانیش کە دەڵێن: خوا پەرســـتی و زۆر کۆشش کردن و زۆر تاعەت کردن وا لە خاوەنەکەی دەکات کە نەفسی (صاف) بێتەوە و وای لـێ دێت کە عیبادەتی لەسەر لابچێ وهەموو شتێکیشی بۆ ڕەوا و حەڵاڵ بێ، وە پەیمانی پابەندیی بە شەرعەوەیان لە گەردن دا نەمێنێ (دەڵێ هەر کەسێك ئاواش بڵێ) ئەوە کافرە بە یەك دەنگی هەموو زانایـــــان.

2- (ابن تيمية) ش ڕەحمەتی خوای لـێ بێ پرسیاری لـێکراوە دەربارەی ئەو جۆرە کەسانەو پێیان گوتوە: کەســـانێك هەن کە دەڵێن (ان غاية التحقيق و كمال سلوك الطريق ترك التكليف وان العبد ليعمل حتى تحصل له المعرفة فإذا حصلت زال عنه التكليف)[187] واتە: گەیشتن بە ئەوپەڕی لێکۆڵینەوە و ڕێبازی بەرەو خوا چوون ئەوەیە کە تەکلیفی شەرعی نەمێنێت، وە بەندە هەر دەبێ تا ئەو ئەندازەیە خواپەرستیی و کاری چاك بکات تاکو مەعریفەت و یەقینی بۆ پەیدا دەبێ، جا کاتێك ئەوەی بە دەست هێنا تەکلیفی لەسەر نامێنێ، گوتوویانە کەسێك ئاوا بڵێ حوکمی چی یە؟!

(ابن تيمية) ش ئاوا وەڵامی داوەتەوە: (من قال هذا فانه كافر باتفاق أئمة اهل الاسلام فانهم متفقون على ان الامر والنهي جار على كل بالغ عاقل الى ان يموت) واتە: هەر کەسێك ئەو قسەیە بکات بە یەك

(187) مجموعـة الفتاوى – بەرگی (11) لاپەڕە (539).

دەنگی سەرجەم پێشەوایانی ئیسلام کافرە، چونکە هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن و ڕێك کەوتوون کە ئەمر و نەهی لەسەر هەموو ئینسانێکی بالغ وعاقڵ هەر فەرزن هەتا دەمرێ و هیچ کەسێك تەکلیفی شەرعی لەسەر لاناچێ لە هیچ حاڵێك دا مەگەر شێت یان بێ هۆش بێت.

**حەوتەم:** نەزانین (جهل) و بێ ئاگایی بەرانبەر بە هەر شتێك کە ئیمان پێ بوونی فەرزە:

ئەمیش هەر پەیوەندی بە (قول)ی دڵەوە هەیە واتە (تصدیق القلب) بە ڕاست دانانی دڵ، زانایان دەڵێن: هەر کەسێك نەزانین (جهل)ی بەرانبەر بە شتێك هەبێت کە زانیاری پێ بوونی پێویست بێ بۆ دروست بوونی ئیمان، ئەوە ئەو نەزانینیەی کوفرە، نەزانین (جهل)ی هەبێت دەربارەی یەکێك لە سیفاتەکانی خوا (سبحانه وتعالی) یاخود نەزانینی هەبێت بەرانبەر بە یەکێك لە سیفاتەکانی پێغەمبەر ﷺ، وەك ئەوە کە دەبێ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەموویان ئەمین وڕاست ڕاستگۆ بن وزۆر عاقڵ بن ولە گوناح پارێزراو (معصوم) بن، جا یەکێك پێی وابێ یەکێك لە پێغەمبەران یان پێغەمبەری خۆمان محمد ﷺ بۆی هەیە قسەی ناراست بکات، یان نەزان بێ، یان خائن بێت و ئەمین نەبێت، هەر کەسێك لە بەر نەزانیی و نەفامیی قسەی وا بکات ئەوە ئەو قسە و هەڵوێستەی (کفر)ە، بەڵام ئایا هەموو کاتێك کە ئینسان نەزانیی (جهل)ی هەبوو بەرانبەر بەو شتانەی کە پێویستن بۆ ئیمان یەکسەر کافر دەبێ ؟! لە وەڵام دا دەڵێین: نەخێر،

چونکە زانایان دەڵێن: بۆ بابای نەزان دوو حاڵەت هەن: ئەگەر لە شوێنێك بێت کە مسوڵمان نشین بێ یان لە نێو کەسانێك و شوێنێك بێت کە شەرعی تێدا زانراو بێت، ئەوە ئەو نەزانیی (جهل)ە دەبێتە هۆی کافر بوونی، بۆچی؟! دەتوانێ هەوڵبدات وفێر بێ و بزانێ، کەواتە هەمیشە نەزانین عوزر نیە بۆ هەموو کەس بەڵکو ئەو کەسە مادام حاڵی بەم شێوەیە بێت کە باسمان کردو دەستی بگاتە زانیاری و بتوانێ شارەزا بێ، نابێ خۆی لە نەزانیی (جهل)دا بهێڵێتەوە و دەبێ پرسیار بکات، بەڵگەشمان لەو بارەوە زۆرن، یەکیان فەرمایشتی خوا: ﴿ **فاسئَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ** ﴾[188] واتە: ئەگەرنازانن لە زانایان بپرسن، نەك بڵێ: نازانم کەواتە گوناحم ناگاتێ نەخێر، بەڵکو مادام کابرا بە ویستی خۆی لە نەزانینی (جهل)دا بمێنێتەوە ئەوە (کفر)ە.

بەڵام ئەگەر هات و ئەو کەسە لە شوێنێك بوو کە مسوڵمانانی لێنەبوون، یان مسوڵمانی نەزانی لێبوون کە بۆی نەدەلوا ئیسلامیان لێوە فێر بێت، یاخود شوێنێکە وا بوو کە بیروڕای نا ئیسلامی تێیدا باو بوو و ئەهلی شیرك و بیدعەتی بەسەردا زاڵ بوو، یان دوور لە وڵاتی مسوڵمانان بوو، ئەوە لەو حاڵەتانەدا بەهۆی ئەو نەزانین (جهل)ەوە یەکسەر حوکمی (کفر)ی بەسەردا نادرێت، بەڵکو ئیمان وئیسلامی بۆ ڕوون دەکرێتەوەو تێی دەگەیەنرێ ئینجا ئەگەر هەر بەردەوام بوو لە سەر بیروباوەڕ و قسەکەی خۆی ئەو کاتە حوکمی (کفر)ی بەسەردا دەدرێت.

---

(188) النحل (43) .

وە بەڵگەیەکی دیکەش بۆ ئەوە کە بیانووی نەزانیی (العذر بالجهل) قبووڵ نیە مادام بە ویستی خۆت تێیدا بمێنیەوە، بەڵکو پێی (کافر) دەبی، ئەم ئایەتەیە: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَى عَلَى الْهُدَى فَأَخَذَتْهُمْ صَاعِقَةُ الْعَذَابِ الْهُونِ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ [189]

واتە: وە (ثمود)مان هیدایەت دا و زانیاریمان پێ بەخشین، بەڵام ئەوان کوێریی و بێ ئاگایی یان بەسەر ڕۆشنایی و بەرچاو ڕوونی دا هەڵبژارد، ئینجا ئایا هەر لەبەر ئەوەی کە لە(جهل)دا مانەوە ڕزگاریان دەبێ؟! بێگومان نەخێر، دەفەرمووێ: بۆیە هەورە تریشقەی ئازارێکی ڕیسواکەر گرتنی لە سۆنگەی ئەوەوە کە وەدەستیان هێنا بوو.

ئینجا ئاشکراشە ئەوەی کە گەلی (ثمود) وەدەستیان هێنا بوو، بریتی بوو لە کـــوفر و لاڕێ بوون کە ئەویش زادەی ئەو کوێـــریی و نەزانیی (العُمْي والجهل)یە بوو کە هەڵیان بژارد بوو بەسەر ئیمان و هیدایەت و بەرچاو ڕوونیی، وەك خوا (سبحانه وتعالى) فەرموویەتی:

﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَى عَلَى الْهُدَى.. ﴾.

بەڵێ گەلی (ثمود) لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو ڕێڕوونییەی کە خوا بە پێغەمبەرەکەیان (صالح)دا ﷺ بۆی ڕەوانە کردبوون ڕەفزیان کرد و بێ ئاگایی و نەزانیی و نەفامیی یان بەسەردا هەڵبژارد، مۆری کوفریان بە نێو چاوانەوە نراو بە کافرو دوژمنی خواو پێغەمبەرەکەی ناوزەد کران !

سبحان ربك رب العزة عما يصفون. وسلام على المرسلين .

والحمد لله رب العالمين .

---

(189) فصلت (17) .

الحمد لله رب العالمین وصلی الله تعالی علی سیدنا محمد و اله اجمعین من الصّحب و الأزواج و القرابة و التابعین لهم بإحسان الـی یوم الدین.

بەڕێزان !

لە دەرسی پێشوودا باسی جۆری یەکەمی هەڵوەشێنەرەوەکانی شایەتمان و ئیمانمان کرد کە بریتی بوون لەو شتانەی دژو پێچەوانەی زانین وبە ڕاست زانین (معرفة و تصدیق)ی عەقڵ و دڵن، لەم دەرسـەش دا باسـی سێ جۆرەکانی دیکەی هەڵوەشێنەرەوەکان دەکەین کە هەموو ئەو شتانەن پێچەوانە و دژی کردەوەی دڵ و دان پێداهێنانی زمان و کردەوەی ئەندامەکانن و، سەرەتا باسی جۆری دووەمیان دەکەین:

## 2- جۆری دووەم : ئەو شتانەی کە پێچەوانە و دژی کردەوەی دڵن:

ئەو شتانەش بە گشتی پێنج بەشن:

**یەک: پشت گوێ خستنی ئیسلام ( الإعراض عن الإسـلام ) :**

مەبەستیش لە ئیهمال کردن و پشت گوێ خستنی ئیسلام ئەوەیە کە ئینسان لە ناخ ودڵ ودەروونییەوە واز لە ئیسلام بێنێ وگرنگی و بایەخی پێ نەدات و فەرامۆشـی بکـات و بە کەم سەیری بکات و بە هێندەی نەگـرێ.

بەڵگەش لەسەر ئەوە کە پشت گوێ خستنی ئیسلام و ئیهمال کردنی جۆرێکە لە جۆرەکانی کوفرو بابای کافری پێ لە کوفردا دەمێنێتەوەو

ئینسانی مسولمانیشی پێ کافر دەبێ و لە دین دەردەچێ چەندان دەقی قورئان و سوننەتن، بۆ نموونە خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ الْحَقَّ فَهُمْ مُعْرِضُونَ ﴾ (الأنبياء -34).

واتە: بەڵکو زۆربەیان - زۆربەی کافرەکان  هەق نازانن . جا پشتیان تێی کردوە و ڕوویان لێی وەرچەرخاندوە.

جا ئەگەر هەق نەناسین (لا يعلمون الحق) دژ و پێچەوانەی قسەی دڵ (قول القلب) بێت، ئەوە بێگومان پشت لە هەق کردن وئەمیەت و بایەخ پێنەدانی و گوێ بۆ نەگرتنی و هەوڵ نەدان بۆ شارەزا بوونی و پێ ئاشنا بوونی دژ و پێچەوانەی کردەوەی دڵ (عمل القلب)ەو، پێشتریش باسمان کرد کە هەر کام لە قسەی دڵ و کردەوەی دڵ پێکهێنەری ئیمانن و هەر شتێك لە گەڵیان دژ بوەستێ بە کوفر لە قەڵەم دەدرێ.

دوو: دەغەڵیی ( النفاق ) .

ئەمەش لەو شتانەیە کە دەبنە مایەی هەڵوەشاندنەوەی شایەتمان و ئیمان چونکە دژو پێچەوانەی کردەوەی دڵە ، کە من (دەغەڵیی) بۆ بەکار دێنم نەك دوو ڕوویی چونکە دوو ڕوویی (ذو الوجهين) یەکێك لە سیفاتەکانی (منافق)ە بەڵام بێگومان (نفاق) لە دوو ڕوویی دا کورت هەڵ نەهاتوەو مونافیقەکان سیفەتی دیکەی نزم و پەستیان زۆر زۆرن.

جا دەغەڵیی (نفاق)یش یەکێکە لەو کردەوانەی دڵ کە دژ و پێچەوانەی ئیمانی دڵ و کردەوەکانی دڵە ، چونکە (نفاق) ئەوەیە کە ئینسان بە ڕواڵەت خۆی بە مسولمان نیشان بدات بەڵام لە دڵی دا (کفر)

هەبێت، وەك خوای پەروەردگار پێناسەی دەغەڵەكان دەكات و دەفەرمووێ: ﴿ وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ ﴾[190]

واتە: وە هەندێك لە خەڵكی هەن دەڵێن ئیمانمان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە بەڵام بڕواداریش نین، ئا ئەوە پێناسەی ڕاستەقینەی (نفاق)ە.

بەڵگەشمان لەسەر ئەوە كە ئەوەی لە دڵی (منافق)ەكان دایە كوفرە ئەوەیە كە خوای پەروەردگار (سبحانە وتعالـى) دەفەرموێ:

﴿ يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَنْ تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُمْ بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ قُلْ اسْتَهْزِئُوا إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَا تَحْذَرُونَ ﴾[191]

واتە: مونافیقەكان مەترسی یان هەیە كە سورەتێك بێتە خوارێ هەواڵیان پێ بدات بەوەی كە لە دڵیان دایە (ئەی موحەممەد ﷺ پێیان بڵێ: گاڵتـــە بكەن (و لەسەر گاڵتـــە كردن و بە ســـووك سەیر كردنی خۆتان بەردەوام بن)، بێ گومان ئەوەی لـێی دەترسێن خوا لە دڵتان دەری دێنێ (و نیشانی مسوڵمانانی دەدات كەچی تێدایە !!).

بەڵێ جا ئەو كوفرە كە لە نێو دڵی دەغەڵەكان دایە دژو پێچەوانەی كردەوەی ئیمانیی دڵە و جۆرێكە لە نەخۆشیی وەك خوای زانا و پەنهان بین فەرموویەتی : ﴿ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمْ اللَّهُ مَرَضًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ﴾[192]

واتە: دڵیان نەخۆشیی تێدایە. خوا نەخۆشی یان زیاد بكـــــات و ئازارێكی بە ئێشیان هەیە بەهۆی درۆ كردنیانەوە.

---

(190) البقـرة (8) .

(191) سورة التوبة (64).

(192) البقــرة (10) .

لێرەدا (یکذبون) واتە: شتێك بە زمان دەڵێن کە پێچەوانەی ئەوەیە لە دڵیان دایە و دەری ناخەن.

**سێ: ڕق لێبوونەوەی یەکێک لەو شتانەی کە خوا (سبحانه وتعالی) بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دا ناردوونی:**

بەڵێ یەکی دیکە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان کە پێچەوانەی کردەوەی دڵن بریتی یە (ڕق لێ بوونەوەو بوغزاندنی شتێك لەو شتانەی کە پێغەمبەر ﷺ لە خواوە هێناونی) جیاوازی ئەم بڕگەیەش لە بڕگەی پێشوو بەم جۆرەیە:

(نفاق) ئەوەیە کە بابای دەغەڵ لە دڵ دا خواو پێغەمبەرەکەی و ئیسلام هەر هەمووی ببوغزێنی و هیچی قبووڵ نەبێ، بەڵام جاری وایە کابرا وا نیە بەس شتێك لەو شتانە دەبوغزێنێ و ڕقی لێ دەبێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە خواوە هێناونی.

جا ئەمەش دیسان هەڵوەشێنەرەوەی ئیمانە، بۆچی؟!، چونکە پێچەوانە و دژی تەسلیم بوون و قبووڵ کردن و خۆشویستنی دڵە کە ئەمانەش سەرجەم کردەوەی ئیمانیی دڵن، بەڵگەشمان لەو بارەوە ئەوەیە کە خوای پەروەردگار لە زنجیرە ئایەتێك دا کە باسی دڵ نەخۆشەکان دەکات دەفەرموێ: ﴿ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ ﴾[193]

واتە: بۆیە ئەوانە وان، چونکە ڕقیان هەڵ دەستێ لەوەی کە خوا ناردوویەتە خوارێ، بۆیە خوا کردەوەکانی هەڵوەشاندوونەوە، واتە هەرچەندە بابای دەغەڵ نوێژ و ڕۆژو و زەکات و حەج و جیهادیشی هەبێت - کە

---

(193) محمد (9).

(منافق)ەکان دەشــیان کردو دەشـــی کەن - بەڵام مادام ڕقـــــی لە یەك ئایەتیش بێت لەبەرئەوەی لەگەڵ ئارەزووی ئەو تێك ناکاتەوە، یان ڕقی لە یەك حوکمی شەرعی بێتەوە چونکە پێچەوانەی بەرژەوەندی یەکی ئەوە، ئەوە پێی کافر دەبێت.

کەواتە پێویستە وریا بین! جاری وا هەیە دوو کەس کێشەیانە و دەچن شەرع دەکەن وئەو کەسەی کە شەرع دەکات لە نێوانیان دا بە پێی شەرع دەڵێ حەقی فلان کەسە و حەقی تۆ نیە، جا ئەگەر ئەو بێ حەقە زۆر لە خۆی وریا نەبێ و خۆی کۆنتڕۆڵ (ضبط) نەکات شەیتان تووشی چۆرتمی دەکات، چونکە مادام دڵنیا بێ حوکمەکە شەرعیی و ڕاستە. ئەگەر بڵێ: بەم شەرعە ڕازی نیم چونکە نەیدا بە من، ئەوە بێ گومان بەوە کافر دەبێ، بەڵگەشمان لەو بارەوە ئەوەیە کە خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خۆی ﷺ دەفەرمووێ:

﴿ فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾[194]

واتە: نەخێر سوێند بە پەروەردگاری تۆ ئەوانە بە ئیمان دار لە قەڵەم نادرێن تاکو لەو شتانەدا کە تێیان دا دەکەونە کێشە و مشت و مڕەوە تۆ نەکەنە دادوەر، پاشان سەبارەت بە دادوەریی یەکەت و ئەو بڕیارەی داوتە هەســت بە هیچ جۆرە ســــەغڵەتییەك نەکەن و بە تەواویی ڕازی و گەردن کەچ نەبن.

وەك دەبینین خوای دادگەرو کاربەجێ (سبحانه وتعالــى) سێ شتی بە

(194) النساء (65) .

مەرج گرتوون بۆ بە مسوڵمان و بڕوادار لە قەڵەم دانی ئینسان:

**یەکەم: گێڕانەوەی کێشەو مشت ومڕەکانی- بە مەبەستی چارەسەر- بۆ** لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە مەبەست پێی شەریعەتەکەیەتیی و پاش خۆیشی هەر بەردەوامە.

**دووەم: هەست نەکردن بە هیچ جۆرە سەغڵەتیی و دڵتەنگییەك سەبارەت بە حوکمی شەریعەتی پێغەمبەری خوا و بڕیارەکەی.**

**سێیەم: ڕازی بوون و گەردن کەچ بوون بە خۆشحاڵییەوە.**

کەواتە: مادام خوای پەروەردگار (سبحانه وتعالى) سوێندی بە پەروەردگاریێتی (ربوبیة) ی خۆی خواردوە کە هەر کەسێك لە بەرانبەر حوکم و بڕیاری خواو پێغەمبەر ﷺ و شەریعەتی خوادا ئەوە هەڵوێستی نەبێ و ئەو سێ مەرجەی تێدا نەیەنە دی - هەرچەندە لافی مسوڵمانەتیی لێ بدات - بە مسوڵمان و بە ئەهلی ئیمان دانانرێ، مانای وایە ئەو مەسەلەیە کە خوای زانا و شارەزا (سبحانه وتعالى) ئاوا بە ڕوونی یەکلای کردۆتەوە و نوختەی تێدا خستۆتە سەر پیت، هیچ بواری کێشەو ڕاجیایی (اختلاف)و قسە لەسەر کردنی ئەم و ئەوی تێدا نەماوە و پێویستە ئەو مەسەلەیە وەك شتێکی ڕوون و بێ چەند و چوون و بەڵگە نەویست سەیر بکرێ.

ئێستاش با بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی مەبەست و چەمکی ئەو ئایەتە بە پێزە سەرنجی هۆی هاتنە خوارەوەی بدەین بە پێی ڕای ژمارەیەك لە توێژەرەوانی قورئان:

(السيوطي) لە کتێبی (لباب النقول في أسباب النزول)دا گوتوویەتی:

﴿أخرج الستة عن عبدالله بن الزبير ﷺ قال: خاصَمَ الزبير رجلاً من

الانصار في (شراج الحرّة)، فقال النبي ﷺ : إسقِ يا زبير ثم أرسل الماء الى جارك، فقال الانصاري: يا رسول الله ان كان ابن عمتك؟! فتلوَّن وجهه ثم قال: إسق يا زبير ثم احبس الماء حتى يرجع الى الجُدُر، ثم ارسل الماء الى جارك، و استوعب للزبير حقه، وكان اشار عليهما بأمرٍ لهما فيه سعة..﴾

واتە: هەر کام لە (بخاري ومسلم ونسائي وأبو داود و ترمذي و ابن ماجه) لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە گێڕاویانەتەوە کە گوتوویەتی:

زوبەیر لەگەڵ پیاوێکی ئەنصاریی (مەدینەیی) دەمەقاڵێی بوو لەسەر ئاودێری زەوییەکەی کە لە (شراج الحرّة) بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی زوبەیر تۆ زەوییەکەت ئاو بدە پاشان ئاوەکە بەربدەوە بۆ دراوسێیەکەت. کەچی ئەنصارییەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! هەر لەبەر ئەوەی زوبەیر- کوڕە پورتە؟! پێغەمبەریش ﷺ - بەهۆی بیستنی ئەو قسە نەفامانەیەوە- دەم و چاوی گۆڕا و پاشان فەرمووی: ئەی زوبەیر زەوییەکەت ئاودێر بکەو ئاوەکە بگرە هەتا پەنداو دەداتەوەو دەگەڕێتەوە بن دیوارەکان - ی کشتوکاڵەکەت- ئەوجار ئاوەکە بەربدەوە بۆ دراوسێیەکەت، وە ئەمجارە هەقەکەی زوبەیری بە تەواوی دا، چونکە پێشتر فەرمانەکەی بە جۆرێك بوو کە بۆ هەردووکیان باش بوو- وە خاتری کابرای ئەنصاریی گرتبوو و بڕێکی لە هەقی زوبەیر بۆ داشکاند بوو- .

شایانی باسیشە کە ڕاڤەکەران ولێکدەرەوانی فەرمایشت (شُرّاح الحديث) لێرەدا گوتوویانە:

هەرچەندە قسەکەی کابرای مەدینەیی زۆر خراپە و لە کوفرەوە نزیکە، چونکە کابرا پێی وابێ پێغەمبەر ﷺ خاتری کوڕە پوورەکەی خۆی دەگرێ و ناهەقی بۆ دەکات و هەقی خەڵکی پێ دەدات مانای وایە بڕوای بە عەدالەتی

پێغەمبەر ﷺ نیە دیارە کەسێکیش بڕوای وابێ ئەگەر کافریش نەبوو بێ، لە کوفرەوە نزیکە، ئینجا وەنەبێ پێغەمبەر ﷺ لە ئەنجامی تووڕەیی و لە کاردانەوەی ئەو قسە بێجێیەی کابرای مەدینەیی وای فەرموو بێ، بەڵکو پێشێ کەمێك لە هەقی(زبیر)ی داشکاندوە بۆ کابراو فەرموویەتی خێرا ئاودانەکە تەواو بکەو هەر چۆنێك بێت تێکـــی پەڕێنە تاکو ئاودێری یەکەی کابراش دوانەکەوێ، بەڵام دوایی کە کابـــرا ڕازی نەبووە بە هەق، واتە: کە بە (فضل) ڕازی نەبووە بۆی کردۆتە (عدل)، چونکە لە پێش دا پێغەمبەر ﷺ وەك خاتر گرتنێك وموراعاتێك ویستویەتی (فضل)و چاکەی لەگەڵ بەکار بێنێ و(زبیر) چاکەی بەسەری یەوە هەبێ، بەڵام کابرا چاکە (فضل) کەشی بە زوڵم زانیوە بۆیە پێغەمبەر ﷺ چاکەکەی لـێ وەرگرتۆتەوەو هاتۆتەوە سەر داد (عدل)، (داد)یش ئەوەیە کە کـــــێ لە ئاوەکە نزیکتـرە ئەو پێش دا بە تەواوی کشتوکاڵەکەی ئاو بدات و دوایی بەری بداتەوە بۆ ئەوەی کەوتۆتە خوارێ.

بەڵام پێویستە لێرەدا ئەو ڕاستی یە بزانین کە ڕق لـێ بوونەوەی ئیمانیی و عەقیدەیی لەگەڵ ڕق لـێ بوونەوەی سروشتی جیاوازە، چونکە (الكره الفطري) ڕق لـێ بوونەوەی سروشتی بۆ هەندێك لە ئەرکە شەرعی یەکان ئینسانی پێ‌ی کافـــر نابێ و بگرە گوناحبـــاریش نابێ، بەڵام ڕق لـێ بوونەوەی عەقیدەیی ئینسانی پێ گوناهبار و بگرە پێ کافریش دەبێ.

بەڵگەشمان لەسەر هەبوونی جیاوازی لە نێوان ئەم دووانەدا ئەوەیە کە لە باسی جەنگ و جیهاددا خوای پەروەردگار دەربارەی موونافیقەکان دەفەرموێ:

﴿ فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلاَفَ رَسُولِ اللَّهِ وَكَرِهُوا أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ (195)

واتە: ئەوانەی کە بەجێ هێڵڕا بوون لە پاش پێغەمبەری خوا دڵخۆش بوون بە بەجێ هێڵرانیان ﴿کە نەچوون بۆ جەنگی (تەبووك) لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ﴾ وە پێیان ناخۆش بوو کە بە ماڵ و گیانی خۆیان لە پێناوی خوادا جیهاد بکەن.

بەڵگەشمان لەسەر ئەوە کە ئەو پێ ناخۆش بوونەی بەجێ هێڵراوەکان بە جۆرێك لە کوفر دانراوە ئەوەیە کە سیاقەکە دەربارەی دەغەڵەکان دەدوێ و دیارە ئەوانیش وەك عەقیدە رقیان لەو جەنگ و جیهادە بووەو پێیان ناخۆش بووەو، بێگومان ئەوەش کوفرە.

بەڵام ئایەتی دیکەمان هەیە کە خوای پەروەردگار تێیدا بە هەموو مسوڵمانان دەفەرموێ جەنگ و جیهادتان پێ ناخۆشە :

﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُمْ ﴾

واتە: جەنگتان لەسەر پێویست کراوەو لەسەر دڵتانیش قورس و ناخۆشە، پاشان دەفەرموێ :

﴿ وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ ﴾(196)

---

(195) التوبة (81) .

(196) البقرة (216) .

واتە: وە ڕەنگە جاری وایە شتێکتان ڕق لێ بێت بەڵام خێری ئێوەی تێدا بێ، هەروەها جاری وایە شتێك حەزی لێ دەکەن بەڵام زیانی خۆتانی تێدایە، وە خوا دەزانێ و ئێوە نازانن.

دیارە ئەو پێ ناخۆش بوونەی دووەمیان شتێکی خوارسك و سروشتی یە چونکە بێگومان هەموو کەس پێی ناخۆشە بکوژرێ و بریندار بێ و خێزانی بێوەژن و منداڵی هەتیو بێ، یان گیرۆدەی ئەشکەنجە و ئازار و نارەحەتی بێ.

جا ئەو جۆرە پێ ناخۆش بوونە سروشتی (فطري)یە ئینسانی پێ کافر نابێ و بگرە پێشی گوناحبار نابێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو حەز لێ نەکردن و پێ ناخۆش بوونە شتێکی عەقیدەیی نەبێ، وەك ئیمان و عەقیدە دەبێ پێت خۆش بێ لە ڕێی خوادا جەنگ وجیهاد بکەی و خوات لێ ڕازی بێت، بەڵام ئەگەر لە دڵ دا پێت ناخۆش بێ زەرەر بکەی و بکوژرێی و بریندار بی و شەل و سەقەت و کۆڵەوار بی، ئەوە هیچ زیانی نیە چونکە ئینسان بە فیترەت حەز لە قازانج و چاکە و خێر دەکات و زەرەر و نارەحەتی پێ ناخۆشە.

هەر لێرەشەوە دەڵێین: بێگومان بۆ ڕاست تێگەیشتنی قورئان پێویستیمان بە قووڵبوونەوە هەیە و نابێ ئینسان بە سەرکێڵی سەیری هەندێك لە ئایەتەکان بکات و وابزانێ دژ بە یەکن و نارێکیان لەگەڵ یەکتردا هەیە بۆ وێنە: خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِي إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾[197]

واتە: جا لە کافرەکان مەترسن و لە من بترسن ئەگەر ئیماندارن، کەواتە: هەر کەسێك لە کافران بترسێ ((بە پێی چەمکی پێچەوانەیی (مفهوم

(197) آل عمران (175) .

المخالفة)ی ئەم ئایەتە)) ئەوە ئیماندار نیە !! بەڵام دەبینین کە پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەك (موسی) ﷺ لە بەرانبەر جادووی جادووگەرەکانی فیرعەون دا ترسی هاتۆتە نێو دڵ وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُوسَى ، قُلْنَا لاَ تَخَفْ إِنَّكَ أَنْتَ الأَعْلَى﴾[198]

ئینجا مووسا ترسێکی هاتە نێو دڵ، پێمان گوت : مەترسە. هەر تۆ زاڵ دەبی، هەروەها لە کاتێك لە نەخافڵ مارێك یان دڕندەیەکت لـێ ڕادەپەڕێ، یان بە بەردەمت دا ڕەد دەبێ ودەترسی، یان کۆمەڵێك دوژمن لێت لە کەمین دان و لێیان دەترسێی، ئایا ئەوە پێچەوانەی ئایەتەکەی پێشووە؟! بێ گومان نەخێر، بۆچی؟ چونکە ئەو ترسەی کە لە ئایەتی یەکەمیان دا باس کراوە مەبەست پێی ترسێکی عەقیدەیی یە، واتە وایان لێ مەترسن کە پێتان وابێ ڕزق و ئەجەلیان بە دەستە، بەڵام ئەوەی دیکەیان ترسێکی خوارِسك (فطري) و سروشتی یە کە هەموو کەس ئەو حاڵەتانەی هەیە.

هەڵبەتە بەهۆی زیاد بوون وکامڵ بوونی ئیمانەوە ئەو حاڵەتانەش کەم و زۆر سووك دەبن یان تا ڕاددەیەکی زۆر لادەچن، بەڵام ئەگەر بشمێنن ئەوە پێچەوانەی ئیمان نیە و ئیمانیان پێ هەڵناوەشێتەوە.

**(چوار) قبووڵ نەکردن و خۆ بە زل گریی و مل نەدان بۆ پابەندیی بە شەریعەتەوە (عدم القبول والاستكبار وعدم الإذعان):**

ئەمیش یەکێکی دیکەیە لەو هەڵوەشێنەرەوانەی ئیمان کە پێچەوانەی کردەوەی دڵـن و دژینی.

وەك خوای بەرز و مەزن دەربارەی (إبلیس) فەرموویەتی:

(198) طـه (67–68) .

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُوا لآدَمَ فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنْ الْكَافِرِينَ ﴾ (199)

واتە: وە یاد بکەوە کاتێك بە فریشتەکانمان گوت: کڕنووش بۆ ئادەم بەرن (دیارە کڕنووشـــی ڕێز و حورمەت لــێ گرتن، ئەگەر نا کڕنووشی پەرستن تەنیا بۆ خوا دەبردرێ) ئینجا یەکسەر هەموویان کڕنووشیان برد جگە لە ئیبلیس قبووڵی نەکـــرد و خۆی بە زل گرت، وە لە کافران بوو. (واتە چووە ڕیزی کافرانەوە لە سۆنگەی ئەو هەڵوێستەیەوە).

کەواتە: خۆ بە زل گرتن لە بەرانبـــەر شـــــەریعەتی خواداو قبووڵ نەکردنی فەرمانەکانی خوا (سبحانە وتعالی)وە مل نەدان بۆ جێبەجێ کردنیان و پێوە پابەند بوونیان مایەی کافربوونی ئینســانە و دیارە.

ئەوەش پێچەوانەی کردەوەی دڵە. چونکە کردەوەی دڵ بریتی یە لە قبووڵ کردن وخۆ بە کەم گرتن لە بەرانبەر شەریعەت وبەرنامەی خوادا، بە شێوەیەك کە شەریعەتی خوا لە سەرووی هەوا و ئارەزووی خۆت دابنێی، کەواتە ئەمیش یەکی دیکەیە لە جۆرەکانی هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان.

**پێنـج : هاوبەش بۆ خوا دانان لە مەبەستی پەرستن و لە خۆش ویســـتن و بە گەورە گرتن و گەردن کەچی دا:**

جۆرێکی دیکەی هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان کە دژی کردەوەی دڵن، بریتی یە لە هاوبەش بۆ خوا پەیدا کردن لە :

1- نیاز و مەبەستی پەرستن (النية وقصد التعبد) .

(199) البقـرة (34) .

2- خۆش ویستن (الحب) .
3- بە گەورە گرتن (التعظیم) .
4- گەردن کەچی (التسلیم) .

واتە: هەر کات لە یەکێك لەو چوارانەدا ئینسان شتێکی بۆ غەیری خوا بێت بەو شێوەیەی کە بۆ خوایە ،یانی بەو شێوەیەی کە بۆ خوا پێویستە ، ئەوەش دیسان یەکێکی دیکەیە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان چونکە پێچەوانە و دژی کردەوەی دڵە.

جا ئێستا با تۆزێك تیشکیان بخەینە سەر و ڕوونیان بکەینەوە:

1- نیاز و مەبەست بوون (النیة والقصد): بۆ نموونە: ئەگەر بێت و کەسێك دوو ڕکات نوێژ بۆ خوا بکات بەڵام وەك ئەوە دوو ڕکاتیش بۆ کەسێك بکات و بە تایبەت بۆ ئەوو هیچ مەبەستی پێ خوا نەبێ، بێ گومان ئەوە پێی کافر دەبێ یان کڕنووش (سجدة) کە تەنها بۆ خوا دەبردرێ، کابرا بچێ بە تایبەت و بە دڵ بۆ غەیری خوای بەرێ و هیچ بەشی خوای پەروەردگاری پێوە نەبێ بەوەش ئینسان کافر دەبێ، هەروەها هەر شتێکی دیکـــــە و هەر کردەوەیەکی دیکە کە لە نێوان بەندە وخوادا دەکرێن و تایبەتن بە خواوە هەمان حوکمی هەیە.

بەڵام لە بواری هەڵس و کەوتەکان (المعاملات)دا بەو جـۆرە نیـــــە و حوکمی جیایە ، بۆ نموونە: کابرا دەعوەتێك دەکات بە تایبەت بۆ کەسێك و میوانێك، لێرەدا ئەگەر مەبەستیشی خوا نەبێ، پێی کافر نابێ، بەڵێ پاداشتی نابێ بەڵام کافریش نابێ، بەڵام ئەو شتانەی کە لە نێوان بەندە و خوادان وەك نوێژ کردن وڕۆژوو گرتن وهتد ئەگەر کابرا ئەصڵەن لە دڵ دا

مەبەستی پێ خوا نەبێ و لەبەرئەوەی بێ خەڵك بە پیاوی چاكی بزانێ، ئەوە لە نێوان خۆی وخوادا پێی كافر دەبێ با خەڵكیش پێی نەزانێ بەڵام وەك گوتمان ئەم مەسەلەیە تایبەتە بەو شتانەوە كە لە نێوان ئینسان و خوادا دەكرێن كە زانایان زاراوەی (العبادات) یان (العبادات المحضة) یان بۆ بەكار هێناون. بەڵام ئەو شتانەی كە زانایان زاراوەی (المعاملات) یان بۆ بەكارهێناون وپەیوەندییان بە لایەنەكانی خێزانیی وكۆمەڵایەتی و سیاسی یەوە هەیە، وێڕای هەڵسوكەوتە شەخسی وتایبەتییەكانی ئینسان لە بواری خـــواردن و خواردنەوە و پۆشـــاك و خەوتن و... هتددا، ئەوە حوكمیان جیایە.

ئینجا بەڵگەش لەســەر ئەوە كە پێویستە خوا پەرســـتییەكان (العبادات) تەنها و تەنها بۆ خوا (سبحانه وتعالـی) بكرێن و هەر كات بابای مسوڵمان بۆ غەیری خوا بیانكات، ئیمانەكەی پێ هەڵدەوەشێتەوە ئەوەیە كە خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ﴾[200]

واتە: وە خەڵكی فەرمانیان پێ نەكراوە بەوە نەبێ كە بەندایەتیی بۆ خوا بكەن و مل كەچی خۆیان بۆ خوا ساغ بكەنەوە، كەواتە: كە تۆ لەو بەندایەتی یەدا كە تەنهــا بۆ خوا دەكرێ، بەشـــی غەیری خوات ڕەگەڵ خست و مەبەستەكەت غەیری خوا بوو، مانای وایە ئەو نیاز و مەبەستە لە پەرســتن دا كردەوەكەی دڵی هەڵوەشـــاندۆتەوە و یەكێـــك لە چوار پێكهێنەرەكانی ئیمانی فەوتاندوە.

---

(200) البينـــة (5) .

3- خۆش ویستن : خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ:

﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ ﴾[201]

واتە: وە ئەوانەی ئیمانیان هەیە خۆشەویستی یان بۆ خوا بەهێزترە لە هەر خۆشەویستییەك.

کەواتە: ئەگەر بە ئەندازەی ئەوەی کە خوات خۆش دەویٚ شتێکی دیکەت خۆش ویست یان لە خواش زیاترت خۆش ویست، ئەوە دیارە هاوبەشت بۆ خوا داناوە لە خۆش ویستنی دا و سەرەنجام یەکێك لە پایەکانی ئیمانت ڕووخاوە.

3- بە گەورە گرتن وبە بەرز گرتن: مسولْمان دەبیٚ خوا (سبحانە وتعالی) لە هەموو شت و هەموو کەسێك زیاتر بە گەورە و بەرز بگریٚت، وەك خوا (سبحانە وتعالی)فەرموویەتی: ﴿ سَبِّحْ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى ﴾[202] واتە: ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزت بە پاك بگرە، هەر بۆیەش لە نوێژدا ئەم سێ وشانە زۆر جار دووبارە دەبنەوە: (الله اكبر، سبحان ربي العظيم، سبحان ربي الأعلى)، چونکە نوێژ ئەوپەڕی بەندایەتی یە بۆ خواو دەبیٚ بە بەرزو مەزن وگەورە گرتنی خواشی زۆرجار تیٚدا دووبارە بێتەوە جا هەر کەسێك غەیری خوای وەك خوا (سبحانە و تعالی) بە بەرز وگەورەو مەزن گـــرت یان لەویش زیاتر!!، ئەوە ئەگەر پێشـتر مسولْمان بوو بیٚ ئیمانەکەی پیٚ هەلْدەوەشێتەوە، بۆ نموونە: جاری وا هەیە کابرا سوێند دەدەن بە خوا (سبحانە وتعالی) بە قورئان، یەکسەر

(201) البقـرة (165) .
(202) الأعلـى (1) .

سوێندەکە دەخوات بەڵام ئەگەر سوێندی بدەن بە شێخێك یان بە قەبرەکەی کابرا سوێند ناخوات!! دەجا دیارە کابرا قەبری ئەو شێخەی یان سەری ئەو کەسەی کە لە ئەصڵدا دروست نیە بە هیچ جۆرێك سوێندیشی پێ بخورێ، پێی لە خوای بەرزو مەزن گەورەترە! بۆیە پێی کافر دەبێ چونکە ئەوە (شرك)ی گەورەیە، سوێند بە درۆ بە خوا دەخوات، بەڵام بە درۆ بە شێخی ناخوات، بۆچی؟!، چونکە پێی وایە شێخ لێی دەرەنجێ، یان تۆڵەی لێ دەستێنێت ئەگەر بە درۆ سوێندی پێ بخوات!، کە بێگومان هەم تۆڵە لە غەیری خوا زانینەکەی (شرك)[203]ە و هەم بە درۆ سوێند پێ نەخواردنەکەیشی - لەبەر زێدە ڕێز لێ گرتنی و بە گەورە گرتنی - هەر هاوبەش بۆ خوا دانان (شرك)ە !

یان وەك خەڵکێك لە عەلمانییەکان ئامادە نین کە بە درۆ سوێند بە سەرکردەکانیان یان بە نیشتمان یان خوێنی شەهیدانیان بخۆن بەڵام سوێندی بە درۆ بە خوا دەخوات دیارە ئەو جۆرە کەسانەش بەو هەڵوێستەیان ئەگەر مسوڵمانیش بن، پێی کافر دەبن.

4- تەسلیم بوون وملکەچی و خۆ بە بچووك زانین: کە دیارە ملکەچیی و زەبوونیی ئینسان دەبێ بۆ خوا و لە بەرانبەر خوادا بێ و هەر کەسێك غەیری خوای تێدا بەشدار بکات، ئەوە گیرۆدەی شیرك بووە.

(203) چونکە زیان و قازانج لە غەیری خوا زانین لە ڕێی نائاسایی و نا سروشتی یەوە جۆرێکە لە شیرك.

چونکـــە بابای وا هەیە ئەوەندەی لە غەیری خوا دەترســـــێ یان ئەوەندەی مەبەستیەتی غەیری خوا لـێی ڕازی بێ، یان ئەوەندەی بۆ غەیری خۆی زەبوون و ملکەچ دەکات، ئەوەندە بۆ خوا ناکات، یان هەر ئەوەندەش بۆ خوا دەکات، کە دیارە ئەوەش (شرك)ی گەورەیە، چونکە مسوڵمان دەڵێ: ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ بەندایەتی بەس بۆ تۆ دەکەین و داوای یارمەتیش بەس لە تۆ دەکەین.

کەواتە: ئەو جۆرە بەندایەتی کردنە و مل کەچی یەی کە بۆ خوا دەکرێ ئەگەر ئینسان لە دڵی دا بۆ غەیری خوای هەبێ، ئەوە ئەو هەڵوێستەی (شرك)ی گەورەیە چونکە وەك خوا (سبحانە وتعالی) تەماشا کردنی غەیری خوا بە دڵ، لە هەر ڕوویێکەوە بێ یەکێکە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان لە بواری کردەوەی دڵدا.

**جۆری سێیەم: ئەو شتانەی کە دژ و پێچەوانەی دان پێداهێنانی زمانن:**

ئەو شتانەش سەرجەم ئەو قسە و دەربڕینانەن کە ئینسان بە زار یان بە نووسین دەیانخاتە ڕوو وکوفر و شیرك دەگەیەنن، وەك : ئەوە کە کابرا قسەیەکی سووك بە ئیسلام بلێ، یاخود بێ ئەدەبیی بەرانبەر بە خوای پەروەردگار بکات، یان بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ بکات، ئاشکراشە کە ئەو جۆرە کەسانە - واتە ئەوانەی کە قسە و تەعبیری وایان لـێ دەپشکوێتەوە بەرانبەر بە خوای بەرز و مەزن (سبحانە وتعالی)و پێغەمبەری خوا ﷺ وئیسلام - بەر لەوەی ئەو قسەو تەعبیرە ناشیرین و دزێوانە لە زمانیانەوە دەربچن لە دڵ و دەروونیاندا هەن چونکە وەك گوتراوە : (اللســـان مفتاح القلب) هەروەهـــا پێشـــینان گوتوویانە: (دڵ مەنجەڵە و زمان کەوچکە).

هەر بۆیەش کەسێك قســـەی ناشـــیرین و بێ نەزاکەتی بەرانبەر بە خوا (سبحانه وتعالی) و پێغەمبەر ﷺ و ئیسلامی لــێ بپشـــکوێتەوە هەرچەندە ئیددیعا بکات. لــێی ناســەلمێنرێ کە لەو کاتەدا خاوەنی ئیمان بێت.

ئینجا ئەگەر گریمان لێشی بسەلمێنرێ کە ئەو قسە و تەعبیـــرانەی بە دڵ نەبوون وهەروا سەر زارەکی گوتوونی، دیسان هەر دەبنە مایەی هەڵوەشانەوەی ئیمانەکەی، بۆچی؟!

چونکە وەك پێشـــتـــر باســمان کرد دان پێداهێنانی زمان (إقرار اللسان) یەکێکە لە چوار پێکهێنەرەکانی ئیمان. دیارە دان پێداهێنانی زمانیش بە شێوەیەکی گشتی سێ ئەسڵی گەورە و بنەڕەتی:

﴿1- تەنها خوا بەدی هێنەر و پەروەردگار زانین و . 2- موحەممەد ﷺ بە پێغەمبەر و ڕەوانە کراوی خوا زانین و، 3- ئیسلام بە تاکە بەرنامە و ڕێبازی ڕاستی ژیان و گوزەران زانین﴾ دەگرێتەوە، کەواتە: هەر قسە و تەعبیرێك ببێتە مایەی هەڵوەشـــاندنەوەی هەرکام لەو سێ ئەسڵە بنەڕەتییە ئەوە بە کوفر دادەنرێ و سەرەنجام ئیمان هەڵدەوەشێنێتەوە.

هەروەها هەر جۆرە قسە و تەعبیرێکی دیکەش کەسەر بۆ کوفر و شیرك بکێشێ هەمان چەمکی هەیە. وەك: گاڵتە پێکردن، بە سووك تەماشا کردن، ڕەخنـــە لێگرتن. عەیب لــێ دیتنەوە (واتە بەرانبـــەر بە خوا و پێغەمبەر و ئیسلام).

جا لێرەدا پێویستە وریا بین لە بەکارهێنانی زمانمان چونکە گەلێك قسەو تەعبیری وا هەن کە دەبنە هۆی کافر کردنی خاوەنەکەیان، بۆ نموونە: کەسێك بارانێکی زۆری لــێ دەبارێ و تەڕ دەبێ دەڵێ: خوایە ئەوە چی یە ئەم هەموو بارانە!!، یان کابرا کشـــتوکاڵی کردوەو بایەکی بەهێز دێت بەروبووم و

کشـتوکاڵەکەی لێ تێك دەدات و ئەویش نارەزامەندیی پێشان دەدات و جنێو بە (با) یەکە دەدات، جا ئەگەر هەر ڕقی لە بایەکە بێت یان بارانەکە بێت، وەك دروستکراوێکی خوا، ئەوە پێی کافر نابێ، بەڵام خوا نەخواستە ئەگەر جنێو و ڕق لـێ بوونەوەکە و بێ زاریی دەربڕینەکەی بەرانبەر بە خاوەنەکەیان بێت کە خوای پەروەردگارە، ئەوە پێی کافر دەبێت. بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی دا فەرموویەتی:

(**لا تسبوا الدهر فإن الدهر هو الله**) رواه البخاري

واتە: جنێو بە زەمانەو ڕۆژگـــار مەڵێن، چونکە خوای پەروەردگارە کە ڕۆژگار دێنی و دەبات و دەیگێڕی، جا ئەگەر ڕقت لە زەمان بێت لەبەر خودی خۆی ئەوە شتێکە، بەڵام ئەگەر ڕقت لە گێڕەر و ڕوێنەر (مُجْري) زەمان بێت کە خوای بێ وێنەیە، ئەوە - بێ گومان - کوفرە، دیسان هەر قسە و وشە و (تعبیر)ێك کە پێهەڵا گوتن (مدح)ی کوفری تێدا بێت یان شیرکی تێدا بێ، یان پەسند کردن و هەڵبژاردنی بێ دینی لێ بفامرێتەوە ئەوەش هەر کوفرە، وەك ئەوە کە یەکێك باسی عەلمانی یەت و مارکسی یەت و دیموکراسی و سەرمایەداریی (کاپیتـــالیزم) و لیبڕالیزم و ... هتد بکات و وای باس بکات کە زۆر لای پەسندە و بەڕێز و گەورە و پیرۆزە و هەڵی بژێرێ و پێی وەك ئیسلام یان پێی چاکتر بێ، ئەوەش هەمووی هەر کوفرە کوفرێك کە بە زمان دەکرێ، بەڵام وەك پێشتریش گوتمان مەرج نیە هەر کەسێك کوفرێکی کرد یان کوفرێکی گوت، بە کافر دابنرێ، بەڵکو پێویستە بە گوێرەی بنچینەی: هاتنە دی مەرجـــەکان و لاچوونی پەرچەکـــــان (ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) مامەڵەی لەگەڵ بکرێ و لە کۆتایی دەرسی هەشـــتەمیش دا ئەو بنچینەیە دەتوێژینەوە.

## جۆری چوارەم: ئەو شتانەی کە دژ و پێچەوانەی کردەوە و پابەندیی ئەندامەکانن:

چوارەمین جۆری هەڵوەشێنەرەوەی ئیمان و شایەتمان ئەو شتانەن کە لەگەڵ کردەوەی ئەندامەکان و پابەندیی ئینسان بە شەریعەتەوە دژ دەوەستن و تێك دەگیرێن، ئەو شتانەش بە گشتی سێ بەشن:

**یەك:** ئەو ڕەفتار وهەڵس وکەوتانەی کە دروشم ونیشانەی کافرانن وتایبەتن بەوانەوە:

واتە: کۆمەڵە شتێك کە تایبەتن بە ئەهلی کوفر و شیرکەوە بە تایبەتمەندییەکی دینی یان دادەنرێ، وەك:

سەجدە و ڕکووع بردن بۆ ئینسان و بت و صەنەم و مانگ و خۆر و ..هتد، وە خاچ (صلیب) بە مل داکردن، وە ...وە...هتد.

**دوو:** ئەو کردەوە و ڕەفتارانەی کە لە خودی خۆیان دا کوفر و شیرکن:

وەك: لە غەیری خوا پاڕانەوە و لالانەوە و هاوار تێ بەستن، سەجدە و ڕکووع بۆ غەیری خوا بردن، فڕێدانی قورئان بە سووکایەتییەوە. ڕەگەڵ سوپای کافران کەوتن و دۆستایەتی کردنیان و هاوکاریی کردنیان...هتد.

**سێ:** واز لێهێنان و ئەنجام نەدانی ئەسڵی کردەوە و پابەندیی بە شەریعەتەوە و هەر کردەوەیەك کە دەق (نص)ێك شەرعی ڕاست و ڕوون نەکردنی بە کوفر داناوە وەك نوێژ مادام کردەوە و پابەندیی ئەندامەکان بەشێك و پێکهێنەرێکی ئیمان بێ، کەواتە هەر کەسێك هیچ جۆرە کردەوە و پابەندییەکی نەبێ مانای وایە یەکێك لە پێکهێنەرەکانی ئیمانی نیە و کەسێکیش یەکێك لە چوار کۆڵەکە و پایەکانی ئیمانی نوقسان بێ، دیارە ئیمانەکەی نەهاتۆتە دی، چونکە کردەوە (عمل) تەواوکەری

(مكمِّل) ئیمان نیـــە تاكو بڵێین، بە بێ وی ئیمان ناتەواوو نە كامڵە، بەڵكو پێكهێنەر (مُكوِّن)یەتی و بە بێ وی ئەسڵەن هەر دروست نابێ و پەیدا نابێ.

ئەوە لە بارەی ئەسڵ و جینســـی كردەوەی چاكەوە، كە لە دەرســـەكانی پێشووش دا باسمان كرد بۆیە لێرەدا بە خێرایی بەسەری دا گوزەر دەكەین.

لە بارەی نوێژیشەوە دەڵێین:

چەندان دەقی شەرعی تایبەتی لەسەر ئەوە هەن كە نوێژ نەكەر مسوڵمان نیە، كە ئێمە لە كتێبی (مسوڵمانی كامڵ)[204]دا بە درێژی باسی ئەم بابەتەمان كردوە و ئەو دەقانەی قورئان و سوننەتیش كە پێیەوە پەیوەستن خستوومانـــە ڕوو، بۆیە لێرە بەم دوو فەرمایشتە وازی لـــێ دێنین:

یەكەم: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**(العهد الذي بيننا و بينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر) أخرجه أحمد والنسائي والترمذي وصححه وكذلك صححه الحاكم والألباني.**

واتە: ئەو بەڵێن وپەیمانەی لە نێوان ئێمە(ی مسوڵمان)و ئەوان (ی كافر) دایە نوێژە جا هەر كەسێك نەیكرد و وازی لێ هێنا ئەوە كافرە.

دووەم: هەروەها فەرموویەتی:

**(إنَّ بين الرجل وبين الكفر والشرك ترك الصلاة) رواه مسلم عن جابر بن عبدالله.**

واتە: لە نێوانی ئینسان و كوفر و شیرك دا واز هێنانە لە نوێژ.

---

(204) بڕوانە : (مسوڵمانی كامڵ) بەشی دووەم: خوا پەرستیی مسوڵمان. بەرگی یەكەم لاپەڕە : 335 تا 368 (حوكمی كردن و نەكردنی نوێژ).

کەواتە: هەر کەسێك نوێژ نەکات ئەوە بە کافر و هاوبەش دانەر (مشرك) دادەنرێ.

شایانی باسیشە مەسەلەی بە مسوڵمان دانەنانی بابای نوێژ نەکەر کاتی خۆی ڕای زۆربەی هەرە زۆری هاوەڵان (أصـــحاب) ی (خوا لـێیان ڕازی بێ) لەسەر بووە وەك (عبدالله بن شقیق) کە یەکێکــە لە زانایانی شوێنکەوتووان (تابعين) لەو بارەوە گوتوویەتی: (**كان أصحاب رسول الله ﷺ لا يرون شيئا من الأعمال تركه كفر غير الصلاة**)[205] واتە: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ پێیـــان وانەبوو واز لـێ هێنان و نەکردنی هچ کام لە کردەوە چاکەکان کوفرە بێجگە لە نوێژ.

ئێستاش با چاوێك بە بیروڕای زانا و پێشەوایان دا بگێڕین دەربارەی هەر کام لە شـــایەتمان هێنان و نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج کە بە پێنج پایەکان (الأركان الخمسة) ناسراون:

مەسەلەی شایەتمان - وەك پێشتریش باسمان کرد - تێکڕای زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە ئینسان بە بێ شایەتمان نایەتە نێو ئیمان و ئیسلامەوە.

نوێژیش ئەوە زۆربەی هەرە زۆری(أصحاب)و(تابعين)ڕایان بەو شێوەیە بوو کە باسمان کرد، بەڵام زۆربەی شەرع زانەکان و هەرسێك پێشەوایەکان : (أبو حنيفة) و (مالك) و (شافعي) ڕەحمەتی خوایان لـێ بێ پێیان وایە کە کەسێك نوێژ نەکات بەهۆی تەمبەڵی یەوە یان کردبی و وازی لـێ هێنابێ، ئەوە بە

(205) بڕوانە : (نيل الأوطار) للشوكاني: ج2ص16 هەروەها بڕوانە: (المجموع) للنووی ج3ص18، کە (نووی) گوتوویەتی: (أخرجه الترمذي وإسناده صحيح) هەروەها دەقی ئەم قسەیە لە (أبو هريرة) شەوە ﷺ گێڕراوەتەوە وەك (الحاكم) هێناویەتی و (الذهبي) گوتوویەتی: (إسناده صالح) بڕوانە : (مسوڵمانی کامڵ) بەشی دووەم : خواپەرستی مسوڵمان، بەرگی (1) لاپەڕە (345).

کافر لە قەڵەم نادرێ، بەڵام پێشەوا (أحمد) ڕەحمەتی خوای لـێ بێ بە کافری لە قەڵــــەم دەدا، ئینجا بە حەقیقەتیش ڕای (أحمد) ڕاستترە[206]، چونکە هەرچەندە هەندێك لە زانایان دەڵێن: مەرجی کافر بوونی بابای نوێژ نەکەر ئەوەیە کە بڕوای پێی نەبێت، بەڵام ئەوە وا نیە، چونکە ئینسان بڕوای بە هەر شتێك نەبێ هەر کافر دەبێ مادام ئەو شــتە بە ئاشـکرا زانرا و (ما عُلِمَ من الدین بالضرورة) بێ، بۆ زەکاتیش ژمارەیەکی زۆر لە زانایان پێیان وایە کە هەر کەسێك زەکات نەدات کافرە، هەندێکیشیان دەڵێن: ئەگەر گەورە و پێشەوای مسوڵمانان داوای زەکات بکات و کابرا نەیدات ئەو کاتە پێی کافر دەبێت، ئەوەش بە بەڵگە دێننــــەوە کە (أبو بکر) خوا لــێی ڕازی بێ جەنگی لەگەڵ ئەوانەدا کرد کە زەکــــاتیان نەدەدا دەڵێن دیــارە بە کافری داناون بۆیە شەڕی لەگەڵ کردوون، بەڵام ڕاســـتی یەکەی بۆ بە کافر دانانی بابای زەکات نەدەر بەڵگەیەکی وا بە هێزی لەسەر نیە.

دەشتوانین بۆ ئیسپاتی ئەوە کە بابای زەکـــات نەدەر هەر مسوڵمانە و ناگونجێ بە کافر دابنرێ، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەڵگە بێنینــــــەوە کە تێیدا دەفەرموێ: (**ما من صاحب کنز لا یؤدي زکاته الاّ أُحمي علیه في نار جهنم فَیُجْعَل صفائح فَیُکْوی بها جنباه و جَبینه حتی یحکم الله بین عباده في یوم کان مقداره خمسین الف سنة ثم یری سبیله إما الی الجنة وأما الی النار**)[207] واتە: هەر کەسێك خەزنە و پارە و سامانێکی هەبێ و زەکاتەکەی نەدا ڕۆژی دوایی بۆی دەکرێتە لەوح و بۆی سوور دەکرێتەوە و نێو چاوان و لا تەنیشتەکانی پێ دەسووتێنرێت هەتا

(206) وەکو من لە کتێبی (مسوڵمانی کامڵ) بە درێژی باسم کردوە و بەڵگەشم لەسەر هێناوەتەوە.
(207) رواه مسلم عن أبي هریرة.

خوا حوکم لە نێوان بەندەکانی دا دەکات لە ڕۆژێك دا کە (50.000) پەنجا هەزار ساڵ ماوەیەتی پاشان یان خوا لـێی خۆش دەبێ و بەرەو بەهەشت دەچێ یان بەرەو دۆزەخ دەچێ.

کەواتە مادام بابای زەکات نەدەر ڕێگای بەرەو بەهەشت چوونی هەبێت، دیارە هەر بە مسوڵمان دادەنرێ.

لە بارەی ڕۆژووشەوە : (محمد بن نصر المروزيّ) گوتوویەتی: (وقد اتفق أهل الفتوى من علماء الامصار على أن مَنْ أفطر في رمضان مُتَعَمِّداً أنه لا يكْفُرُ بذلك ولم يَقُلْ أحـــدٌ من العلماء أنَّه قد كفر)[208] واتە: ئەهلی فەتوا لە زانایانی شارەکان یەك دەنگن کە هەر کەسێك بە ئانقەست لە ڕۆژێکی ڕەمەزان دا ڕۆژووەکەی بشکێنێ پێی کافر نابێت، وە هیچ زانایەکیش قسەی ئاوای نەگوتوە.

بۆ حەجیش لەبەرئەوەی کە حـــەج لە تەمەن دا یەك جارە، وە هەندێك لە زانایان دەڵێن لە سـەری پێویســـت نیە کە دەست بەجێ (على الفور) بیکات بەڵکو دەتوانێ بە کاوەخۆ (على التراخي) بیکات مادام وابێ حوکمی کوفر بەسەر کەسێك دا دان کە حەج ناکات. هەرچەندە تواناشی هەیە و هیچ بەربەست (مانع)یشی لەبەردەم دا نین، زۆر زۆر زەحمەتە و هیچ بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە.

(ابن تيمية)[209]ش ڕەحمەتی خوای لـێ بێ ئەو ڕایانەی لەو بارەوە هێناون و دەڵێ: زانایان پێنج ڕایان لەو ڕووەوە هەن، 1- هەندێکیان دەڵێن: هەر

(208) تعظيم قدر الصلاة ، بەرگی دووەم لاپەڕە (1015).
(209) مجموعة الفتاوى/ بەرگی (7) لاپەڕە 377-372.

کەسێك یەکێك لەو چوارانە (واتە نوێژ وزەکات و ڕۆژوو وحەج) نەکات ئەگەر ئەو یەکە حەجیش بێت، هەر پێی کافر دەبێت، 2- هەندێکیان دەڵێن: بە نەکردن و واز لێهێنانی هیچیان کافر نابێ تەنانەت ئەگەر نوێژیش بێ، 3- هەندێکیشیان دەڵێن: تەنیا بە نەکردنی نوێژ کافر دەبێ کە ڕای زۆرینەی زانایان وایە، 4- هەندێکیشیان دەڵێن: بە نوێژ و زەکات کافر دەبێت، واتە هەر کەسێك نوێژ نەکات و زەکات نەدات بە مسوڵمان دانانرێ، 5- وە هەندێکی دیکەشیان گوتوویانە: بە نەکردنی نوێژ و بە نەدانی زەکات کافر دەبێت بەڵام بۆ زەکات بە مەرجی ئەوەی گەورە و پێشەوای مسوڵمانان داوای بکات.

بەهێزترین ڕاش ئەوەیە کە من هەڵم بژاردوە کە ئینسان تەنیا بە نوێژ نەکردن کافر دەبێت(210)، ئەگەر نا بۆ ئەوانی دیکە بەڵگەیەکی بەهێزی ئەو تۆ نیە.

وصلی الله تعالی علی سیدنا محمد و اله اجمعین.



(210) بەڵام ئەوەش بە موتڵەقی نیە، بەڵکو دەبێ ئەو کەسە لـێی حاڵی کرابێ کە بە بێ نوێژ بە مسوڵمان دانانرێ و ئەو مەسەلەیەی بۆ ڕوون کرابێتەوە، وە هیچ کام لـە نوێژەکانیش نەکات.

الحمد لله رب العالمين وصلى الله تعالى على سيدنا محمد و اله اجمعين من الصّحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان الى يوم الدين.

بەڕێزان !

لە دوو دەرسی ڕابردوودا باسی (هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان (نواقض الایمان) مان کرد کە کورتە و پوختەکەی ئەوەیە: هەر شتێك پێچەوانە و دژی یەکێك لە چوار پێکهێنەرەکانی ئیمان بێت، کە بریتین لە (قسەی دڵ، کردەوەی دڵ، دان پێداهێنانی زمان، کردەوەی ئەندامەکان) ئەوە ئیمانی پێ هەڵدەوەشێتەوە.

لەم دەرسەشمان دا باسی هەڵوەشێنەرەوەکانی شایەتمان و ئیسلام دەکەین و سەرەتا وەك ڕێ خۆش کردن دەڵێین:

ئیسلامەتی ڕواڵەتی و ئاشکرا و هەست پێ کراوە، ئەو شتانەش کە ئیسلامەتی هەڵدەوەشێننەوە بریتین لەو دوو پێکهێنەرەی ئیمان کە ئاشکران، ئەوانیش دان پێداهێنانی زمان و کردەوەی ئەندامەکانن.

شایەتمانیش کە دەروازەی چوونە نێو ئیمان و ئیسلامە ودەربڕین وئیعلان و جاڕ دانی مسوڵمانەتی یە، لەگەڵ ئیسلام دا هەر یەکن، چونکە بە شایەتمان دەچیە نێو ئیسلامەوە و هەرکات مسوڵمانیش بووی دەبێ شایەتمانت هەبێ، کەواتە دوو شتی پێکەوە پەیوەست (متلازم)ن و ناگونجێ لە یەك بترازێن، هەر بۆیەش هەر شتێك مسوڵمانەتی ئینسان هەڵبوەشێنێتەوە شایەتمانەکەشی هەڵوەشاندۆتەوە، وە بە پێچەوانەشەوە هەر شتێك شایەتمانی ئینسان

هەڵبوەشێنێتەوە مسوڵمانەتی یەکەشی هەڵوەشاندۆتەوە، ئینجا با بزانین ئەو شتانە چین کە شایەتمان و ئیسلام هەڵدەوەشێنێتەوە ؟!

بە پشتیوانی خوا ﷻ لە پێنج خاڵان دا ئەم باسە دەخەینە ڕوو:

**1- بۆ حوکم دان بەسەر خەڵکی دا لە بواری ئیمان و کوفردا دەبێ تەنیا سەرنجی ڕواڵەتیان بدرێ:**

لەبەرئەوەی حوکم بەسەر دڵ و دەروونی خەڵك دادان شتێکی پەنهانە و تەنیا خواش پەنهان دەزانێ، بۆیە هیچ کەس بۆی نیە هەموو ئەو شتانەی کە ئەو ئەصڵەی ئیمان و ئەو ڕەگ و ڕیشەیەی کە لە عەقڵ و دڵ و دەروونی خەڵك دا هەیە، هەڵی دەوەشێنەوە بۆی نیە بەهۆی ئەو هەڵوەشێنەرەوانەی حوکم بەسەر کەسێکی مسوڵمان دا بدات کە مسوڵمان نەماوە، بە بیانوی ئەوەی کە لە دڵی دا فلان شتە هەیە یان لە عەقڵی دا فلان شتە هەیە، چونکە هەر خوا غەیب و پەنهان زانە و دەزانێ لە دڵ و عەقڵی ئینسان دا چی هەیە، بۆیە هەتا لە ڕێی زمانییەوە نەبیسترێ و دەرنەکەوێ و لە ڕێی کردەوەکانییەوە ئاشکرا نەبێ، هیچ کەس بۆی نیە حوکمی بەسەردا بدات، چونکە هەر حوکمێك بەو جۆرە بدرێت لەسەر بنچینەی گومانە و گومانیش خوای پەروەردگار (سبحانه وتعالى) لە بارەیەوە فەرموویەتی: **(وَإِنَّ الظَّنَّ لاَ يُغْنِي مِنْ الْحَقِّ شَيْئًا)**[211]، واتە: وە گومان هیچ سوودێك بە ئینسان ناگەیەنێ بۆ ئەوەی حەق بپێکێ.

بەڵگەشمان لەسەر ئەوە کە پەنهان (غَيْب) تەنیا خوا (سبحانه وتعالى) دەیزانێ، چەندان ئایەتە بۆ وێنە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: **﴿ قُلْ لاَ يَعْلَمُ**

---

(211) النجم (28) .

مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ الْغَيْبَ إِلاَّ اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴾[212]
واتە: پێیان بڵێ ئەو پەنهان و نادیارەی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە جگە لە خوا هیچ کەس نایزانێ، وە ئەوانە نازانن کەی زیندوو دەکرێنەوە.

کەواتە:

هەر کاتێك ویستمان دەربارەی مسوڵمانەتی و نا مسوڵمانەتیی کەسێك قسە بکەین و حوکمی ئیمان یان کوفری بۆ بدەیـــن، تەنها یەك ڕێگامان لە پێشە ئەویش ئەوەیە کە سەرنجی دەربڕینەکانی زمانی و کردەوەی ئەندامەکانی بدەین و بە هیچ شـــێوەیەك بۆمان نیە بە لای بیر و خولیاکانـــی نێو زەین و مێشکی و نیاز ومەبەستەکانی نێو دڵی دا بچین. وەك ئەوە کە ئیددیعا بکەین کە فلانکـــەس کوفر و شیرکی لە عەقڵ و دڵ دا هەیە، یان بڵێین: ڕەنگە و لەوانەیە فلان کەس شیرك و کوفر و نیفاقی لە دڵ دا هەبێ !

چونکە نهێنی یەکانی دەروونی ئینسان بێجگە لە خوای بەدیهێنەر (سبحانە وتعالی) هیچ کەسی دیکە پەییان پێ نابات و دەرکیان ناکات؛ وەك فەرموویەتی: ﴿ وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوْ اجْهَرُوا بِهِ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ، أَلاَ يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾[213].

ئینجا ئەگەر گریمان کەسێك هەبێ خوا (سبحانە وتعالی) دلڕۆشنییەکیشی دابێتێ و لە کاتێکی دیاری کراودا نهێنی یەکی دڵی ئینسانێکیشی پێشان

(212) النمـــل (65) .

(213) الملـك (13- 14) . واتە وە قسەکانتان بە پەنهانی بکەن، یان ئاشکرایان بکەن (خوا هەر دەیانزانێ) چونکە بێگومان ئەو نهێنییەکانی سینەکان دەزانێ، جا چۆن کەسێك کە دروست کراوەکانی وەدیهێناون و بەکجار پەنهان بین و شارەزاشە نازانێ ؟!

بدات وبزانێ کە کوفر وشیرکی لە دڵ دا هەیە و دەغەڵ (منافق)ە و مسوڵمان نیە[214]؛ ئەوە دیسان دروست نیە لەسەر بناغەی ئەو زانیاریی و دڵڕۆشنییە مامەڵە لەگەڵ ئەو کەسەدا بکات و حوکمی بە نا مسوڵمان حیساب کردنی ئەو کەسەی لەسەر بنیات بنێ. چونکە بەرنامەی مامەڵە کردن (تعامل) لەگەڵ خەڵکی دا تەنها شەریعەت و یاسا و دەستووره ڕوون و زانراوەکانی. هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە ڕێی (وەحی)یەوە جاروبار خوای پەروەردگار (سبحانە وتعالى) ئاگاداری کردبێتەوە کە فلانە کەس چی لە دڵ دا هەیە، یان بە فیراسەت و وردبینی خوی شتێکی دەربارەی کەسێك زانیبێ. هیچ حوکمێکی لەسەر ئەو ئاگاداری و زانستەی خۆی بنیات نەناوە لە بواری هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکی دا مەگەر شتەکەیان بە ئاشکرا لێ دەرکەوتبێ و بە بەڵگەی شەرعی لەسەریان ئیسپات بووبێ.

**2- هەر کەسێك بە مسوڵمان خۆی ناساند و مسوڵمانەتی لێ بینرا دەبێ وەك مسوڵمان مامەڵەی لەگەڵ بکرێ هەتا بە ئاشکرا و ڕوونی یەکێك یان زیاتر لە هەڵوەشێنەرەوەکانی لێ دەزانرێن:**

بەڵێ هەر کەسێك شایەتمانی هێنا و خۆی بە مسوڵمان پیشان دا و کردەوەی مسوڵمانێتی لێ بینرا هەرچەندە پێشتر لە نێو کۆڕ و کۆمەڵ و لایەنێکی نا مسوڵمانیش دا بووبێت بۆمان نیە، بڵێین:

نەخێر تۆ مسوڵمان نی و هەر کافری و درۆ دەکەی لە دەعوای مسوڵمانەتییەکەت دا، ئەوە وەك قۆناغی یەکەمی هەڵس وکەوتمان لەگەڵی دا،

(214) واتە : لە ڕێی خورپە (إلهام) وە کە خوا وەك کەرامەتێك بە هەندێك لە دۆستان (أولیاء)ی خۆی دەبەخشێ لە هەندێك کات دا.

بەلاّم بیّ گومان دوایی سەرنجی هەڵس وکەوتی دەدریّ، داخۆ کردەوە و ڕەفتار و هەڵوێستەکانی مسوڵمانانەن یان نا؟! وە ئایا هیچ قسە و ڕەفتارێکی وای لـیّ نە پشکوتۆتەوە کە مایەی هەڵوەشاندنەوەی شایەتمان و مسوڵمانەتی یەکەی بیّ؟!

بەڵگەش بۆ سەلماندنی ڕاستیی ئەو قسەیە زۆرن یەکێکیان ئەم ئایەتەیە کە خوای بیّ هاوتا تێیدا دەفەرمویّ:

﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا وَلاَ تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمْ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا ﴾[215].

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێنـــــاوە هەر کات چوونە جەنگ و جیهاد چاوتان ورد بکەنەوە و کەسێك کە سەلامتان لـیّ دەکات پیّی مەڵێن: تۆ مسوڵمان و ئیماندار نی...

دیارە ئەو کاتە سەلام کردن تەنها دروشمی مسوڵمانان بووە، بۆیە تەنها کەسانێك بەکاریان هێناوە کە خۆیان بە مسوڵمان دانابیّ.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتـەش ئەوە بووە کە ڕۆژێکیان چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگادا بە کابرایەك دەگەن و ئەویش سەلامیان لـیّ دەکات کە ئەو کاتە دروشـــــم و نیشانەی مسوڵمانەتی بووە. ئەوانیش دەڵێن: ئەوە لە ترسان ســـەلامان لیّ دەکات ئەگەر نا هەر کافرە و مسوڵمان نەبووەو سەرەنجام دەیکوژن وئەو ماڵ و سامانەش کە پیّی بووە دەیهێنن، خوای دادگەریش ڕەخنەیان لیّ دەگریّ و ئەم ئایەتەیان لەسەر دەنێرێتە خواریّ.

---

(215) النسـاء (94) .

کەواتە: هەر کەسێك خۆی بۆ ئێمە بە مسوڵمان نیشان دا ئێمەش دەبێ بە مسوڵمانی دابنێین و وەك مسوڵمان مامەڵەی لەگەڵ بکەین.

هەروەها زۆر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە هەن کە پێشتر باسمان کردوون، یەکێك لەوانە ئەو فەرموودەیەیە کە پێغەمبەر ﷺ تێیدا بە (اسامة بن زید)ی فەرموو: (**أقتلته بعد ان قال لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ** ؟!)[216] یەکێکی دیکەش ئەو فەرموودەیەیە کە تێیدا بە (خالد)ی فەرموو: (**إني لم أُؤمر ان أُنقِّب عن قلوب الناس ولا أن أشقّ بطونهم**)[217]، واتە: من فەرمانم پێ نەکراوە دڵی خەڵکی هەڵ بکۆڵم و ورگیان بدڕم بزانم ئایا ڕاست دەکەن یان درۆ دەکەن لەوەدا کە دەڵێن مسوڵمانین، وە یەکی دیکەش لەو بەڵگانە ئەو (أثر)ەیە کە (عبدالله بن عتبة بن مسعود) دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: گوێم لە (عمر بن الخطاب) بوو خوا لــێی ڕازی بێ دەیگوت: (ان ناساً کانوا یُؤخذون بالوحي في عهد رسول الله ﷺ وان الوحي قد انقطع، وانما نأخذکم الان بما ظهر لنا من اعمالکم فمن اظهر لنا خیرا أمنّاه و قرّبناه ولیس لنا من سـریرته شيء، الله یُحاسـبه في سریرته، وَمنْ أظهر لنا سوءاً لم نأمنه ولم نُصَدِّقْهُ وان قال أنَّ سریرته حسنة)[218]

واتە: کەسانێك لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بەهۆی (وحي) و پەیامی خواوە ڕەفتار و مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا و لێیان دەپرســرایەوە، بەڵام ئێستا (وحي) بڕاوە ئێمە بە گوێرەی ئەو کردەوانەتان کە لێتان دەردەکەوێ ڕەفتارتان

(216) بخــاري و مسلم. واتە : ئایا هەر کوشتت هەرچەند گوتبیشی : لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ ؟!
(217) بخــاري و مسلم.
(218) البخــاري.

لەگەڵ دا دەکەین جا هەر کەسێك چاکەی لێ دەرکەوێ ئەوە بە ئەمینداری دەزانین ولە خۆمانی نزیك دەخەینەوە وە ئێمە حەقی دڵ ودەروون وپەنهانیمان نیە و خوا لێی دەپێچێتەوە لەسەر ڕاست کردنی و درۆ کردنی کەسێکیش خراپەی لێ دەرکەوێ و خراپەی لێ ببینین ئێمە بە ئەمینداری نازانین و قسەکانیشی بە ڕاست دانانێین هەرچەندە بشڵێ: دڵ ودەروونم باشە ، (أبو جعفر الطحاوي)یش هەر لەو بارەوە گوتوویەتی: (ونرى الصلاة خلف كل برّو فاجر، من أهل القبلة و على من مات منهم، ولا نُنْزِلُ احداً منهم جنة ولا ناراً ، ولا نشهد عليهم بكفر و لا بشرك ولا بنفاق ما لم يظهر منهم شيء من ذلك و نَذَر سرائرهم الى الله تعالى)[219] واتە: وە ئێمە وەك ئەهلی سوننەت و جەماعەت پێمان وایە : هەموو مسوڵمانێکی چاکە کارو خراپە کار نوێژی لە پشتەوە دەکرێت مادام بە ڕواڵەت مسوڵمان وئەهلی (قیبلە)بێت، هەروەها هەر کاتێك مردیش دەبێ نوێژی لەسەر بکرێ، وە دەربارەی هیچ کەسێك لە مسوڵمانان ناڵێین فلان کەس لە بەهەشتە و فلان کەس لە دۆزەخە ، ﴿کەواتە زۆر هەڵەیە کە جاروبار دەبیستین یەکێك دەڵێ: گیانی پاکی فلان کەس ئێستا لە (فردوس الاعلى)یە ، نەخێر ئەوە نا شەرعی یە و پێچەوانەی عەقیدەی ئیسلامی یە و ئێمە بۆمان نیە هیچ کەسێك دیاری بکەین بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ، مەگەر کەسێك دەق (نص)ێکی قورئان و سوننەت دیاری کردبێ کە فلان کەس بەهەشتی یە ، وەك پێغەمبەر ﷺ و دە (10) کەسە موژدەی بەهەشت پێدراوەکان (العشرة المبشرة بالجنة)وە دایکانی مسوڵمانان. هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ ، خوایان لێ ڕازی بێ، وە وەك ئەو (1400) هاوەڵەی کە

(219) تهذيب شرح العقيدة الطحاوية / ابو بصير / لاپەڕە (310-316-318) .

ژێر درەختی (رضوان)دا پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەست کە هەم ئایەتی قورئان و هەم فەرموودەشی لەسەرە کە خوا لێیان ڕازی بووە: ﴿ **لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنْ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ** ﴾(220) هەروەها هاوەڵە بەدری یەکـــان و هەر کەسێکی دیکە کە دەق (نص)ێکی لەسەر بێ، چونکە (غیب) تەنیا خوا دەیزانێ وە پێغەمبەریش ﷺ لە ڕێی خواوە زانیویەتی، ئەگەر نا قسەی هیچ کەسێکی دیکە لەو بارەوە بە بەڵگە دانانرێ بەڵکو دەبێ بڵێین: فلان کەس ئومێدی خێرمان هەیە کە بەهەشتی بێت ودۆزەخی نەبێت فلان کەسیش لـێی دەترسین کە دۆزەخی بێت، غەیری ئەوە هەمووی ئیددیعای زانینی غەیبە﴾.

ئینجا (طحاوي) دەڵێ: وە شاهیدی نادەین لەسەر هیچ کام لە تاکەکانی ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ کە بڵێیـــــن: فلان کەس کافرە یان (مشرك)ە یان (منافق)ە، مەگەر شتێکی لەوە لـێ دەرکەوتبێ ﴿ئینجا کە لێشی دەرکەوت دەڵێین فلان کەس کوفری لـێ دەرکەتوە یان شـیرك یان نیفاقی لـێدەرکەوتوە بەڵام ناڵێین حەتمەن (کافر)یان(مشرك)یان (منافق)ە﴾ وە نهێنی یەکانیشیان حەواڵەی لای خوا دەکەین، ﴿چونکە تەنها خۆی (سبحانه وتعالـی) پەنهان و نهێنی دەزانێ﴾.

وە دەربارەی نوێژ کردن لە دوای ئەهلی قیبلە کە چاکە کار یان خراپە کار بن ئەو پرسیارە زۆر جار ئاراستەمان دەکرێ کە ئایا نوێژ کردن لە دوای فلان مەلا و ئیمامە کە بابایەکی خراپە و قســەی خراپ دەکات دروستە یان نا ؟!، وە یان نوێژ کردن لەســـەر مردووێکی بە ڕواڵەت مسوڵمانی خراپە کار ئایا

(220) الفتــح (18) .

دروســـتە یان نا؟! حەز دەکەم کەمێکتان لەو بارەوە بۆ بدوێم، فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەیە کە تێیدا دەفەرموێ : (**ءَإمتكم يُصلّون لكم ولهم فإن أصابوا فلكم ولهم وإن أخطئوا فلكم وعليهم**)[221] واتە: پێش نوێژەکانتان پێش نوێژیی بۆ ئێوەو بۆ خۆشیان دەکەن جا ئەگەر باشیان کردو نوێژەکەیان و ئیمامەتی یەکەیان بە پێی مەرجەکانی شەرع بوو، ئەوە نوێژی خۆشیان و هی ئێوەش بەرکەوتوە، بەڵام ئەگەر خراپیان کرد، - وەك ئەوەی دەســـت نوێژیان نەبوو، یان بە قەناعەتی ئێوە خەلەل وکەم و کووڕی تێـــــدا بوو، یان هەر ئیمانیان نەبوو بەڵام ئێوە پێتان نەزانیبوو- ئەوە بۆ خۆیان خراپە، بەڵام بۆ ئێوە و نوێژەکەتان هیچ زیانی نیە و بۆتان بەرکەوتوە.

وە لەسەر بناغەی ئەم فەرمایشــتە زانایان تێکڕا لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە ئەگەر پێشـــەواو ئیمامێك بە جۆرێك نوێـــژی کرد پێچەوانەی نوێـــژی مەئموومەکانـــی بوو، بۆ وێنە: ئەگەر حەنەفی مەزهەبێك دەستی لە خێزانی دابوو وماچی کردبووپێش نوێژیشی کرد،مەئموومەکانیشی شافیعی مەزهەب بوون و پێیان وابوو کە بە دەست لێدانی پیاو لە ئافرەت دەست نوێژ دەشکێ، ئەوە ســەرجەم زانایان مەگەر کەسێك زۆر وشك و دەمارگیر (متعصب) بێت و ناحاڵی بێت، ئەگـــەر نا هەموویان دەڵێن: نوێژەکەیـــان دروســـتە چونکە ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە.

ئینجا ئاشکراشە کە لە مەسەلە خیلافییەکان دا، واتە لەو مەسەلانەدا کە ڕاجیایی زانایانیان تێدایە هیــچ کەس بۆی نیە بە یەکێکی دیکە بڵێ: تۆ

(221) رواه البخاري و مسلم ، مجموعة الفتاوى / بەرگـــی چوارەم لاپەڕە 342.

دەبێ بە ڕای منەوە پابەند بی، بەڵکو مادام مەسەلەکە خیلافی یە هەردووکیان ئازادن کە چ ڕایەك هەڵدەبژێرن.

(ابن تیمیة)ش خوا لێی خۆشبێ لەو بارەوە گوتوویەتی: (وتجوز الصلاة خلف كل مسلم مستور باتفاق الائمة الاربعة و سائر ائمة المسلمين، فمن قال لا أصلي جمعة ولا جماعة الاّ خلف من اعرف عقيدته في الباطن فهذا مبتدع مخالف للصحابة والتابعين لهم باحسان و أئمة المسلمين الاربعة و غيرهم)[222]

واتە: بە یەك دەنگی هەر چوار پێشەوا سەر مەزهەبەکان وئەوانی دیکەش لە پێشەوایانی مسوڵمانان، دروستە نوێژ بکرێ لە دوای هەر مسوڵمانێك کە حاڵ وباڵی بۆ ئێمە نادیارو پەنهانە، وە هەر کەسێك بڵێ جومعە و جەماعەت ناکەم مەگەر لە دوای کەسێکەوە کە بزانم عەقیدەکەی چی یە لە دەروونی دا، ئەوە ئەهلی بیدعەیە،وە هەڵوێستەکەی پێچەوانەی هەڵوێستی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیانەو پێچەوانەی بیر و بڕوای چوار پێشەوایەکانی مسوڵمانان و غەیری ئەوانیشە.

پاشان دەڵێ: (وقول القائل لا أسلم مالي الاّ لِمَنْ أعرفه، و مراده لا أصلي خلف من لا اعرفه كما لا اسلم مالي الا لمن أعرفه، كلام جاهل لم يقله احد من أئمة الاسلام)[223] واتە: وە کەسێك کە دەڵێ: ماڵی خۆم تەسلیمی کەسێك ناکەم کە نایناسم بەڵکو ماڵی خۆم تەنیا تەسلیمی کەسێك دەکەم کە دەیناسم، مەبەستیشی ئەوەیە کە لە پشت کەسێکەوە نوێژ ناکەم نازانم عەقیدەکەی چی یە هەروەها ماڵی خۆشم تەسلیمی یەکێك ناکەم کە نایناسم

(222) مجموعة الفتاوى/ بەرگی چوارەم لاپەڕە 342.
(223) هەمان سەرچاوە / بەرگی 23 لاپەڕە (199)

ئەو قســەیە قســەی کەسێکی نەفام و نەزانە و هیچ کام لە پێشــەوایانی مسوڵمانان شتی وایان نەگوتوە، کەواتە مسوڵمان دەبێ حوکم بە ڕواڵەت (ظاهر) بکات نەك بڵێ دەبێ بزانم فلان مەلا و فلان پێشەوایە چی لە دڵ دایە و عەقیدەی چۆنە ئینجا نوێژی لە دوا دەکەم، نەخێر بەڵکو مادام کابرا بە ڕواڵەت زانایەکە و ئیمامێکی مسوڵمانە دەبێ نوێژی لە دوا بکەی، مەگەر بە بەڵگەی ڕوونی شەرعی دڵنیابی کە مسوڵمان نەماوە.

هەروەها لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ:(فإن الصحابة كانوا يصلون الجمعة و الجماعة خلف الأئمة الفجار ولا يعيدونها كما كان ابن عمر يصلي خلف الحجاج وابن مسعود وغيره يصــلون خلف الوليد بن عقبة وكان يشــرب الخمــر)[224] واتە: چونکە هاوەڵان خوا لێیـــان ڕازی بێ جومعە و جەماعەتیـان لە دوای دەســـتەڵاتدارە تاوانبارەکانی سەردەمی خۆیان دەکرد و نوێژەکانیشـــیان نەدەگێڕایەوە، وەك (عبدالله) ی کوڕی (عمر) لە دوای (حجّاج) کردوویەتی، وە (عبدالله) ی کوڕی (مسعود) و غەیری ئەویش لە دوای (وليد بن عقبة) نوێژیان کردوە کە بابایەکیش بووە مەی خواردۆتەوە.

پاشان گوتوویەتی: (والفاسق والمبتدع صلاته في نفسه صحيحة، فإذا صلى المأموم خلفه لم تبطل صلاته، لكن إنما كره من كره الصلاة خلفه لان الامر بالمعروف والنهي عن المنكر واجب وكذلك اذا كان الامام قد رتبه ولاة الامور ولم يكن في ترك الصلاة خلفه مصلحة فهنا ليس عليه ترك الصلاة خلفه)

واتە: وە نوێژ لە دوای بابای فاسق و بیدعەتچی دروستە چونکە مادام نوێـــژی خۆیان دروستە، دیارە نوێژی کەسێك کە لە دواشیان دەکات هەر

(224) هەمـــان سەرچاوە/ بەرگی 23 لاپەڕە 200–201.

دروســـتە و ئەوانەش کە پێتان ناخۆش بوە لە دوای ئەو جۆرە کەسانەوە نوێژ بکرێ مەبەســـتیان ئەوە بووە کە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە فەڕزە، -گوتوویانە با نوێژی لە دوا نەکرێ بۆ ئەوەی بە گوناهی خۆی بزانێ وخەڵکیش بیناسێ تا دەست هەڵبگرێ و واز بهێنێ- وە ئەگەر ئیمامێك دەستەڵاتداران دایان نابوو، وە بە هۆی نوێژ لە دوا نەکردنیشی یەوە بەرژەوەندی یەك نەدەهاتە دی، ئەوە بێگومان بابای مسوڵمان لەو حاڵەتانەدا ڕێی لێ نەگیراوە کە نوێژ لە دوای ئەو جۆرە ئیمامانەوە بکات.

وە لە کۆتایی دا (شیخ الاسلام) گوتوویەتی: (ومن انکر مذهب الروافض و لا یصلي الجمعة والجماعات بل یکفر المســـلمین فقد وقع في مثـــل مذهب الروافض فان من اعظم ما انکره اهل السنة علیهم ترکهم الجمعة والجماعة و تکفیر الجمهور)[(225)] واتە: وە کەسێك ڕەخنە لە بیروڕای (رافضـــة)کان بگرێ، کەچی بۆ خۆشی جومعە و جەماعەت لەگەڵ مســـوڵمانان نەکات بەڵکو ژمارەیەك لە مســـوڵمانان بە کافر دابنێ، ئەوە ئەو کەســـە هەرچەندە بە حیساب مەزهەبی (رافضة)ی (رفض) کردۆتەوە بۆ خۆشی کەوتۆتە نێو ئەو شتەوە کە (رافضة) لەســـەرنی و بەو هۆیەوە بە ئەهلی بیدعە و لاڕێ و ڕەخنە لـێ‌گیراو لە قەڵەم دەدرێن، چونکە یەکێك لە گەورەترین شتەکانی کە ئەهلی سوننە و جەماعە لەوانی بە ڕەخنە دەگرن ئەوەیە کە جومعە و جەماعەت لەگەڵ باقی مسوڵمانان دا ناکەن و زۆربەیان بە کافر دەزانن.

هەروەها هەر دەربارەی ئەوە کە حوکم بە ئاشکرا و بە ڕواڵەتی مسوڵمانان دەکرێ (النووي) ڕەحمەتی خوای لـێ بێ لە شـــەرحی ئەو فەرموودەیـەی

---

(225) هەمـــان بەرگ و لاپەڕەی سەرچاوەی پێشوو.

ڕووداوەکەی (ئوسامەی کوڕی زەید)دا کە پێشتر باسکرا، گوتوویەتی: (وقوله ﷺ (أفلا شققت قلبه) فيه دليل للقاعدة المعروفة في الفقه والاصول ان الاحكام يعمل فيها بالظواهر والله يتولى السرائر)[226]

واتە: وە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ: (أفلا شققت قلبه) بەڵگەی ئەو بنچینە شەرعی یە ناودار و زانراوەی تێدایە کە لە (فقه) و (اصول)دا زانایان لەسەری یەك دەنگن، کە دەڵێ: لە بواری مامەڵە لەگەڵ خەڵکی دا بۆ جێبەجێکردنی حوکمە شەرعی یەکان. حوکم بە پێی ڕواڵەتە و خوای پەروەردگاریش بۆ خۆی لێپرسینەوەیان لەگەڵ دا دەکات لە بارەی ئەوەوە کە لە دڵ و دەروونیان دا هەیە.

(ابن حجر العسقلاني)ش خوا لێی ڕازی بێت هەر لەو بارەوە گوتوویەتی: (وكلهم أجمع على ان احكام الدين على الظاهر والله يتولى السرائر، وان امور الناس محمولة على الظاهر، فمن اظهر شعائر الدين اجريت عليه احكام اهله مالم يظهر منه خلاف ذلك)[227] واتە: زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە حوکمەکانی دین بە پێی ڕواڵەتی خەڵك جێبەجێ دەکرێن و نهێنی یەکانیش بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە و کاروباری خەڵك هەمووی بە پێی ڕواڵەتیانە، جا هەر کەسێك دروشمەکانی دینداریی ئاشکرا بکات حوکمی ئەهلی دینی بەسەردا دەدرێت و وا دادەنرێ کە مسوڵمانە، بە مەرجێك پێچەوانەی ئەوەی لێ دەرنەکەوێ.

---

(226) شرح صحيح مسلم بەرگی دووەم لاپەڕە 107.

(227) فتح الباري.

کەواتە: کابرا هەرچەندە بە ڕواڵەت نوێژ بکات و ڕۆژوو بگرێ، بەڵام مادام (کوفر و شیرك و نیفاق)ی گەورەی لێ ببینرێ، ئەوە حیسابەکەی جیایە، وەك پێشتریش باس کرا.

پوختەی خاڵی دووەم ئەوەیە کە: ئێمە حوکم بە ڕواڵەت و ئاشکرای خەڵك دەکەین و هەر کەسێك دروشم و نیشانە ئاشکرا و بەرچاوەکانی مسوڵمانەتی لـێ بینران دەڵێین مسوڵمانە و هەر کەسێکیش پێچەوانەی ئەوەی لـێ بینرا ئەوە حوکمی پێچەوانەی مسوڵمانەتی بەسەردا دەدەین.

دیارە ئەوانەش کە ئاشکران لە هەڵوەشێنەرەوەکانی مسوڵمانەتی و ئیمان تەنها ئەم دوانەن: 1- قسەی زمان 2- کردەوەی ئەندامەکان واتە: ئەوەی کە بە زار و زمان دەگوترێ کە نووسینیش هەمان حوکمی هەیە، وە ئەوەی کە بە ئەندامەکان ئەنجام دەدرێ، ئەوە بۆ حوکمی دونیایی، بەڵام بۆ لای خوا و دوا ڕۆژ ئەوە پێشتر باسمان کرد کە ئەگەر ئینسان بە دڵیش کافر بێ ئەوە هەر لای خوا و بۆ حیسابی دوا ڕۆژ هەر کافرە با هیچ کەسیش پێی نەزانێ.

## 3- مەرجەکانی بە مسـوڵمان دانان لە کەسێکەوە بۆ کەسـێکی دیکە و لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك جیاوازن:

بەڵێ پابەندیی بە مەرجەکانی شـایەتمانەوە و بە ئیماندار و مسـوڵمان زانینی خەڵکی، یاخود بە کـافر دانانیان لە کەسێکەوە بۆ کەسـێك و لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك جیاوازە، با چەند بەڵگەیەك لەسەر ئەوە بێنینەوە:

یەکەم: زانایان لە کتێبەکانـی (عقیدة) دا باسی ئیمانی (مفصل) و ئیمانی (مجمل) یان کردوە، کە پێشتریش باسمان کرد و تیشکمان خستە سەری.

جا گومانی تێدا نیە کە زانایان لەسەریان فەرزە ئیمـانی (مفصل)یان هەبێ، بەڵام خەڵکی عەوام بە ئەندازەی توانای خۆیان جۆر و چۆنیەتی

ئیمانیان لەسەر فەرزە کە بریتی یە لە ئیمان بە کورتی (الایمان المجمل) بۆ وێنە: یاساکانی میرات کە زۆر ورد و ئالۆزن. بابـــای عەوام و نەخوێنـــدەوار لەسەری فەرز نیە کە هەموو وردەکاری یەکانیان دەرك بکات و بزانێ داخۆ ژن و مێرد یەکی چەندیان میرات لە یەکدی دەکەوێ، یان کوڕو کچ وباپیرەو داپیرە و خوشك و برا و .. هتـــد کەی و چۆن میـــرات دەگرن و هەریەکەیان چەندی بەردەکەوێ وکامەیان کامە بێ بەش (حَجْب) دەکات!، بەڵام بۆ زانایان وا نیەو هەر یەکەیان بە ئەندازەی زانیاری خۆی لەسەری فەرزە بزانێ و ئیمانی بەوە هەبێ کە داخۆ کێ و کێ میرات دەگرن و کەی و چەند و چۆن ؟!!

کەواتە: بۆ بابای عەوام و نەخوێندەوار هەر هێندە فەرزە و بە مەرج گیراوە لە بواری یاساکانی میرات گرتن (أحکام المیراث)دا کە بە گشتی و بە کورتی ئیمان وقەناعەتی وابێ کە خوای پەروەردگار بەوپەڕی دادگەریی و حیکمەتەوە میـــراتی دابەش کردوە بەسەر خاوەنەکانیان دا، بەڵام زانایان لەسەریان فەرزە - هەر کەسە بە پێی توانای - کە وردەکارییەکانی ئەو یاسایانەش بزانن.

کەواتە: ڕاستە مەرجەکانی شایەتمان وخەڵك بە مسوڵمان دانان و بە مسوڵمان دانەنان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە.

دووەم: کەسێك بەهۆی ئیشکال و تەئویلێکەوە دووچاری هەڵەیەکی عەقیدەیی بووبێ هەر یەك سەر نابێ حوکمی کافر بوونی بەسەردا بدەین، بەڵام کەسێك بە بێ پاساوو تەئویل کوفرێك بکات حوکمی بەسەردا دەدەین، کەواتە کوفر کردن یان کوفر گوتن حوکمەکەی لە کەسێکەوە کە بە هۆی تەئوێلێکی هەڵەوە یان ئیشکالێکی فیکرییەوە دووچاری بووە، جیاوازە بۆ کەسێك کە بە بێ هیچ بیانوو و پاساوێك و هەر لە خۆڕا کوفر دەکات، بەڵگەشمان لەو بارەوە بەسەرهاتەکەی (قدامة بن مظعون)ە

کە یەکێك بووە لە هاوەڵان و لەگەڵ کۆمەڵێك دا لە (شام) شەڕابیان خوارد بۆوە و هێنایانن بۆ لای خەلیفە (عمر بن الخطاب) خوا لـێی ڕازی بێ و (علي)یش خوا لـێی ڕازی بێ لەو کاتـەدا لەوێ دەبێ، جا کاتێـك خەلیفە لـێی دەپرسێ: بۆچی خـواردووتەوە؟ ئایەتەکـەی (المائدة)ی بە بەڵگە دێنێتەوە: ﴿ **لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا...** ﴾[228] جا هەندێکیان ڕایان وابوو کە لە گەردنی بدەن گوتیان چونکە ئەو ئایەتە پێش حەڕام کردنی(خمـر)ە و فەرموویەتی : کەسێك پێش ئەوەی شەڕاب حەڕام کرابێ خواربیەتەوە گوناحی نەگەیوەتێ، بەڵام وا دیارە ئەو ئێستا بە حەڵاڵی دەزانێ، بۆیە دەبێ لە گەردنی بدەین ، بەڵام (عمر) و (علی) خوا لـێیان ڕازی بێ گوتیان نەخێر باڵێی بپرسین بۆچی وا دەڵێ؟ ئەویش گوتی: من وای لێ حاڵی بووم کە ئەم ئایەتە شەڕاب خواردنەوەی حەڵاڵ کردبێ ! جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە(قدامە)بە تەئویلێکی هەڵە لە ئایەتەکە حاڵی بوو بوو حوکمی کوفریان بەسەردا نەدا، بەڵکو سزای شەڕاب خواردنەوەیان دا، کە بە ڕای زۆربەی زانایان لێدانی (40) یان (80) دارە[229].

سێیەم: کەسێك دوور لە وڵات و کۆمەڵگای مسوڵمانان ژیابێ و وەرگرتن و فێربوونی زانیاری شەرعیشی بۆ مەیسەر نەبووبێ حوکمی جیایە لە کەسێك کە لە نێو مسوڵمانان دایە و شتی ئاگا لـێیە، چونکە خوای

---

(228) الـمائدة (93) .

(229) لە (المصنف) دا (عبدالرزاق) هێناویەتی - وە (ابن ابی شیبە) و (البیهـقی) و (الحاکم) و (ابن المنذر) و غەیری ئەوانیش هێناویانە.

پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَ وُسْعَهَا ﴾[230] واتە: خوا لە هیچ کەسێك داوا ناکات تەنیا بە ئەندازەی ئەوە کە لە توانای دایە هەروەها فەرموویەتی : ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ ﴾[231] واتە: جا ئەوەندەی پێتان دەکرێ پارێز لە خوا بکەن.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی : **(واذا امرتكم بامر فأتوا منه ما استطعتم) رواه البخاري** واتە: وە ئەگەر فەرمانم بە کارێك پێ کردن چەندەی پێتان دەکرێ لــێی ئەنجام بدەن.وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :

(يدرس الاسلام كما يدرس وشي الثوب، حتى لا يدري ما صيام (وفي رواية الالباني) (ولا صلاة) و لا صدقة ولا نسك و لَيُسرى على كتاب الله في ليلة فلا يبقى في الارض منه آية ويبقى طوائف من الناس الشــيخ الكبير و العجوز يقولون ادركنا اباءنــا على هذه الكلمــة لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ فنحــن نقولها)[232] واتە: ڕۆژگارێك دێت ئیسلام دەپووکێتەوە وەك چۆن ڕەنگی قوماش سپات دەبێتەوە و دەچێتەوە ئاواش ئیسلام لە نێو خەڵك دا نامێنێ تا وای لــێ دێ خەڵك نازانێ نوێژ و ڕۆژو زەکات و قوربانی سەربڕین و عبادەت چی یە، وە لە شەوێك دا کتێبی خوا هەڵدەگیرێتەوە و یەك ئایەتیشی لەسەر زەوی نامێنێ، کۆمەڵێك لە خەڵکی دەمێننەوە پیرە پیاوو پیرە ژن دەڵێن: ئێمە باب و باپیرانمان لەسەر ئەم وشەیە بینیوە دەیانگوت (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) ئێمەش هەر ئەوەندە دەزانین، (صلة بن ظفر) کە ئەم فەرموودەیەی لە (حذيفة) بیست

(230) البقــرة 286.

(231) التغــابن (16) .

(232) ( رواه حاكم و صححه على شرط مسلم/ و صححه الذهبي/ وصححه الالباني/ السلسلة الصحيحة بەرگــی (1) ژمارە (87).

دەڵێ بە (حذيفة) م گوت: (فما تُغني عنهم لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وهم ما يدرون ما صيام ولا صدقة ولا نسك، فأعرض عنه حذيفة فردها عليه ثلاثاً، كل ذلك يُعْرِضُ عنه حذيفة ثم أقبل عليه في الثالثة فقال: يا صِلَةُ تُنْجيهم من النار). واتە: جا باشە گوتنی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) چ سوودێکیان پێ دەگەیەنێ کە نازانن ڕۆژوو و زەکات و قوربانی سەربڕین و عبادەت چی یە؟!، سێ جاران وای پێگوت (حذيفة) ڕووی لە لا نەدەکرد کە جاری سێیەم دووبارەی کردەوە (حذيفة) گوتی: بەڵێ ئەی (صِلة) سوودیان پێ دەگەیەنێ و لە ئاگر ڕزگاریان دەکات.

جا ئایا بۆچی لەو کاتەدا خەڵکی بە گوتنی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) ڕزگاریان دەبێ؟!

چونکە لەو کاتەدا هەر ئەوەندەیان لە توانادا هەیە و بۆیان دەکرێ و مسوڵمانەتی هەر ئەوەندەی لێ ماوەتەوە، بەڵێ بەرێزان تەکلیف لە قەدەر توانایە و ئینسان چەندەی لە توانادا هەبێ کە ئەوەندەی کرد چ لە بواری ئیمان چ عبادەت چ هەر بوارێکی دیکەدا، خوای بە بەزەیی لێی وەردەگرێ و لێی خۆش دەبێ هەر بۆیەش (أبو طالب)ی مامی پێغەمبەر ﷺ لێی قبووڵ دەکرا کە ئەگەر لەسەرە مەرگ دا گوتبای (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)[233]، چونکە لە سەرە مەرگ دا فریای ئەوەندە دەکەوێ.

هەروەها لە ڕووداوەکەی (ئوسامە)ش دا ئەو کابرایەی کە (اسامة) کوشتی ئەویش تەنیا بەوەی بڵێ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) لێی قبووڵ کراوە، بۆچی؟! چونکە شمشێری لەسەر سەر ڕاگیراوە و هەر فریای ئەوەندە دەکەوێ لەو کاتی دا.

(233) وەك لە (صحيح مسلم) و (سنن) دا هاتووە.

وە ئەو فەرموودەیەش کە (بخاري و مسلم) دەیگێڕنەوە کە کابرایەك دەبێ (99) کەس دەکوژێ و دوایی دەیکات بە (100) پاشان دەینێرن بۆ شوێنێك کە لەوێ خواپەرستی بکات و لە نیوەی ڕێگایە دەمرێ و دواییش خوا دەیباتە بەهەشت، چونکە ئەویش هەموو توانا وتەقەللای خۆی خستۆتە کارو ئەوەندەی لە تواناندا بووە کە واز لە خراپە بهێنێ و بچێت بۆ شوێنێك لەوێ خواپەرستی بکات، دیسان بەڵگەیەکی دیکەیە لەو بارەوە.

**4- پەلە نەکردن لە بە کافر دانانی خەڵك دا بە بێ هەبوونی بەڵگەی شەرعی ڕوون وە کەم تەرخەمی نەکردنیش لە بە کافر دانانیان دا لە کاتێك دا کە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا هەبێت.**

بۆ ئەوە کە نابێ پەلە بکرێ لە بە کافر دانانی خەڵك دا مادام ڕواڵەتەکەیان مسوڵمانە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرن، یەکێك لەوانە ئەم فەرموودەیەیە: ((**أيما رجل قال لاخيه يا كافر فقد باء بها احدهما**))[234] واتە: هەر پیاوێك بە برایەکەی خۆی بڵێ ئەی کافر ئەوە گوناهی بە کافر دانانەکە چووەتە ئەستۆی یەکێکیانەوە، ئەگەر کابرا کافر بێ (کابرای وا پێ گوتراو) ئەوە چۆتە ئەستۆی، ئەگەر نا دەگەڕێتەوە بۆ ئەستۆی کابرای بە کافر دانەر.

هەروەها فەرموویەتی: ((**ومَنْ لَعَن مؤمناً فهو كَقَتْلِه، ومَنْ قَذَف مؤمنا بكُفرٍ فهو كَقَتْله**))[235] واتە: هەر کەسێك لەعنەت لە ئیماندارێك بکات ئەوە وەك کوشتنی وایە، هەر کەسێکیش کەسێکی مسوڵمان و ئیماندار تۆمەتبار بکات بە کوفر وەك کوشتنی وایە.

(234) بخاري و مسلم.

(235) بخاري و مسلم.

وە فەرموویەتی: ((**لا يرمي رجــل رجلا بالفسوق ولا يرميه بالكفر الا ارتدت عليه ان لم يكن صاحبه كذلك**))[236] واتە: هەر کەسێك کەسێك تۆمەتبار بکات بە لە تاعەت دەرچوون (فسق)، وە هەر کەسێك کەسێك تۆمەتبار بکات بە کافر بوون ئەگەر کابرای بە فاسق دانراو و بە کافر دانراو وانەبێ، ئەوە گوناحی بە فاسق دانان و بە کافر دانانەکە بۆ ئەو کەسە دەگەڕێتەوە کە بە فاسق و بە کافری داناون.

بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کە (نووي)[237] ڕوونی کردۆتەوە کە مەبەست لە گەڕانەوەی فیسق و کوفرەکە بۆ لای خاوەنەکەی (واتە بێژەری (فسق) و (کفر)ەکە ، ئەوەیە کە گوناحی فاسق و بە کافر دانانەکە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە نەك کابرا پێی کافر بوو بێ، بەڵام لە حاڵەتێك دا پێی کافر دەبێ کە تەنها لەبەر ئیمانەکەی بە (کافر)ی دابنێ و، بڵێ: لەبەر ئەوەی ئیمانت هەیە بە کافرت دادەنێم! ئەو کاتەش هۆی کافر بوونەکەی ئەوە نیە کە کابرای ئیمانداری بە کافر داناوە وخۆی دووچاری درۆو بوختان کردوە. بەڵکو هۆی کافر بوونەکەی ئەوەیە کە (إيمان)ی بە (کفر) لە قەڵەم داوە !

**5- کارپێکردنی بنچینـەی حوکمی کوفر بە سـەر خەڵك دادان** (**قاعدة اطلاق حكم الكفر على الناس**): زانا و پێشـــەوایانی ئیسلام ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێ بۆ کۆنترۆڵ (ضبط)کردنی ڕێباز و شێوازی بە کافر دانان (التكفير) بنچینە (قاعدة) یەکیان داناوە کە بە:

(ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) تەعبیریان لێ داوە، واتە:

---

(236) بـخاري و مسلم.

(237) بـخاري و مسلم.

(چەسپانی مەرجەکان و لاچوونی پەرچەکان).

لەم بنچینەیەشەوە دەردەکەوێ کە دروست نیە بابایەکی مسوڵمان ببرێتە ڕیزی کافرانەوە و بە بێ ئیمان دابنرێ هەتا سەرجەم مەرجەکانی کافر کران نەهاتبنە دی و تێکڕای پەرچەکانیش لانەچووبن، چونکە جاری وا هەیە بابایەك قسەکەی کوفرە یان شیرکە یان ڕەفتارو هەڵس و کەوتێکی ، بەڵام دروست نیە بڵێین ئەو کەسە خۆی (کافر) یان (مشرك)ە، بۆچی؟ لەبەرئەوەی مەرجەکانی کافر بوونی تێدا نەهاتوونە دی یان پەرچ و کۆسپەکانی کافر کرانی لانەچوون کەواتە:

با بزانین هەر کام لە مەرجەکانی بە کافر دانان (شروط التكفير) و پەرچەکانی بە کافر دانان (موانع التكفير) چی و چین؟!

**مەرجەکانی بە کافر دانان بە گشتی ئەم چوارەن:**

1- دەبێ حوکمەکە بە پێی ڕواڵەت و ئاشکرای ئینسان بێ:

ئەوەش کە لە ئینسان دا ئاشکرایە وەك پێشتریش باسمان کرد دوو شتن: قسەی زمان و کردەوەی ئەندامەکان. کەواتە تەنها بەوەی کە لە ئینسان دەبیستین یان دەبینین دەتوانین حوکمی لە بارەوە بدەین، وەك زانایان گوتوویانە: (نحن نحكم بالظاهر والله يتولى السرائر) .

2- بە کوفر دانانی ڕەها، بە کافر دانانی دیاری کراو ناگەیەنێ:

ئەم بنچینەیەش یەکێکە لەو بنچینانەی کە زانا و پێشەوایانی ئیسلام لەسەریان پێکهاتوون و بە چەند شێوەیەك تەعبیریان لێ کردوە کە یەکێکیان ئەمەیە:

(التكفير المطلق لا يستلزم تكفير المعين) .

مەبەستیش لەم بنچینە (قاعدة)یە ئەوەیە کە هەر کاتێك کوفرو شیرك و نیفاقمان لە کەسێك بینی یان بیست بۆمان هەیە بڵێین: فلانە قسە و ڕەفتاری فلانکەس کوفرە یان شیرکە یان نیفاقە. بەڵام دروست و ڕەوا نیە بڵێین: هەر کەسێك ئەو جۆرە کوفرو شیرك و نیفاقەی لێ هەست پێکرا ئەوە حەتمەن کافرو هاوبەش دانەر (مشرك)و مونافیقە. ئاوا بە موتڵەقی.

بە واتایەکی دیکە:

دروستە بڵێین: فلانە قسە و تەعبیرە، یان فلانە کردەوە و ڕەفتارە لە هەر کەسێك بپشـــکوێتەوە بە کوفر یان بە شـــیرك دادەنرێ و خاوەنەکەی ئەگەر مسوڵمان بێ پێی لە دین هەڵدەگەڕێتەوە و لە بازنەی ئیسلام دەردەچێ، بەڵام بۆ جێبەجێ کردنی (تطبیق)ی ئەو حوکمە لەســـەر کەســـێکی دیاری کراو (شخص معین) دەبێ سەرنج بدرێ ئەو کەسە مەرجەکانی کافر بوونی هەموو تێدا هاتوونە دی و پەرچەکانی کافر بوونی لەبەردەم دا لاچوونە یان نا !

هەر بۆیەش زانایان گوتوویانە: (قد یکون قول الرجل و فعله کفراً ولا یکون هو کافرا)، واتە: جاری وا هەیە قسەی کابرا و کردەوەکانی کوفرە، بەڵام کابرا خۆی بە کافر دانانرێ.

3- بیانوو بڕ کران و بەڵگە لەسەر تەواو کران:

یەکی دیکە لەو شتانەی بە مەرج گیراون بۆ حوکمی کوفر بەسەر کەسێك یان کۆمەڵێکی دیاری کراودا دان بریتی یە لەوە کە ئەو بابایە باش باش حاڵی کرابێ و (البـــلاغ المبین)ی پێ ڕا گەیەنرابێـت، چونکە جاری وایە بابایەکی نەزان قسەیەك دەکات یان ڕەفتارێك ئەنجام دەدات کە لە تەرازووی

شەرع دا بە شـــیرك وكوفر دادەنرێ، بۆ وێنـــــە: عەوامێك یان سۆفی و دەروێشـــــێكی ناحاڵی لە شـــێخەكەی یان لە گۆڕەكەی دەپاڕێتەوە كە بێگومان ئەوە شیركی گەورەیە، بەڵام بێگومان بۆمان نیە یەكســەرو بێ سێ و دوو ئەو جۆرە كەسانە بە هۆی كوفرو شـــیركەكەیانەوە بە كافر و (مشرك) دابنێین. بۆچی؟!

چونكە ئەو جۆرە كەسانە هەیانە هەم ئەو مەلایەش كە ساڵەهای ساڵە نوێژی لە دوا دەكات و هەم ئەو شـــێخەش كە پەیڕەوی لـــێ دەكات بگرە مامۆستای مەلایەكەشی و شێخی شـێخەكەیشی هەر گیرۆدە بوون بەو دەردی شـیركەوە بێ ئەوەی پێی بزانن!!

دیارە هەر بۆیەش ڕاگەیاندنی ڕۆشن (البلاغ المبین) ئەركی سەرەكی و بنەڕەتی پێغەمبەرانی خوایە ﷺ وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ فَهَلْ عَلَى الرُّسُلِ إِلاَّ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ ﴾(238)

﴿ وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ ﴾(239) .

4- هەموو جۆرە گوناحێك كوفر و شیرك نیە و ئینسانی پێ كافر نابێ:

پێشتر باسمان كرد كە گوناح بریتی یە لە چواندنی فەرزێك یان كردنی قەدەغە كراوێك، وە باسمان كرد كە (خوارج) هەموو گوناحێك بە كوفر و خاوەنەكەی بە كافر دادەنێن، بەڵام زانا و پێشەوایانی ڕەسەن دەڵێن نەخێر وا نیە، بە بەڵگەی فەرمایشتی خوای بێ هاوتا (سبحانه وتعالـى):

(238) النحـــل (35) .

(239) العنكبـــوت (18) .

﴿ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ ﴾(240)
واتە: بێ گومان خوا لەوە نابوورێ کە هاوبەشی بۆ دابنرێ بەڵام بۆ کەمتر لەوە لە هەر کەسێك کە بیەوێ دەبوورێ ...

بەڵام پێویستە لێرەدا بزانرێ کە هاوبەش بۆ خوا دانان (الشرك بالله) تاکە گوناهێك نیە کە بە کوفر دادەنرێ و لێبوردنی خوا نایگرێتەوە. بەڵکو گوناهی دیکەی واش هەن کە شیرك نین بەڵام بە کوفر دادەنرێن، بۆ وێنە: قسە گوتن بە پێغەمبەری خوا ﷺ و بێ ڕێزی بەرانبەر نواندنی. کە خوای دادگەر بە دەقی قورئان بە کوفری داناوە، وەك فەرموویەتی :
﴿ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ، لاَ تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ﴾(241) واتە: بڵێ: ئایا گاڵتە بە خواو ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی دەکەن؟! بڕ و بیانوو مەهێننەوە چونکە بێگومان پاش ئیمانەکەتان کافر بوونەتەوە..

هەروەها دەغەڵیی (نفاق)یش هەرچەندە شیرك نیە بەڵام کوفرە و پیسترین جۆری کوفریشە، وەك لە فەرمایشتی خوای کاربەجێدا دەردەکەوێ:
﴿ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنْ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا﴾(242)
ئێستاش دوای ئەوەی تیشکێکمان خستە سەر مەرجەکانی بە کافر لە قەڵەم دان با تیشکێکیش بخەینە سەر پەرچەکانی کافر کردن (موانع التكفير) پەرچەکانی کافر کردنیش بە گشتی ئەم پێنجەن:

(240) النساء ( 48،116).
(241) التوبة (65، 66).
(242) النساء (145) .

1- **نەزانین (الجهل)**: ئاشکرایە ئەو نەزانینەی کە دەبێتە پەرچ(مانع) لەبەردەم بە (کافر) و(مشرك) دانرانی بابایەك دا کە کوفرو شیرکی لێ پشــکوتوتەوە، هەموو جۆرە نەزانینی یەك نیە. بەڵکو نەزانیی یەکە کە خاوەنەکەی بە عوزر بۆ هێنراوە (معذور) دادەنرێ، ئەویش ئەوەیە کە ئەو کەسە کەمتەرخەمی نەکردبێ و بە گوێرەی توانای هەوڵی دابێ شارەزا بێ بەڵام بۆی مەیسەر نەبووبێ.

ئەگەر نا کەسێك بە ئانقەست و بە هۆی کەمتەرخەمی خۆیەوە لە نەزانیی و بێ ئاگایی و سەرگەردانیی دا مابێتەوە ئەوە حوکمەکەی جیایە بە (معذور بالجهل) دانانرێ.

بەڵگەش لەسەر ئەوە کە نەزانیی (جهل) پاساودار یەکێکە لە پەرچەکانی بەردەم حوکمی بە کافر دانران زۆرن، یەکێکیان ئەم ئایەتەیە:

﴿ رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾[243] واتە: پێغەمبەرانێکی موژدە دەر و ترسێنەر تاکو پاش ڕەوانە کرانی پێغەمبەران خەڵکی بەڵگەیان لەسەر خوا بە دەستەوە نەمێنێ، وە خوا زاڵ و کاربەجێیە.

کەواتە: هەر کەسێك موژدەدان وترساندن (تبشير وانذار)ی پێغەمبەرانی خوای (عليهم الصلاة والسلام) و ئەو پەیامــــــەی کە خوای باڵا دەست پێیدا ناردوون، پێی نەگەیشتبێ مانای وایە بیانوو بڕ نەکراوە و بەڵگەی هەر بە دەستەوە ماوە!

---

(243) النســاء (165) .

وه یەكی دیكە لەو بەڵگانە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوایە ﷺ كە (بخاري و مسلم) لێیان گێڕاوەتەوە كە بەسەرهاتی كابرایەك دەگێڕێتەوە كە زۆر تاوانبـار و خراپە كار بووەو لە كاتی سەرەمەرگی دا وەسیەت بۆ كوڕەكانی دەكات كە پاش مردنی لاشـەكەی بسووتێنن و خۆڵەمێشـەكەشی نیوەی بە دەریادا بكەن و نیوەشـی لە بیابان دا بە بەربادا بكەن. تاكو - بە خـەیاڵی خۆی - خوا نەتوانێ زیندووی بكاتەوە و دووچاری ئازار و سزای پاش مەرگ نەبێ !

بەڵام پاش مردنی و سـووتێنرانی خوا (سبحانه وتعالـى) زیندووی دەكاتەوە و پێی دەفەرموێ : بۆچی وات كرد ؟!

ئەویش دەڵێ: ئەی خوای ! خۆت ئاگاداریی لە ترس و بیمی ئـازار و سزای تۆ بوو ! ئینجا خوای بە بەزەییش لـێی خۆش دەبێ و عەفوی دەكات.

كەواتە:

هەرچەندە ئەو كابرایە نكوولێیی كـردوە لە یەكێك لە سیفەتەكانی خوا (سبحانه وتعالى) بەڵام چونكە بەهۆی نەزانیی (جهل)ێكەوە بووە كە بۆی مەیسەر نەبووە لە خۆی دا لاییبەرێ نەبۆتە هۆی بە كافر و بێ بڕوا لە قەڵەم درانی.

## 2- **بە هەڵە داچوون** (**الخطأ**) :

لەو بارەشەوە دیسان بەڵگە زۆرن، كە هەر كاتێك ئینسان بەهۆی بەهەڵەدا چوونەوە دووچاری قسەیەك یان ڕەفتارێك ببێ كە لە ئەسڵ دا كوفر نەبێت، لەسەری حیساب ناكرێ، بۆ نموونە:

1- خوای بە بەزەیی فەرموویەتی : ﴿ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُمْ بِهِ وَلَكِنْ مَا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا ﴾(244) .

واتە: وە لەسەر شتێك کە بە هەڵە دەیکەن (چ قسە بێ چ کردەوە) گوناهبار نابن، بەڵکو بە شتێك گوناهبار دەبن کە بە ئانقەست و لە دەروونەوە بڕیاری لەسەر دەدەن، وە بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

2- هەروەها خوای بەخشندە فەرموویەتی : ﴿...رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا ﴾ (245) .

واتە: پەروەردگارمان بەهۆی گوناهێکەوە کە لە ئەنجامی لە بیر کردنمان یان هەڵە کردنمان دا گیرۆدەی دەبین سزامان مەدە...

دیارە ئەم پاڕانەوەیەش بۆیە خوای بەخشەر فێری بەندەکانی کردوە کە داواکارییەکەیان جێبەجێ بکات، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەریش دا ﷺ هاتوە کە خوا (سبحانه وتعالى) فەرموویەتی: ئەوە داوایەکەتانم جێبەجێ کرد.

3- (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەرهاتی پیاوێکی گێڕاوەتەوە کە لە بیابان و چۆڵەوانییەك دا وڵاخەکەی کە نان و ئاوەکەیشی لەسەر پشتیەتی بزر دەکات، ئینجا پاش گەڕان و سووڕانێکی زۆر و دوای ئەوەی لێی نا ئومێد دەبێ وبرسێتی وتێنوێتی تینی بۆ دێنێ دەچێتە ژێر سێبەری درەختێك و پاڵدەکەوێ و چاوەڕێی مەرگ دەکات، بەڵام هەر هێندە دەزانێ ئەوە وڵاخەکەی لەبەردەمی وەستاوە، کابراش هێندە دڵخۆش دەبێ دەڵێ: (اللهم أنت عبدي وانا ربك) خوایە گیان! تۆ

---

(244) الاحـزاب (5) .
(245) البقـرة (286) .

بەندەمی و من پەروەردگارتم!، لەبەر زێدە دڵخۆشی یان لـێی تێك دەچێ! وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی‌یەتی : (أخطأ من شدة الفرح).

## 3- زۆر لێکران و ناچار کران (الاکراه والاضطرار) :

ئەمیش یەکی دیکە لەو پەرچانەی کە دەبنە ڕێگر لە بەردەم حوکمی بە کـافر دانرانی ئینسانی مسـوڵمان لە کاتێك دا کە قسـە و هەڵوێستێکی کافرکەرانەی لێ دەپشکوێتەوە.

بەڵگەش لەو بارەوە دیسـان زۆرن بۆ نموونە:

1- فەرموودەی خوای زانا و توانا (سبحانه وتعالى): ﴿ مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ﴾ [246] واتە: هەر کەسێك کوفر بە خوا بکات پاش ئیمان هێنانی (سزایەکەی سەخت و گەورەیە) مەگەر کەسێك زۆری لـێ بکرێ و ناچار بکرێ و دڵیشی ئارامگرتوو بێ بەهۆی ئیمانەوە..

توێژەرەوانی[247] قورئانیش باسیان کردوە کە هـۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە بەسەرهاتەکەی (عمار بن یاسر)بوو خوا لـێی ڕازی بێ کە پاش ئەوەی باب ودایکی عەممار کە (یاسر و سمیة) بوون خوا لـێیان ڕازی بێ هەردووکیان لە ژێر ئەشکەنجەی بێڕەزای کافرەکان دا شەهید کران و خۆیشی زۆر ئازار و ئەشکەنجە درا، لە ژێر فشاردا کوفری بە زاردا هات تاکو قوتاری ببێ، جا کاتێك چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە -

(246) النحـل (106) .

(247) (مسلم) و لەوانی دیکـەش گێـڕاویانەتەوە.

بە گریانەوە - پێغەمبەری خوا پێی فەرموو: دڵت چۆنە؟! گوتی: دڵم پڕە لە ئیمان و ئارامگرتوویە، ئەویش پێی فەرموو: (فإن عادوا فعد) هەر کات ئەوان دەستیان کردەوە بە ئازارو ئەشکەنجەت تۆش قسەی وا بکە کە دەست لە ئەشکەنجەدانت هەڵگرن - هەرچەندە کوفریش بێت - .

2- فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ : (**إنَّ اللهَ وضَعَ عن امتي: الخطأ و النسيان وما استكرهوا عليه**). أخرجه إبن ماجة برقم :2045 و ابن حبان برقم : 7219 عن ابن عباس

واتە: گوناحی سێ حاڵەتان لەسەر ئۆممەتەکەم لابراوە:

بەهەڵەدا چوون و لە بیر چوونەوە و هەر شتێك کە بە زۆر پێیان کرابێ.

## 4- لە بیر چوونەوە (النسيان) :

ئەمیش بەهەمان شێوە یەکی دیکەیە لە پەرچ و کۆسپەکانی بەردەم حوکمی بە کافر دانان و، بەڵگەش لەو بارەیەوە زۆرن، بۆ نموونە:

1- فەرمایشتی خوای بەرز و مەزن کە لەسەر زاری بەندەکانی دەفەرموێ:

﴿ **رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا...** ﴾[248] .

کە پێشتریش مانامان کرد.

2- فەرمایشتی خوا لەسەر زمانی مووسا عليه السلام کە بە بەندە ساڵحەکەی هاوەڵی دەڵێ: ﴿ **..لاَ تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلاَ تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا** ﴾[249].

(248) البقـرة (286) .

(249) الكهـف (73) .

واتە: لێم مەگرە کە بەهۆی لە بیر چوونەوەمەوە (هەڵەم کرد)وە لە ئیش و کارم دا بارگرانم مەکە و سەغڵەتم مەکە...

3- فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ : (**رفع عن امتي: الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه**) کە پێشتریش مانامان کرد.

## 5- تەئویل کردن (التأويـــــل) :

پەرچێکی دیکە لەبەردەم حوکمی بە کافر دانانی کەســـــێك دا کە بە مسوڵمان دانراوەو کوفر و شیرکێکی لێ دەرکەوتوە بریتی یە لە تەئویل کردن، مەبەستیش لە تەئویل کردن لێکدانەوە و تەفسیر کردنی دەقێکی قورئان و سوننەتە بە هەڵە کە سەر بکێشێ بۆ نکوولێی کردن لە ڕاستییەکی شەرعی، یان حـــەلاڵکردنی حەڕامێك و حەڕام کردنی حـــەلاڵێك .... یان .... هتد، کە بێگومان ئەو جۆرە شتانە بە کوفر دادەنرێن.

نموونەی زەقیش لەو بارەوە بەسەرهاتەکەی (قــدامة بن مظعـــــــون) و هاوەڵەکانییەتی کە پێشتر ئاماژەمان پێ کرد.

شایانی باسیشە کە ئەم مەسەلەیەش دەچێتەوە نێو مەسەلەی بە هەڵە داچوون (الخطأ)ەوە کە پێشتر خستمانە ڕوو، چونکە تەئویل کردن و لێکدانەوەی نا ڕاست کە سەر بکێشێ بۆ کوفر جۆرێکە لە جۆرەکانی بە هەڵە داچوون و بە هەڵە دووچاری کوفر گوتن و کوفر کردن بوون.

بەڵێ بەڕێزان !

ئەمانەی ڕابردن مەرجەکانی بە کافر دانان وپەرچەکانی بەردەمی بوون و، هەر کاتێك ویســـترا حوکمی کافر بوون و لە دین دەرچوون بەسەر بابایەکی

مسولّمان دا بچەسپێنرێ بەهۆی ئەوەوە کە شتێکی لێ بیستراوە یان بینراوە کە بە (کفــر) یان (شــرك) لە قەڵەم دەدرێ پێویستە یەك ســەر و بێ ســێ و دوو لێکردن بە (کافر) دانەنرێ، هەتا بە وردی سەرنجی ئەو بنچینە (قاعدة) و تەرازووە شەرعییە نەدرێ و بابای کوفرکەری پێ هەڵنەسەنگێنرێ داخۆ:

مەرجەکانی کافر بوون (شروط التكفير)ی سەرجەم تێدا هاتوونە دی و تێکڕای پەرچەکانی کافر بوون (موانع التكفير)ی تێدا لاچوونە تاکو حوکمی کوفری بەسەردا بدەین و بلّێیــن: فلاّن کەس کافرە و فڕی بەسەر ئیسلامەوە نەماوە، یان نەء. تاکو پەلە نەکەین لەو حوکم دانەدا و خۆمــــان دووچاری گوناهی گەورەی بە ناهەق کافر کردنی مســــولّمانێك نەکەین کە بە پێی شــەریعەتی خوا (سبحانه وتعالـى) ناکرێ بە کافر لە قەڵەم بدرێ لەگەڵ ئەوەش دا کە جۆرێك لە کوفریان شیرکی لــێ دەرکەوتوە.

سبحانك اللهم وبحمدك اشهد الا اله الا انت استغفرك واتوب اليك.

الحمد لله كما ينبغي لجلال وجهه وعظيم سلطانه والصلاة والسلام على نبينا محمد وآله وأصحابه واتباعه وأعوانه .

بەڕێزان !

شتێکی ئاشکرا و ڕوونە کە گەورەترین بەرهەم و بەرەکەتی ئیمان ئەوەیە کە ئینسان پێی شایستەی ئەوە بێ کە بە دیداری خوا شاد بێ و بچێتە بەهەشت ولە دۆزەخ ڕزگاری بێ، ئا ئەوە گەورەترین بەرهەم وگەورەترین دەوری ئیمانە.

وە لە ڕاستی دا خوای پەروەردگار (سبحانه وتعالى) کە بانگی بەندەکانی کردوە ئیمانی پێ بێنن و ئیمان بە پێغەمبەرەکانی (عليهم الصلاة والسلام) و بەرنامە وشەریعەتەکەی بێنن هەر بۆ ئەوە بووە کە بەختەوەریی هەتا هەتایی و نەبڕاوەیی بەهەشتیان پێ ببڕێ لە پێش هەموو شتێك دا، پاشان دەستکەوت و بەرهەمەکانی دونیایی ئیمانیشیان دەست بکەوێ.

بەڵگەشمان لەو بارەوە ئەوەیە کە هەموو ئایەتەکانی قورئان کەم و زۆر ئەوەیان لێ دەفامرێتەوە کە ئەوەی بەندەکانی بۆ بانگ دەکرێن بۆ ئیمان و، ئامانج و مەبەستە لە پەیامی خوا و بانگەوازی پێغەمبەران دا (عليهم الصلاة و السلام) ئەوەیە کە شایستەی ئەوە بن خوا لێیان ڕازی بێ و بچنە بەهەشت.

بۆ نموونە خوای بەخشندە و بەخشەر دەفەرموێ: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِيكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ(10)تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ

**وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ(11)يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ(12) وَأُخْرَى تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ مِّنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ ﴾**[250] واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بازرگانی (و سەودا و مامەڵە)یەکتان پێشان بدەم کە پێی ڕزگار دەبن لە ئازارێکی بە ئێش، بڕوا بە خوا و پێغەمبەرەکەی بێنن و لە پێناوی خوادا بە ماڵ و گیان جیهاد بکەن ئەوە بۆ ئێوە (لە هەموو شتێك) باشترە ئەگەر بزانن (باشتریەکەش لەوە دایە کە) گوناهەکانتان دەبووری و دەتان خاتە چەند ڕەز و باغێکەوە کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن ﴿خوای پەروەردگار بە زۆری وەسفی بەهەشت بە باخ و ئاو وڕووبار و سەوزایی دەکات، چونکە دڵی ئینسان زیاتر لە هەموو شتێك بە ئاوو ڕووبار و کانی و کانیاو و ڕەز و باغ و سەوزایی دەپوشکوێ و دەکرێتەوە﴾ وە چەند خانووبەرە و کۆشك و تەلارێکی پاك و چاك لە نێو ئەو بەهەشتانەدا هەن کە هەمیشەبین، بێ گومان ئەوە (سەرکەوتن و دەستکەوت و) بردنەوەی هەرە مەزنە، وە بەرهەمێکی دیکەی ئیمان و جیهاد کە دەستتنان دەکەوێ، ئێوە حەزی لـێدەکەن ئەوەیە کە یارمەتی و پشتگیرییان لە خواوە بۆ دێت، وە ئازاد کردنی وڵاتانتان پێ دەبەخشێ. (دەگونجێ مەبەست پێی ئازاد کردنی (مەککە)یان ئازاد کردنی نیوە دوورگەی عەرەبی، یاخود سەرجەم وڵاتانی دیکە بێ کە لە ژێر نیری تاغووتەکان دا بووە خەڵکی یان تێدا چەوسێنراوەتەوە﴾ وە لە کۆتایی دا دەفەرموێ: (وبشر المؤمنين) مژدە بە ئیمانداران کە لە پێشـــدا ئەو

---

(250) الصف (10-13).

سەرکەوتنە مەزنەیان هەیە کە لە گوناح خۆش بوون و بە بەهەشت شـــاد بوونە، پاشان ئەو دەستکەوتە لاوەکی یەشیان دەبێ کە ئەوان زۆری حەز لــێ دەکەن و پێیـــــان خۆشـــە کە بریتی یە لەوەی بەسەر دوژمنیان دا ســەر دەکەون ودەروازەی شـــار و وڵاتانیان بۆ دەکرێتەوە و دین و بەرنامەی هەقی خوای پەروەردگاریان تێدا دەچەسپێنن ومرۆڤەکان لە تاریکی و شەوە زەنگی کوفرو فەسادو ستەم دەردێنن.

کەواتە:ڕاستە گەورەترین دەستکەوت وبەرهەمی ئیمان ئەوەیە کە ئینسان وا لــێ دەکات شایســــتەی ئەوە بێ خوا لــێی خۆش بێ و بە دیـــــداری خوا (سبحانه وتعالى) شاد بێت، وە لە دۆزەخی بەتین ڕزگاری بێت و لە بەهەشتی بەرین دا نیشتەجێ بێت.

بەڵام وێڕای ئەوەش ئیمان لەم ژیانی دونیایەمـــــان دا چەندان بەرهەم و کاریگەریی دیکەی گەورە و گرنگـــی هەن، کە لە ڕاستی دا هەر کەسێك ئەو بەرهەم و کاریگەری یانەی ئیمان لە دونیادا چنگ نەخات شایستەی ئەوەش نابێ کە لە دوا ڕۆژدا بەرهەمی هەرە گەورەی ئیمانی دەست بکەوێ، چونکە هەر کەسێك ئەو بەرهەم و کاریگەرییانەی ئیمانی کە تۆزێکی دیکە باسیان دەکەین لە دونیادا تێدا نەیەنە دی و لــێی دەرنەکەون دیارە ئیمانەکەی ئەو ئیمانە نەبووە کە پێی بچێتە بەهەشت، بە بەڵگەی ئەوە کە لە ژیانی دنیایی دا لێی بەهرەمەند نەبووە.

### بەرهـــەم و کاریگـەری یەکانی (ئیمـــان):-

**(یەکەم): ئیمان و خۆ ناســین:**

خۆشەویستەکانم، هەموو ئینسانێك مەگەر عەقڵ و شعووری نەبێت و شێت بێت، ئەگەر نا چەند پرسیارێکی خوارسك (فطري) لە دڵ و مێشکی دا هەن کە هەمیشە خوت خوتە دەکەن و دەیجوولێنن: ئایا ئەم بوونەوەرە (کائنات)ە چی یە؟! لە کوێوە هاتوەو سەرەنجامی بەرەو چی و کوێ دەچێ؟! من چیم وبۆچی هاتووم بۆ ئەم ژیانەی سەر زەوی؟!، کێ هێناومی و بۆ کوێ دەچم؟ ئایا ئەرکم لەم ژیانەدا چی‌یە؟ ئەوانە کۆمەڵێك پرسیاری خوارسك (فطري)ن کە بە درێژایی مێژوو ئینسان هەوڵی داوە وەلامیان بداتەوە، بەلام لە ڕاستی دا لە ڕێگای ئیمان و (وحي) و پەیامی خواوە نەبێ هەرگیز و وەلامی (منطقي) و ماقووڵ و ئارامی هێن و دڵ فێنك کەرەوە و قەناعەت پێ هێنەری ئەو پرسیارانەی دەست نەکەوتوە و دەستیشی ناکەون.

جا خوا پشتیوان بێ لە باسەکانی داهاتوودا چەند لاپەڕەیەك بۆ ئەم مەبەستە تەرخان دەکەین ڕوونی دەکەینەوە کە فەیلەسووفەکان کاتێك ویستوویانە بە پشت بەستنی عەقڵی ڕووت وەلامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە، چەندە گێرۆدەی بۆچوونی سەیرو سەمەرە بوون و چۆن چەند وەلامێکی بێ جێ‌و ناقووڵی ئەم پرسیارانەیان داوەتەوە.

بەلام با سەیری چەند ئایەتێك بکەین کە خوای پەروەردگار (سبحانه و تعالى) وەلامی ئەو پرسیارانە زۆر بە سووك و سادەیی دەخاتە دەستی ئینسان! سەرەتا کەسێك کە بۆ وەلامی ئەو پرسیارانە ناگەڕێتەوە بۆ لای (وحي)و ئیمان خوا ئاوا بۆمان باس و (تصویر) وێنا دەکات و دەفەرموێ: ﴿ **أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَنْ لَمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ**

**مِنْ نُورٍ﴾** [251] واتە: وێنەی ئینسانێکی بێ بڕواو بێ بەش لە ئیمان و هیدایەتی خوا، وەك کۆمەڵێك تاریکایی لەسەریەك کەڵەکە بوو وایە، جا تاریکایی یەکان بریتین لە: شەوێکی تاریك لە نێو دەریایەك دا ئەو دەریایە شەپۆڵ لەسەر شەپۆڵ، لە سەرووی ئەو شەپۆلانەوە هەور، لە سەرووی هەورەوە تاریکایی شەو﴿ **ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ** ﴾ کۆمەڵێك تاریکایی لەسەریەك کەڵەکە بوو، وە ئەو تاریکایی یە خەست و خۆڵە ئەگەر ئینسان دەستی بخاتە بەر چاوی ئەوە نەك هەر نایبینێ، بەڵکو نزیکیش نیە کە ببینێ، بێ گومان هەر کەسێك خوا (سبحانە وتعالی) ڕۆشنایی - لە ڕێگەی پێغەمبەران و (وحي) خۆیەوە - پێ نەدا هەرگیز ڕۆشنایی دەست ناکەوێ. ((بۆ ئەوەی سەر دەربکات و بزانێ لە کوێوە هاتوەو بۆ کوێ دەچێ و (محل)ی لە (إعراب)ی ئەو بوونەوەرە پان و پۆڕەدا چی یە و چۆنە؟!)).

هەروەها بەهۆی بێ بڕوایی و خوا نەناسی یەوە ئینسان حەقیقەتی خۆی لێ ون دەبێت و خۆی فەرامۆش دەکات و نازانێ چی یە، وەك خوای بەرز و مەزن دەفەرموێ: ﴿ **وَلاَ تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ أُوْلَئِكَ هُمْ الْفَاسِقُونَ** ﴾[252] واتە: وە وەك ئەوانە مەبن کە خوایان لە بیر چۆتەوە خواش خۆیانی لە بیر بردوونەوە، واتە: بەهۆی خوا لە بیر چوونەوەوە خۆیان لە بیر چۆتەوە، جا ئایا ئەوە مانای چی یە خۆ ئینسان هەمیشە دەزانێ کە خۆی هەیە؟! واتە بەهۆی خوا نەناسی یەوە خۆیان ناناسن و نازانن بۆچی دروست کراون و لە کوێوە هاتوون و بۆ کوێ دەچن!

---

(251) النور (40).

(252) الحشر (13).

هەر بۆیەش ئەهلی دڵ ئەوانەی كە بۆ تەزكیە كردنی نەفسیان بە ڕێگای شەرع دا ڕۆیشتوون قسەیەكی جوانیان كردوە كە دەڵێن: (مَنْ عرف نفسه فقد عرف ربَّه) هەر كەسێك خۆی بناسێ پەروەردگاریی خۆشی دەناسێ، بەڵام هەر كەسێك خوای نەناسی خۆشی ناناسێ و نازانی چی یە.

داروین و فرۆید و دوركایم و ماركس و ئەنگلس هەر كامیان بە جۆرێك پێناسەی ئینسانیان كردوە، داروین دەڵێ: ئینسان لە مەیموونەوە هاتوە، و ماركسی یەكان دەڵێن: ئینسان تەنیا (معدة) گەدە دەیجووڵێنێ و، فرۆیدیش ئینسان لە جینس دا كورت هەڵدێنێ،وە دوركایم دەڵێ: ئینسان لە كۆمەڵگادا وەك سابوونێك وایە كە لە قاڵب دەردەچێت، واتە: ئینسان سابوونە و كۆمەڵگاش قاڵبەكەیەتی و چۆن بێ وا دەردەچێ !

ئەوانە بۆیە ئاوا سەیری ئینسانیان كردوە، چونكە لە دەروازە و دەلاقەی وەحی و هیدایەتی حەقیقەتناس و واقیع بین و گشتگیرەوە تەماشای ئینسانیان نەكردوە، بۆیە سەرجەمیان گیرۆدەی تێڕوانینی هەڵە و لاتەڵ و لاسەنگ بوون لە بارەی ئینسانەوە.

بەڵام با بزانین خوای پەروەردگار چۆن وەڵامی ئەو پرسیارانە دەخاتە دەستی ئێمە: لە سەرەتای سووڕەتی (الانسان) دا خوای زانا و توانا فەرموویەتی:

﴿ هَلْ أَتَى عَلَى الإِنسَانِ حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُنْ شَيْئًا مَذْكُورًا(1)إِنَّا خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴾[253] خوای كاربەجێ لەم دوو ئایەتەدا هەم باسی ئەو سەرچاوەیە دەكات كە ئینسانی لێوە هاتوە و هەم ئەو ئەركەی كە ئینسانی بۆ خوڵقێنراوە وە هەم باسی

(253) الانسان (1-2) .

چۆنیەتی پێکهاتەی ئینسانیش دەکات، سـەرەتا وشەی (هل) وەك توێژەرەوانی قورئان دەڵێن بۆ (تحقیق)و (تأكید) ە، هەرچەندە لە ئەسڵ دا ئامرازی پرسیار کردن (استفهام)ە، دەفەرموێ: بە ڕاستی کات و ڕۆژگارێك بەسەر ئینسان دا هاتوە کە شتێکی باس کراو نەبووە ، واتە نەبووە تاکو باس بکرێ، ئینسان نەبوون پێشـــی کەوتووە (مسبوق بالعدم) و کاتێك بووە نەبوە، کەواتە دەبێ بەدیهێنەرێکـــی هەبێ، جا ئایا ئەو بەدیهێنەرە کێیـــە؟ بێگومان خوایە خوای بەدیهێنـــەر بێ باکانە و ڕاشکاوانە وا دەفەرموێ، کەواتە گەشە سەندن (تطور)ی مادده و سروشت و ڕێکەوت وئەوانە هەموویان وشەی ئەفسانەیین و هیچیـــان حەقیقـــەت و نێـــوەڕۆکیان نیە ئینجا ئایا سەرەتای دروست بوون سەرهەڵدانی ئینسان چۆن بووە و چی بووە؟!

﴿ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ ﴾ لە تۆویلکەیەکی تێکەڵاو لە ئاوی پیاو و ئافرەت، کە هەر کام لە ئاوی پیاو و ئافرەت لە کۆمەڵێك گەرد (جُزَئ) ی تێکەڵاو، وە هەر گەردێکیش لە کۆمەڵێك گەردیلـــــە (ذرة)و هەر (ذرة)یەکیـــش لە کۆمەڵێك تەنۆلکەی بچوکتر پێك دێت، دیـــــارە ئەو تۆویلکە (نطفة)یەش جۆرێك لە ژیان (حیاة)ی سادەی تێدایە،بەڵام ئایا خوا بۆچی ئینسانی دروست کردوە؟ (نبتلیه) تاقی دەکەینەوە، کەواتە ئینسان بۆ ئەرکێك دروست کراوە کە بریتی یە لە تاقی کرانەوە، ﴿ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴾ ئامرازەکانی تاقی کردنەوەشمان پێ داوە وامان کردوە کە ئینسان بتوانێ بیســـەر و بینەر بێ بۆ ئەوەی بگونجێ تاقی بکرێتەوە و بتوانێ - ئەگەر بیـــەوێ - لە تاقی کردنەوە دەربچێ.

لە شوێنێکی دیکەدا خوای پەروەردگار ڕاشکاوانە تر پەردە لەسەر ئەرك (وظیفة)ی ئینسان هەڵدەداتەوە و دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾[254] واتە: جنۆکە و ئینسانم بەس بۆ ئەوە دروست کردوون کە بمپەرستن و بەندایەتیم بۆ بکەن، بەڵێ بەندایەتی بۆ خوا پاساوی دروستکرانی ئینسان و حیکمەت و ئامانجی دروستکرانیەتی، بەڵێ بەڕێزان! خوای پەروەردگار بێ نیازەو هیچ ئیشێکی پێمان نیە کە لەبەر ئەوە دروستی کردبین، ئەدی بۆچی دەفەرموێ: بۆیە دروستم کردوون کە بمپەرستن؟! لە وەڵام دا دەڵێین چونکە پەرستنی خوای پەروەردگار بۆ ئێمە قازانجە و مایەی بەختەوەریمانە، ئەگەر نا خوا (سبحانه وتعالى) پێی زیاد ناکات، هەروەك ئەگەر نەشی پەرستین هیچی لێ کەم ناکات، کەواتە خوای پەروەردگار ئامانج و مەبەستێکی نەبووەو نیە کە پەیوەست بێ بەخۆیەوە لە دروست کردنی دروستکراوەکانی دا، چونکە هەر کەسێك مەبەستێکی هەبێ پێویستیی بەو مەبەستە هەیە و هەر کەسێك ئامانجێکی هەبێ دیارە پێویستی بەو ئامانجە هەیە و پەکی لەسەری کەوتووە، خوای پەروەردگاریش دەوڵەمەند (غني) و بێ نیازە ، بەڵام خوا ئێمەی دروست کردوە بۆ ئامانجێك کە پەیوەندی بە خۆمانەوە هەیە کە پەرستنیەتی بۆ بەختەوەری خۆمان لە دونیا و قیامەت، جا ئەوە باسێکی درێژە و ئێمە لێرەدا هەر بە کورتی باسمان کرد.

هەروەها دەفەرموێ : ﴿ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ ﴾[255] واتە: ئەو پەروەردگارەی کە مەرگ و ژیانی

(254) الذاريـات (56) .

(255) الملـك (2) .

دروست کردوون بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە داخۆ کامەتان کردەوەی باشترە، وە خوا زاڵ و باڵا دەستە و لێبوردە و تاوان پۆشە، لەم ئایەتەوە دەردەکەوێ کە وەك چۆن ژیان دیاردەیەکی هەبوو (موجود)ە بە هەمان شێوەش مردنیش دیاردەیەکی هەبوو (موجود)ە، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا بۆ هەردووکیان وشەی (خلق)ی بەکارهێناوە.

هەروەها بەهۆی ئیمانەوە ئینسان بۆی دەردەکەوێ کە کیان و کەسایەتی چۆن و بە چ شێوەیەك پێکهاتوە بە هەردووك بەشی ماددی و مەعنەوییەوە:

﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِنْ طِينٍ(71)فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ ﴾[256] واتە: کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو من ئینسانێك لە قوڕ دروست دەکەم، جا کاتێك ڕێکم خست و لە ڕووحی خۆم فووم بە بەردا کرد هەمووتان کڕنووشی (ڕێز و حورمەتی) بۆ بەرن. بێ گومان مەبەست ئادەمە (علیه الصلاة والسلام) کە خوا لە قوڕ دروستی کرد وەك فەرموویەتی:

﴿ وَبَدَأَ خَلْقَ الإِنسَانِ مِنْ طِينٍ(7)ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِنْ سُلاَلَةٍ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ﴾[257] واتە: سەرەتای دەست پێکردنی ئینسان ئەوە بوو کە لە قوڕ دروستی کرد، ئینجا کە لە شوێنێکی دیکە فەرموویەتی:﴿من تراب﴾[258]یان دەفەرموێ: ﴿ مِنْ صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ ﴾[259]، ئەوە هەمووی هەر یەکە چونکە (تراب)

(256) ص (71-72).
(257) سجدة ( 7-8).
(258) (...فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ) الحج (5) .
(259) ( خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ) الرحمن (14) .

(گـڵ) ئاوی بخـە گەڵ دەبێتە (طين) قوڕ، قوڕیش وشـك بێتەوە دەبێتە قوڕی وشـك كراوەی وەك خـەزەف ﴿صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ﴾ جا ئەوانە هەموویان قۆناغەكانی دروست بوونی جەستەی ئادەمن ﷺ، ئایەتەكان وەك بۆ سەرنجی سـەركێڵانە دەردەكەوێ بەیەكەوە دژ نین، بەڵكو هەر كامێكیان باس لە قۆناغێك لە قۆناغەكانی دروست بوونی ئادەم ﷺ دەكات، بەڵام ئایا خوای كاربەجێ ﷻ نەسل و وەچەی ئەو یەكەمین ئینسانەی لە چی دروسـت كرد؟، ﴿ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِنْ سُلاَلَةٍ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ ﴾ واتە: پاشان وەچەكەی دروسـت كرد لە پوختەیـەك لە ئاوێكی بە سـووك وكەم سەیر كراوو نابووت، كە مەبەست پێی (مني) پیاوو ئافرەتە و لە ڕاستی دا شتێكی قێزەون و بێز لـێ كراوە و سەرجەم ئینسانەكان لەوە دروست كراون، جا دیارە ئەو ئاوەش پوختەی خوێن و ئەویش پوختەی خواردن و خۆراك و ئەویش پوختەی ئەو شتانەی كە لە زەوی پەیدا بوونە لە ڕووەك وئاژەڵ و بەروبوومیان كە ئینسان دەیانخوات و دەبێتە خواردنێكی هەزم كراوو ئەویش دەبێتە خوێن و خوێنیـش تۆویلكە (نطفة) كە ئاوێكی بێزراوەو پوختەی كۆمەڵێك كار ئەنجام (تفاعل)ی كیمایی و ئەوانەیە كە جۆرێك لە ژیان (حياة) ی سادەی تێدایە نەك ڕووح، پاشان ئەو (نطفة) یە كە دەبێتە كۆرپە ڕووحی بە بەردا دەكرێ لە كاتی تەمەنی چوار مانگ و (10) شەو بەرەو سەروو وەك لە ئایەت و فەرموودەكان دا هاتووە.

كەواتە: ئینسان - چ ئادەم و چ وەچەكەی - هەم لە جەستەیەكی خاكی و هەم لە گیان (روح) ێكی خوایی پێك هاتووە، وە كە دەگوترێ : گیانێكی خوایی لەبەر تیشكی فەرموودەی خوا:﴿ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي ﴾ بەو مانایە نیە كە گیان (روح) بەشێك بێت لە خوا و جیا ببێتەوە، بەڵكو ڕوح دروستكراو

(مخلوق)ێکی دانستەی خوایە کە پەیوەندی بە جیهانی ماددەوە نیە، بۆیە خوا پالّی داوەتە لای خۆی.

هەروەها ئینسـان بەهۆی ئیمانەوە بۆی دەردەکەوێ کە چ پایە و پلە و مەقامێکی پێ دراوە وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ **وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً** ﴾[260] واتە کاتێك خوای پەروەردگار بە فریشتەکانی فەرموو: من دەمەوێ جێ نشینێك لەسەر زەوی دابنێم، کەواتە: ئینسان جێ نشینی خوایە، جا هەرچەندە هەندێك دەڵێن: دروست نیە بڵێی ئینسان جێ نشینی خوایەو چۆن دەبێ؟! لە کاتێك دا کە ئینسان کافریان هەیەو مسوڵمانیان هەیە و ناگونجێ ئینسان جێ نشینی خوا بێ؟! بەڵام ئەوانە هەموویان قسەی بێ هێزن، بەڵێ دروستە بگوترێ ئینسان جێ نشینی خوایە، بەو واتایە کە خوا (سبحانە وتعالـی) ئینسانی لەسەر زەوی داناوە و دەستی تێدا والا کردوە، وە ئەو ئایەتە جگە لەو واتایەی گوتمان هیچ واتایەکی دیکەی ڕوون هەڵناگرێ، مەگەر بە زۆر لەسەری باربکرێ، چونکە خوای پەروەردگار بۆ خۆی بە ڕاشکاویی دەفەرموێ: من دەمەوێ جێ نشـینێك لەسەر زەوی دابنێم، فریشتەکانیش دەڵێن: چۆن کەسێکی لـێ دادەنێی کە خوێن دەڕێژێ و خراپە دەکات و ئێمەش هەمیشە تۆ بە پاك دەگرین و سـوپاس و ستایشت دەکەین و پاکی و بێ هەڵەیی تۆ ڕادەگەیەنین !! کەواتە: لێرەدا فریشتەکان نا ڕاستەوخۆ گوتوویانە: بۆچی ئێمە نەکراوین بە جێ نشین و چۆن ئینسان کراوە

(260) البقرة (30)، من لە کتێبی (مسوڵمانی کامڵ) بەشی دووەم، (خواپەرستی مسوڵمان) بەرگی دووەم، بە وردی باسی ئەو مەسەلەیەم کردون و بەڵگەم لەسەرهێناوەتەوە.

بە جێ نشـــین لە حاڵێك دا کە زۆر لە یەك جیاوازین؟! ئینجا ئەگەر بگوترێ ئینسان جێ نشینی (جن)ە کە هـــەندێك لە توێژەرەوان (مفســـرین) وا دەڵێن ئەوە ئێمە دەڵێین: پێش ئەوەی ئینسان دروست ببێ (جن) لەسەر زەوی نەبوون تاکو بگونجێ ئینسان ببێتە خەلیفەی و شوێنی بگرێتەوە، چونکە خوا (آدم و ابلیس) ی - کە بابی ئینســـان و جندن - پێکەوە دابەزاندوونە سەر زەوی - وەك فەرموویەتی: ﴿ قَالَ اهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ.. ﴾[261] ئینجا ئینســـان بە گشـــتی لە جند گـــەورەترە و بە بەڵگەی ئەوە کە خوا پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام)تەنها لە ئینسان ناردوون وهیچ کامیان لە نێو جندان هەڵنەبژێراون، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالاً نُوحِي إِلَيْهِمْ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى ﴾[262]کەواتە: بەهیچ شێوەیەك ناگونجێ مرۆڤ خەلیفەی جند بێ، چونکە دەبێ خەلیفە لە خوار ئەو کەسەوە بێ کە جێ نشـــینیەتی، کەچی بە پێچـــەوانەوە (جن) لە خوار ئینسانەوەیە، پاشان ئەگەر ئەو جێ نشـــینایەتی یە هی (جن) بووایە نەدەبوو فریشتەکان ئێرەیی (غِبطة) یان بە ئینسان بردبایە بڵێن ئەدی بۆچی ئێمە ئەو خەلیفەیە نین !، وە ئەم ڕایە ڕای (طبـري) و (ابن کثیر) و (قرطبـي) و (سید قطب) و کۆمەڵێکی زۆر لە توێژەرەوانی قورئان و باقی زانایانە.

دیســـان خوای پەروەردگار لە بارەی جۆری کەسایەتیی و پێکهاتەی ئینسانەوە دەفەرموێ : ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴾[263] واتە:

(261) طـه (123).
(262) یوسف (109).
(263) التـین (4) .

بێ گومان ئینسانمان لە باشترین جۆرە پێکهاتە خولڤاندوە، کەواتە جوانترین پێکهاتەی ڕواڵەتی و مەعنەویی ئەوەیە کە ئینسانی لەسەر دروست بووە دەجا دیارە کە ئەم ڕاستییەش تەنها لە ڕێی ئیمانەوە ئینسان دەرکی دەکات و دەیزانێ.

کەواتە: بۆمان دەرکەوت کە بە هۆی ئیمان و وەرگرتنی پەیام و هیدایەتی خواوە ئینسان دەزانێ کە (محلّ)ی لە (إعراب) ی ئەم بوونەوەرەدا چی یەو چۆن دروست بووە و بۆچی هاتوە و کێ هێناویەتی و چۆن و لە چی دروست بووە و خاوەنی چ ئەرك و کەسایەتیی یەکە و پێکهاتە جەستەیی و ڕووحییەکەی چۆنە و ..؟! هتد، هەر بۆیەش (خۆناسین)مان کردە گرنگترین و گەورەترین بەرهەم و شوێنەواری ئیمان لە ژیانی ئینسان دا.

**(دووەم) ئیمان و دەوروبەر و بوونەوەر ناسین:**

بێجگە لەو کاتانەی کە ئینسان گوێ ڕایەڵی پەیامی خوا بووە و گوێی بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) گرتوە تاکو مەتەڵی بوون (وجود)ی بۆ هەڵبێنن و نهێنی (لغز)ی ئەم بوونەی بۆ حەل بکەن، جگە لەو کاتانە ئینسان هیچ کاتێك وەڵامێکی ڕاست و دروستی ئەو پرسیارە خوارسك (فطري) یانەی دەست نەکەوتوە کە ئاماژەمان پێ کردن و گوتمان: خوتخوتەی دڵ و مێشکی هەموو ئینسانێك دەدەن، بۆ نموونە:

ئەگەر تەماشای فەلسەفەی یۆنانی بکەین کە دیارە یۆنانییەکان کاتی خۆی بە فەلسەفە و حیکمەت و وردبینی ناسرا بوون، هەتا باسی شتی ماددی و ڕواڵەتی یان کردبێ وەك باسی دەوڵەت و کۆمەڵگا و ژیان و گوزەرانی خەڵك، ئەوە تا ئەندازەیەك هەندێك شتی ڕاست و بە سوودیان گوتوە، بۆ نموونە: (ئەفلاتوون) کە لە کتێبی (کۆماری ئەفلاتوون) دا هەندێك شتی جوانی لەو

بارەوە گوتوە، هەرچەندە لە هەندێك شتیشدا تووشی هەڵەی زۆر خراپ بووە بە تایبەت کە پۆلێن (تصنیف)ی کۆمەڵگا دەکات و توێژێکیان بە زێڕ دەشوبهێنێ و یەکیان بە زیوو یەکی دیکەیان بە ئاسن و یەکی دیکەشیان بە خەزەف !

بەڵام هەم ئەفلاتوونیش و هەم سەرجەم فەیلەسووفەکانی دیکەش کاتێك کە هاتوونەتە سەر باسی ئەو دیو سروشت (میتافیزیکا) دەبینین چوار پەل لە قوڕی نەزانیی دا چەقیون و شتی وایان گوتوە لە قوتووی هیچ عەتارێك دا نیە، بۆ نموونە: بۆ هەر کام لە دیاردە سروشتییەکانی وەك: جوانیی، هونەر، ئاو، با، ئاگر ... هتد پەروەردگار (ربّ)ێکیان داناوە[264] وە وایان خەیاڵ کردوە کە لە نێوان خوای بەرز و مەزن (سبحانه وتعالی)و مرۆڤ دا هەمیشە کێشمە کێش (نِزاع) هەبووە و هەیە، وە لە یەکێك لە ئەفسانەکانیان دا هاتوە کە لە سۆنگەی ئەوەوە پەروەردگاری ئاگر (زیوس) کاتی خۆی ویستوویەتی ئاگر بدزێ و بیداتە مرۆڤ بۆ ئەوەی ژیان وگوزەرانی بەرەو پێش بچێ، خوا(سبحانەو تعالی) لێی توورە بووە و سزای داوە !!

(264) هەرچەندە زۆربەی هەرە زۆری نووسەرانی کورد وشەی (آلهة) و (أرباب) یان بە (خوایەکان) تەرجەمە کردوە، بەڵام بێ گومان ئەوە هەڵەیەکی زەق و سەیرە، چونکە وشەی (خوا) تەرجەمەی وشەی (الله) یە و (الله)ش نە لە زمانی عارەبی و نە لە هیچ زمانێکی دیکەش دا کۆنە کراوەتەوە لەبەرئەوەی (خوا) (سبحانه وتعالی) کە تاکە و بەدیهێنەر و پەروەردگاری هەموو شتێکە، تەنها یەکێکە و بێ وێنە و هاوتا و هاوەڵە و ئەمەش ڕاستییەکی سەلمێنراوی نێو سەرجەم گەلانی دنیایە، بەڵام هەر کام لە وشەی (إله) و (رب) لە قورئانیدا بە کۆ (جمع) هاتوون، کە یەکەمیان تەرجەمەکەی (پەرستراو)ە و دووەمیشیان (پەروەردگار)ە، وە لە ڕاستی دا ئەفسانەکانی یۆنانیش هەر ئەو دوو مانایەیان مەبەست بووە.

ئینجا شتێکی ئاشکراشە کە ئەم شارستانیەتی یە ئەورووپی وڕۆژئاوایی یەی ئەم ڕۆژگارەش لە ڕووی بنەما فیکرییەکانییەوە هەر درێژە پێدەری هەمان فەلسەفەی یۆنانی و ئیغریقی یەو ئێستاش لە فەرهەنگی ڕۆژئاوادا گەلێك لەو ئەفسانانە هەر ماون، بۆ نموونە: ڕۆژئاواییەکان زۆر جار وشەی زاڵ بوون بەسەر سروشت دا (السيطرة على الطبيعة) بەکار دێنن، یانی هەر زانایەك بە دۆزینەوە (إكتشاف)ێك هەڵساوە و نهێنی و یاسایەکی خوای لە بوونەوەردا دۆزیوەتەوە، وەك (ئەرخەمیدس) و (کۆپەرنیك) و (گالیلۆ) و (نیوتن) و (ئەنشتاین) و (ئەدیسۆن) ... هتد، گوتوویانە ئەوە قۆناغێکی دیکەش بەسەر سروشت دا زاڵ بووین! وەك بڵێی بوونەوەر و سروشت دوژمنی ڕکابەر و چەنگ بە خوێنی مرۆڤ بێت !!

بەڵام خوای پەروەردگار کە باسی سروشت و بوونەوەر دەکات و دەفەرموێ: بۆ ئینسانمان ژێر دەستە و ڕام (مسخّر) کردوە، کەچی ئەوان پێیان وابووە کە نەخێر بەڵکو شەڕ و جەنگە لە نێوان ئینسان و سروشت دا، بگرە لە نێوان ئینسان و خوادا (سبحانه وتعالى) !!

جا بە تەماشا بکەین داخۆ (ئیمان) چۆن ئەو مەتەڵانە حەل دەکات و ئینسان دەخاتە سەر ڕۆشنایی.

1- سەرەتای دروست بوونی بوونەوەر: خوای زانا و پەنهانبین لە بارەی سەرەتای دروست کردنی بوونەوەر و مرۆڤەوە کە بە بێ ئاگادار کردنەوەی ئینسان هێناونیە دی فەرموویەتی: ﴿ مَا أَشْهَدْتُهُمْ خَلْقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَلاَ خَلْقَ أَنفُسِهِمْ ﴾ (الكهف- 52)

واتە: من ئاگادارم نەکردوونەتەوە لە دروست کردنی ئاسمان و زەوی و لە دروست کردنی خۆیشیان.

کەواتە: مرۆڤ نەك هەر لە سەرەتا و دەستپێکی (بوون) ئاگادار نیە و نەبووە، بەڵکو لە هی خۆیشی!

شایانی باسیشە کە زانستی گەردونناسی (علم الفلك) هەتا ئێستاش نەیتوانیوە بڵێ: گەیشتووینە سنووری ئاسمانی یەکەم، خوای پەروەردگاریش لە چەندین ئایەت دا ڕوونی کردۆتەوە کە پێکهاتەکانی بوونەوەری نزیك لە ئێمەی مرۆڤ (سبع سموات) حەوت ئاسمانن !

بۆیە ئەگەر وشەی (السموات و الارض) ئاسمانەکان و زەوی بە بوونەوە (کون) تەرجەمە بکەین دەبێ بڵێین بە چاوپۆشی (تجوّز)ەوەیە، ئەگەر نا لە ڕاستی دا ئەوەی بە زاراوەی گەردونناسی ئەمڕۆ پێی دەگوترێ بوونەوەر (کون) تەنها بریتی یە لە سووچ و قوژبنێکی بچووکی ئەو حەوت ئاسمانە پان و پۆڕانەی کە خوای پەروەردگار بە شەش قۆناغ دروستی کردوون، وەك فەرموویەتی: ﴿ **اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ...** ﴾[265]، ئەوەش جگە لە (عرش)و(سدرة المنتهی)و (جنة)و(جهنم) کە خوا باسی کردوون، وە ئەوەش کە باسی نەکردوەو هەر خۆی دەیزانی !! جا خوای پەروەردگار فەرموویەتی : من دروستکرانی ئەو بوونەوەر (کون)ەم بە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوانەوە پیشانی ئەوان نەداوە و هیچ کەس ئاگادار نەبووە کاتێك کە دروستم کردوون، کەواتە هەر قسەیەك لەو بارەوە بکەن، دەچێتە قاڵبی ئەفسانە وقسەی بێ بەڵگە ونەزانانەوە. دیارە کەسێکیش

(265) السجدة (3) .

ڕێزی عەقڵی خۆی بگرێ قسە لە شتێك ناكات كە زانیاری لە بارەیەوە نیە. چونكە قسەی بێ بەڵگە و زانیاری وەك تفەنگ بە تاریكییەوە نانە!

ئینجا وەنەبێ مرۆڤ تەنها لە سەرەتای دروست بوونی بوونەوەر بێ ئاگا بێ، بەڵكو لە هی خۆیشی بێ ئاگایە و وەك پێویست خۆیشی نەناسیوە و نازانێ چی وچۆنە وەك (ئەلكسیس كاریل)[266]ی خاوەنی كتێبی: (الإنسان ذلك المجهول) ئینسان ئەو نەناسراوە، دەڵێ: تا ئێستا نەزانی ئێمە دەربارەی خۆمان نەزانین (جهل)ێكی هەمە لایەنەیە و ئێمە زۆر بێ ئاگاین لە خۆمان، وە شتێكی ئەوتۆ نازانین لە بارەی خۆمانەوە، نەك هەر لە ڕووی ڕووحیەوە بەڵكو لە ڕووی جەستەیشمانەوە.

2- حیكمەتی دروست بوونی بوونەوەر:

وە لە بارەی حیكمەت و هۆی دروست بوونی بوونەوەرەوە خوای كاربەجێ (سبحانه وتعالى) فەرموویەتی: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلاً ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا.. ﴾[267] واتە: وە ئاسمان و زەوی ئەوەی نێوانیانمان بە بێ هۆ و حیكمەت دروست نەكردوون، بەڵكو ئەوە هەر گومانی ئەوانەیە كە بێ بڕوان..

جا بەڕێزان لێرەدا شتێك هەیە لە بارەی وشەی (سماء)ەوە پێویستە لێی بێ ئاگا نەبین:

(266) خاوەنی پاداشتی (نۆبڵ)ە لە ئاداب دا.
(267) ص (27).

هەر کاتێك وشەی ئاسمان (سماء) لە قورئانیدا بەکارهاتبێ مەگەر بە نیشانە (قرینة) یەك دیار بێت کە مەبەست پێی ئاسمان نیە، ئەگەر نا هەر بۆ ئەو مەبەستە بەکارهاتوە، بۆ نموونە:

جاری وا هەیە وشەی ناوبراو بە مانای هەور (سحاب) بەکارهێنراوە، وەك:
﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا ﴾(268) .

وە جاری وا هەیە بە مانای سەقفی خانوو بەکار هاتوە، وەك:
﴿ مَنْ كَانَ يَظُنُّ أَنْ لَنْ يَنصُرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى السَّمَاءِ ثُمَّ لِيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُ مَا يَغِيظُ ﴾(269) .

بەڵام لە غەیری ئەو جۆرە حاڵەتانەدا ئەوە وشەی (سماء) ئەگەر بە تاك هاتبێ ئەوە مەبەست پێی جینسی ئاسمانە و ئەگەر بە کۆ (جمع)یش بێ جا چ وشەی (سبع)ی لەگەڵ بێ وەك: ﴿ ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ ﴾(270)یان لەگەڵی نەبێ، وەك: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لاَعِبِينَ ﴾(271) ئەوە مەبەست پێی حەوت ئاسمانەکانە.

کەواتە: خوای کاربەجێ بوونەوەری بە گاڵتەو هەوەنتە و بێ حیکمەت نەخولقاندوە وەك بێ بڕوا دڵکوێر و زەین تاریکەکان گومان دەبەن بەڵکو بە حیکمەت خولقاندوویەتی. حیکمەتەکەیش بریتی یە لە تاقیکرانەوەی ئینسان. وەك خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ

(268) الفرقان (48) .
(269) الحج (15) .
(270) البقرة (29) .
(271) الدخان (38) .

**أَحْسَنُ عَمَلاً ﴾**(272) واتە: وە خوا (سبحانه وتعالى) ئەو زاتەیە ئاسمانەکان و زەوی لە ماوەی شەش ڕۆژان دا - واتە بە شەش قۆناغ - دروست کردوون، وە لەو کاتی دا عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو، بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە داخۆ کامەتان کردەوەی چاکترە.

هەروەها هەر لەو بارەوە خوای کاربەجێ (سبحانه وتعالى) فەرموویەتی:

**﴿ وَخَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِالْحَقِّ وَلِتُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ ﴾**(273) .

واتە: وە خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق دروست کردوون، وە تاکو هەر کەسە بە پێی ئەوە کە وەدەستی هێناوە سزا و پاداشت بدرێتەوە بێ ئەوەی ستەمیان لێ بکرێ.

کەواتە: ئەو هەق و حیکمەتەی کە خوای کاربەجێ ئاسمانەکان و زەوی بۆ دروست کردوون ئەوەیە کە خەڵکی بە گوێرەی کردەوەکانیان سزا و پاداشتی دادگەرانە و پڕ بە پێست وەربگرنەوە.

3- تەنها عاقڵ مەندان و زانایان دەرکی حیکمەتی دروست کرانی بوونەوەر دەکەن: وەك خوای دادگەر (سبحانه وتعالى) فەرموویەتی :

**﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لاَعِبِينَ(38) مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ ﴾**(274) .

---

(272) هـود (7) .

(273) الجـاثيـة (22) .

(274) الدخـان (38، 39) .

واتە: وە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان بە گاڵتە و یـــاری دروست نەکردوە، بەڵکو تەنیـــا بە هـــەق و حیکمەت خوڵقاندوومانن، بەڵام زۆربەیان - واتە زۆربەی خەڵکی کە مەبەست بێ بڕوایانن - نازانن.

کەواتە: خەڵکی نەزان و بێ ئاگا دەرکی حیکمەتی دروستکرانی بوونەوەر ناکەن و تەنها کەسانی زانا و ژیر ئەو مەتەڵە حەل دەکەن!

وە لە جێگایەکی دیکـــــەدا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُولِي الأَلْبَابِ(190)الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾[275] واتە: بە ڕاســـتی لە دروست کرانی ئاسمانەکان و زەوی و جێ گۆڕگێی شەووڕۆژان دا نیشانە گەلێك هەن بۆ خاوەن عەقڵان، ﴿ (ألباب) دیارە کۆی (لُبّ)ە و ئەویش بە مانـــای (کاکڵە)ە کە مەبەســـت پێی عەقڵە، بۆیەش عەقڵ بە کاکڵی مرۆڤ دانراوە چونکە ئینســـان کە عەقڵی نەبوو وەك گوێزێکی بێ کاکڵ وایە، شتی بێ کاکڵیش بە کەڵك نایە و بۆ فڕێ دان باشە، بۆیە مرۆڤ بە عەقڵەوە ئینسانە ﴾ پاشان خوای پـــەروەردگار پێناســەی خاوەن عەقڵانی خواناس دەکات و دەفەرموێ: ئەوانەی کە بە پێوە و بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتیان یادی خوا دەکەن، وە بیر دەکەنەوە لە دروست کرانی ئاسمانەکان و زەوی و لە ئەنجامی بیر کردنەوەکەیان دا دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئا ئەم بوونەوەرەت بە گاڵتە و بێ حیکمەت نەخوڵقاندوە، پاکی وبێ خەوشـــیی بۆ تۆ کە شتی بێ حیکمەت بکەی وە جا لە ئازار و ئەشکەنجەی ئاگر چەپاڵەمان بدە.

---

(275) آل عمـران (190-191) .

4- بوونەوەر هەمووی بۆ ئینسان ڕام و مەیسەر کراوە:

خوای زانا و توانا (سبحانه وتعالـى) لەو بارەوە فەرمووویەتی: ﴿ **وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ** ﴾[276] واتە: وە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە بۆ ئێوەی ڕام و دەستە مۆ کردوە و هەموویشی لەوەوەیە...

کەواتـــە: سەرجەم بوونەوەر، خوا بۆ خۆی بۆی ژێر دەست کردووین و بۆی مەیســـەر کردووین، پێویست ناکات وا بزانین کە سروشت و بوونەوەر دوژمن و ناحەزە و دەبێ بەســـــەریدا زاڵ بین و بیخەینە ژێر ڕکێفی خۆمانەوە! هەر بۆیەش سوونەتە کاتێك کە سواری وڵاخ یان سەیارە یان هەر شتێکی دی دەبین بڵێین: ﴿ **سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ (13) وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ** ﴾[277] واتە: پاکی بۆ ئەو خوایەی ئەوەی بۆ مەیسەر و ژێر دەستە کردووین کە ئێمە دەستەڵاتمان بە سەردا نیە وە ئێمە هەر بۆ لای ویش دەگەڕێینەوە.

ئێســتر و ئەسپ و ماین و حوشتر و ئەو جۆرە ئاژەڵانە کە لە ئینسان شێت بوون کێ توانای بەسەریان دا هەیە؟ بەڵام خوای پەروەردگار ڕام و دەستە مۆی کردوون.

هەروەها فەرموویەتی : ﴿ **هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ الأَرْضَ ذَلُولاً** ﴾[278] واتە: خوا ئەو زاتەیە کە زەوی بۆ دەستەمۆ کردوون، لێرەدا خوا (سبحانه و

(276) الجاثيـة (13) .
(277) الزخـرف (13-14).
(278) الملـك (15).

تعالی) زەوی وە حوشتری دەستەمۆ چواندوە،چونکە (ذَلُول) بە حوشتری دەستەمۆ دەڵێن کە (یەخ) ی دەدەن و منداڵێکیش دەتوانێ باری بکات و سواری بێت، جا خوا دەفەرموێ: زەویشمان بۆتان ئاوا لـێ کردوە؛ چونکە بە کەیفی خۆتان لەسەری دەگەڕێن و تێیـــدا دێن و دەچن و هەرچەندە بە دەوری خۆی و خۆریش دەخولێتەوە بەڵام ناتانجووڵێنێ !! دیارە ســـــەرجەم بوونەوەریش هەروایە و ژێر دەســـتە و ڕام و دەستەمۆیە.

**(سێیەم): ئیمان و ناسین و لەیەک جیاکردنەوەی دۆست و دوژمن و هەق و ناهەق و چاک و خراپ و حەڵاڵ و حەرام و پاک و پیس:**

بەڵێ بە بێ ئیمان ئینسان چۆن وەك پێویست چاك و خراپ و دۆست و دوژمن و هـــەق و ناهـــەق و حەڵاڵ و حەرامی بۆ لە یەك جیا دەبێتەوە؟، لە ڕاستی دا بۆی لە یەك جیا نابێتەوە، بەڵگەشـــمان ئەوەیە، کە هیچ فیکرەیەك نیە هەرچەندە زۆر پووچ (باطل)یش بێت کە هەندێك لە کافرەکان ئیمانیان پێ‌ی نەبێت، وە هیچ شتێکی پیس نیە هەرچەندە زۆر پیسیش بێت کە لە نێو هەندێك لە گەلانی کافردا نەخورێت، وە هیچ حەرامێك نیە کە هەندێکیان یان زۆربەیان بە ڕەوای نەزانن !

وە هیچ خوو و خەســـڵەتێکی بە دو پیس نیە کە زۆربەیان یان بەشێکیان پێیان باش و پەسند نەبێ.

یەکێك لەو ئایەتانەش کە ئەو ڕاستییەی گوتمان زۆر بە ڕوون و ڕاشکاوی دەخاتە ڕوو ئایەتی ژمارە (157)ی (الأعراف)ە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

﴿ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ

وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ أُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ .

واتە: ئەوانەی شوێن ئەو ڕەوانە کراوو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە دەکەون کە لە تەورات و ئینجیلـــی لای خۆیان دا ناوونیشـــانی بە نووسراوی دەبینن، فەرمانیان پێ دەکات بە هەرچی چاکەیەو هەرچی خراپەیە لێیان قەدەغە دەکات، وە هەرچی پاك و چاکە بۆیان حەڵاڵ دەکات و هەرچی پیس و زیان بەخشیشە لێیان قەدەغە دەکات وە کۆڵ وباری قورسی سەر شانیان و کۆت و زنجیرەکانیان لادەبات.

جا ئەوانەی ئیمانیان پیێ هێناوەو ڕێزیان لێگرتوەو پشتیان گرتوەو شوێن ئەو ڕووناکییە کەوتوون کە لەگەڵی دا نێرراوەتە خوارێ ئا ئەوانەن سەرفراز.

کەواتە: لە سـۆنگەی ئیمان پێ هێنان و شوێنکەوتنی پێغەمبەری کۆتایی (مُحَمَّدٌ)یەوە ﷺ ئینسان دەکەوێتە سەر ڕاســتەڕێیەکی ڕۆشـــن و هەرچی ڕاست وچەوت و چاکەو خراپە و هەق وناهەق هەیە لە بواری عەقیدەو فیکر و تێڕوانین دا و، سەرجەم ئەو شتانەی کە حەڵاڵ و پاك و چاك و سوودبەخش یان حەرام و پیس وخراپ وزیانبەخشن لە بواری خواردن وخواردنەوەو کەل و پەل و شـــمەك و هەڵس وکەوتەکان دا... لە یەکیان جیـــا دەکاتەوە و بە شەنەی شەریعەت و (با)ی (هُدى) (دان) و (کا)یان لەیەك هەڵداوێرێ.

چونکە بێ گومان هـــەر کام لە (المعروف) و (المنكر) کە ئەلیف و لامی جینسیان لەسەرە هەرچی چاکە و خراپەیە دەیگرنەوە، لە سەرجەم بوارەکانی

عەقیدە و فیکر و عیبـــادەت و ئەخلاق و کۆمەلایەتی و سیاسەت و جەنگ و ئاشتی و ... هتد دا.

هەروەها هەر کام لە (الطیبات) و (الخبائث)یش بە هەمان شێوە هەرچی شـتی چاك و پاك و ســوود بەخش، یان خراپ و پیس و زیانبـــەخش هەیە لە خــواردن و خواردنەوەکان (المأکولات و المشــروبات) و بەرگ و پۆشـــاکەکان (الملبوسات) و تێکڕای شـمەك و کەل و پەلەکان (الممتلکات) دەگرنەوە..

ئینجا بۆیەش خوای بێ وێنـــە و هاوتا فەرموویەتی: ﴿ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ أُوْلَئِكَ هُمْ الْمُفْلِحُونَ ﴾ چونکە بە هۆی ئیمان هێنـــــــانی ئینسان بە (مُحَمَّدٌ) ﷺ و پەیامەکەی و شوێنکەوتنی ئەو نوور و ڕۆشنایی یەی کە خوا پێیدا ناردۆتە لای خەڵکی سەر زەوی، سەرجەم شتە پێکەوە دژ و ناکۆکەکان لە سەرجەم بوارەکانی: عەقیدە و فیکر و عیبادەت وئەخلاق وسیاسەت وحوکم و خواردن و خواردنەوە و بەرگ و پۆشـــاك و ... هتد دا لە یەك جیا دەکـــاتەوە و، دیارە بابای واش سەرفراز و بەختەوەر و براوەیە.

وە لە ئایەتێکی دیکەش دا خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی :

﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُمْ بِإِيمَانِهِمْ.. ﴾ (یونس -9)

واتە: بێگومـان ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن پەروەردگاریان بە ئیمانەکەیان ڕێیان پیشان دەدات..

دیارە ئەو ڕێ پیشاندان (هدایة)ش گشتی یە و هەموو لایەنەکانی ژیان و گوزەران دەگرێتەوە، کەواتە: ڕاستە بەهۆی ئیمانەوە ئینسان بەرپێی خۆی دەبینێ و شتە پێکەوە ناکۆك و دژ بە یەکەکان لە یەك جیا دەکاتەوە.

**(چــوارەم): ئیمان سەرچاوە و سەنەدی خەسڵەتە بەرز و پەسندەکانە:**

بەڵێ ئیمان سەرچاوە و پشتیوانی سەرجەم ڕەوشت و خەسڵەتە بەرز و پەسندەکانە، وەك چۆن بە پێچەوانەوەش کوفرو شیرك ونیفاق ماك ومیکرۆب و کانگای سەرهەڵدانی تێکڕای خوو وخدە و سیفەتە نزم و پەستەکانن، بەڵگەش لەو بارەوە زۆرن. بۆ نموونە:

خوا (سبحانە وتعالـی) لە پێناســــەی بڕواداران دا فەرموویەتی: ﴿ **قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ(1)الَّذِينَ هُمْ فِي صَلاَتِهِمْ خَاشِعُونَ(2)وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ(3)وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ...** ﴾ (المؤمنون 1-10) .

وەك دەبینیـــن خوای پەنهابین پێناسەی بڕواداران بەو جۆرە دەکات کە سەرەتا بە ئیمان وەسفیان دەکات وە پاشان چەندان خەسڵەتی بەرز و پەسندیان تێدا دیاری دەکات، کەواتە:

ئیمان سەرچاوەو کانگای خەسڵەت وسیفەتە بەرز و جوانەکانە و ئینسانی مسوڵمان بە ئەندازەی ئیمانەکەی بە خەســـڵەت و ڕەوشـــتە بەرز و جوانەکان دەڕازێتەوە. هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

((أكمل المؤمنين إيماناً أحاسنهم أخلاقا)) رواه مسلم .

واتە: ئەو کەسە لە بڕواداران ئیمانی تەواوترە کە ڕەوشتی جوانترە.

هەروەها خوای بەرز و مەزن لە پێناســـــەی بەندە هەڵبژاردەکانی خۆی دا چەندان ڕەوشت و خەسڵەتی بەرز و پەسندی ڕیـز کردوون:

﴿ **وَعِبَادُ الرَّحْمَانِ الَّذِينَ يَمْشُـــونَ عَلَى الأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمْ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلاَمًا....** ﴾ [279] .

---

(279) الفرقــان (63 الى 76) .

کەواتە: بە ئەندازەی ئەوە کە ئینسان ئیمانی تێدا دەچەسپێ و بەندایەتی بۆ خوا تێدا دێتە دی ڕەوشت و خووی بەرز و ئاکارو ڕەفتاری ڕەند و پەسند دەبێ.

ئینجا دەتوانین سەرچاوە و پشتیوان بوونی ئیمانیش بۆ خەسڵەت و ڕەوشتە بەرز و پەسندەکان بگێڕینەوە بۆ دوو هۆکاری بنەڕەتی:

یەکەم: ئینسان بەهۆی ئیمانەوە بە خواوە پەیوەست دەبێت ودەستی لە وەحی و هیدایەتی خوا (سبحانە وتعالی) گیر دەبێت و وەك پێشتر خستمانە ڕوو تەرازوو و پێوەرێکی دێتە دەســـت کە چاك و خراپ و ڕاست و چەوت و پاك و پیســـی پێ لە یەك جیا بکاتەوە. هەر بۆیەش خوای بێ هاوتا کتێبـی کۆتایی خۆی بە ڕوون کەرەوەی هەموو شتێك **(تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ)** پێناسە کردوە،﴿ **وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ** ﴾ (النحل-89).

دووەم: تەنها ئیمان وا لە ئینسان دەکات ڕاستگۆ بێ کاتێك کە بەرژەوەندیی لە درۆکردن دایەوە دەست پاك بێ کاتێك کە بە هۆی دزیی و خیانەتەوە ماڵ و ســـامانی زۆری چنـگ دەکەوێ وە داوێن پاك (عفیف) بێت لە کاتێك دا کە خۆشـــی و لەززەتێکـــی لە زینـــا و داوێن پیســـی دا لـێهەڵدەکەوێ. بۆچی؟! چونکە ئیمـــــان پێی دەڵێ: دەست لەو بەرژەوەندیی و قازانج و لەززەتە حەرامە هەڵگرە و تاکو خوای دادگەر لێت نەڕەنجێ و دووچاری خەشم و توورەیـی و سـزا و جەزرەبەی نەبی وە بەهەشتی نەبڕاوە و ڕازاوەت لە دەست نەچێ!

واتە: ئیمان شـــتێکی چاکتر لەو تۆزە قازانج و بەرژەوەندیـــی و ڕابواردنە حەڕامە زوو تێپەڕە پێشـــانی خاوەنەکەی دەدات کە بریتـــی یە لە ڕەزامەندیی خوا و بەهەشتی بەرین لە لایەکەوە و لە لایەکی دیکەشەوە ترســـێکی گەورە و بێڕەزای وەبەر دەنێ ئەگەر توخنی قەدەغە کراوەکان بکەوێ کە بریتی یە لە: تووڕەیی خـــــوای دادگەر و دۆزەخی نەبڕاوە و بەتیـــن !

# دەرسی دەیەم:

# گرنگیی و کاریگەریی عەقیدە لە ژیانی ئینسان دا

خاڵەکانی:

5-

6-

-7




بەڕێزان

ئەم دەرسی دەیەمەمان تەواوکەری ئەو بابەتەیە کە لە دەرسی پێشوودا لە ژێر ناوونیشانی (گرنگیی و کاریگەریی ئیمان وعەقیدە لەژیانی ئینساندا) چوار خاڵمان لێ باسکرد و لەم دەرسەش دا سێ خاڵەکەی دیکەی باس دەکەین:

**(پێنجەم) ئیمان ئینسان هاوسەنگ دەکات:**

**بەڵێ بەڕێزینە ! ئیمان دەبێتە مایەی هێنانە دی هاوسەنگیی (التوازن) لە نێوان ڕووح و لاشەدا، لە نێوان عەقڵ و دڵ (قلب)دا، لە نێوانی تاك و کۆمەڵ دا، لە نێوان هەق (الحق) و بەرژەوەندیی (المصلحة) دا، لە نێوان دوا ڕۆژ و دونیادا...هتد، بەڵێ ئیمان ئینسان هاوسەنگ ڕادەگرێ و نایەڵێ بەم لاو لادا لاربێ.**

لەو بارەشەوە دەقی قورئان و سوونەت زۆرن، بۆ نموونە:

1- خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ **وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الآخِرَةَ وَلاَ تَنسَ نَصِيبَكَ مِنْ الدُّنْيَا وَأَحْسِنْ كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلاَ تَبْغِ الْفَسَادَ فِي**

**الأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ ﴾**(280) ئەمە قسەی گەلە مسوڵمانەکەی (قارون)ی لە خوا یاخی یە کە ئامۆژگاری دەکەن و پێی دەڵێن: لەوەدا کە خوا پێی بەخشیوی دوا ڕۆژی پێ وەدەست بێنە، بەڵام بەشی خۆشت لە دونیا فەرامۆش مەکە، (واتە مەبە بە کۆیلەی دونیا و ئەو سامان و ماڵەت بکە بە هۆی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا و بەهەشتی خوا)، وە چاکە بکە وەك چۆن خوا چاکەی لەگەڵ کردووی و خراپەکاریی مەکە لە زەوی دا چونکە خوا خراپەکارانی خۆش ناوێن.

ئا ئەوە هاوسەنگ ڕاگرتنە، پێی دەڵێن: بەشی دونیات فەرامۆش مەکە چونکە دونیاش پێیدا دەوێ، وە هانیشی دەدەن بۆ دوا ڕۆژ و پێی دەڵێن دنیای بۆ بکاتە وەسیلە و ئەویش بکاتە مەبەست و ئامانج.

2- ئینجا سەیری ئەم دوعایە بکەن کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:((**اللهم أصلح لي ديني الذي هو عصمة أمري ، وأصلح لي دنياي التي فيها معاشي، وأصلح لي آخرتي التي فيها معادي واجعل الحياة زيادة لي في كل خير، واجعل الموت راحة لي من كل شر**))(281) تەماشای ئەو هاوسەنگی یە جوانە بکەن کە لەو پاڕانەوەیەدا ڕەچاو کراوە: پێغەمبەر ﷺ بۆ پێنج شت دەپاڕێتەوە: بۆ دینی و بۆ دونیای و بۆ دوا ڕۆژی، وە بۆ ژیانی و بۆ مردنی، دەفەرموێ: ئەی خوایە ئەم دینەم کە مایەی ڕاوەستانی کاروبارمە بۆم چاك بکە، ئەوە مانای چی یە؟ خۆ دین هەر چاکە، (دین) ئەگەر مەبەست پێ ئیسلام بێ خوای پەروەردگار

---

(280) القصص (77).

(281) رواه مسلم في صحيحه عن عبدالله بن عمرو بن العاص.

دەفەرموێ : ﴿ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ﴾ دینم بۆ تەواو کـــــردوون، کەواتە (دین) لەم فەرموودەدا واتە دینداریی (تدین) دینداریی من باش بکە و پابەندیی من بە (دین)ەوە باش بکە لە پێش دا دوعا بۆ دین و بەرنامەکەی دەکات چونکە دەفەرموێ : هەموو شتێکی من بەهۆی ئەم دینەمەوە ڕاوەستاوەو مایەی پاراستنی منە، ئینجا بۆ دونیای دەپاڕێتەوەو دەفەرموێ: خوایە ئەم دونیایەشم کە گوزەران و ژیانمی تێدایە بۆم چاك بکە، چاك کردنی ژیانی دونیا ئەوەیە کە ئینسان بەختەوەر و لەش ســاغ بێت و مەجالی کەســابەت و بەدەست هێنانی ڕزقی حەڵاڵی هەبێ و چاو بەرەو ژێری خەڵك نەبێ و لە هێمن و ئاسایش دا بێ و ژێر دەستە و زەبوون نەبێ و ... هتد ، پاشان بۆ دوا ڕۆژی دەپاڕێتەوە، لە پێش دا دین، ئینجا ژین، پاشان دوا ڕۆژ دەفەرموێ: وە ئەی خوایە ئەو دوا ڕۆژەم بۆ باش بکە کە بۆی دەگەڕێمەوە، وەك دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ باشبوونی دونیای پێش باشبوونی دوا ڕۆژ خستوە، چونکە ئەوەی لە دونیادا نەتوانێ باش بێ و دینداریی باش بکات دوا ڕۆژەکەشی باش نابێت، وە لە کۆتایی دا فەرموویەتی : ئەی خوایە ! ژیانم بگێڕە بە مایەی زیاد کردنی چاکە و با هەمیشـــە لە بەرەو پێش چوون دا بم، مەرگیش کە کۆتـــایی ژیانە بۆم بگێڕە بە مایەی قوتار بوون و دەرباز لە هەموو خراپەیەك.

3- (عبدالله بن عمرو بن العاص) خوا لــێی ڕازی بێ ، کە پیاوێکـــی زۆر خواپەرست و دنیا بە کەمگــر بووە، ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری دەکــات و پێی دەفەرموێ : ((**یا عبدالله ألم أخبر أنك تصوم النهار و تقوم الليل ! فقلت بلى يا رسول الله ، قال: فلا تفعل صم وأفطر**

**وقم ونم، فإن لجسدك عليك حقا، وان لعينك عليك حقا، وان لزوجل عليك حقا، وان لزورك عليك حقا))**[282] واتە: ئەی عبداللە هەواڵم پێ دراوە کە تۆ هەموو ڕۆژێك بە ڕۆژووی و بە درێژایی شەو نوێژ دەکـــــەی! ئەویـش دەڵێ: بەڵێ ئەی پێغەمبـــەری خوا وایــــە، پێغەمبەر ﷺ یش فەرمووی: دەجا وا مەکە، بەڵکو ڕۆژووی سوننەت بگرەو جاروباریش بە ڕۆژوو مەبە، وە شەو نوێژ بکەو بەشێکیش لە شەوێ بخەوە چونکە لاشــە و جەستەی تۆ هەقی لەسەرت هەیە، وە چاوت هەقی لەسەرت هەیە، وە خێزانت هەقی بەسەرتەوە هەیە، وە میوانیشت هەقی بەسەرتەوە هەیە.

کەواتە: دەبێ هەقی هەموو خاوەن هەقەکان بدەی، نەك هەقی هەموویان بدەی بە یەکێك و پێت وابێ دینداریی لەوە دایە.

4- هەروەها ئەو فەرموودەیەش کەوتو ویژێکە لە نێوان (سلمان الفارسي) و (أبو الدرداء) دا خوا لــێیان ڕازی بێ، دەقێکی دیکەیە لەو بارەوە:

**(عن عون بن أبي جحيفة عن أبيه قال: آخى النبي ﷺ بين سلمان وأبي الدرداء. فزار سلمان أبا الدرداء فرأى أم الدرداء مُتَبَذِّلَةً، فقال لها: ما شأنك؟ قالت: أخوك أبو الدرداء ليس له حاجة في الدنيا: فجاء أبو الدرداء فصنع له طعاماً، فقال له: كل ! فإني صائم، قال: ما أنا بآكل حتى تأكـل، قال: فأكـل، فلما كان الليل ذهب أبو الدرداء يقوم، قال: نم، فنام، ثم ذهب يقوم. فقال:**

(282) رواه البخـاری / فتح الباری بەرگی (4) لاپەڕە 337.

**نم، فلما كان من آخر الليل. قال سلمان: قم الان ، فَصَلَّيا فقال له سلمان:**

**ان لربك عليك حقا، ولنفسك عليك حقا، ولأهلك عليك حقا، "وفي رواية للترمذي وابن خزيمة: ولضيفك عليك حقا" فأعط كل ذي حقٍ حقه، فأتى النبي ﷺ فذكر ذلك له. فقال النبي ﷺ صدق سلمان) رواه البخاري ، فتح الباري ج3ص337.**

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ سەلمان و ئەبو دەردائی کردبوونە برا، جا ڕۆژێکیان سەلمان سەردانی ئەبو دەردائی کرد و ئوممو دەردائی هاوسەری بینی بەرگی ئیش وکاری لەبەردا بوو و دەستی بەخۆی دا نەهێنابوو، ئەویش پێی گوت: بۆ وای؟! گوتی: ئەبو دەردائی برات پێویستی بە دنیا نیە (واتە نایپەرژێتە سەرمن و گوێم ناداتێ بۆیە خۆم نەڕازاندۆتەوە).

جا کاتێك ئەبو دەرداء هاتەوە خواردنێکی بۆ سەلمان ساز کرد و بردیە پێشی و گوتی: بخۆ چونکە من بە ڕۆژووم (واتە ڕۆژووی سوننەت)، سەلمانیش گوتی: هەتا نەخۆی ناخۆم، گوتی: ئەوجار خواردی، وە کاتێکیش شەو داهات (پاش نوێژی خەوتنان) ئەبو ددەرداء چوو شەو نوێژ بکات، (سەلمان) پێی گوت: بخەوە، ئەویش خەوت. دوایی هەڵسایەوە. بچێ شەو نوێژ بکات. دیسان پێی گوت: بخەوە، ئینجا لە کۆتایی شەوگاردا سەلمان گوتی: ئێستا هەڵسە بۆ شەو نوێژ، ئیدی پێکەوە شەو نوێژیان کرد، جا سەلمان پێی گوت: بێ گومان هەقی پەروەردگارتت لەسەرە. وە هەقی نەفسی خۆشتت لەسەرە، وە هەقی خاووخێزانیشت لەسەرە. (وە لە ڕیوایەتی تیرموذی و ئیبنوخوزەیمەدا هاتوە: وە هەقی میوانەکانیشت لەسەرە)، دەجا هەقی هەموو خاوەن هەقێك

بدە، دوایی (ئەبو دەرداء) چووە لای پێغەمبەر ﷺ و ئەوەی بۆ گێڕایەوە (کە لە نێوان خۆی و سەلمان دا ڕوویدا بوو) پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: سەلمان ڕاستی کردوە و پێکاویەتی.

(وفي رواية : لقد اوتي سلمان علما) واتە: بێ گومان سەلمان زانیاریی پێدراوە. کە دیارە مەبەست لە زانیاریی (علم) لێرەدا زانیاریی و شارەزایی شەرعییە و باش لە ئیسلام تێ گەیشتنە، لێرەشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامە کە لە ئەنجامی باش لێتێگەیشتنی ئیسلام دا ئینسان دەگاتە هاوسەنگیی (توازن) و بە ملا و لادا لاسەنگ و لاتەڵ نابێ.

شایانی باسیشە کە ئینسان بە درێژایی مێژوو گیرۆدەی دەردی تێ پەڕاندن و بەزایەدان (إفراط وتفريط) بووە، چ لە بواری پەیوەندیی لەگەڵ خوادا (سبحانەو تعالى)، وە چ لە بواری تێڕوانینی بۆ دنیا و دوارۆژ، وە چ لە بواری وەلامدانەوەی داخوازییەکانی ڕووح و جەستەدا، وە چ لە بواری لەگەڵ خۆدا خەریك بوون ومشوور لە خەڵك خواردن دا، واتە تاکگەرایی و کۆمەڵگەرایی.

هەروەها لە بواری چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ عەقڵ و نەقڵ (وحي)، وە عەقڵ و دڵ دا ... وە .... وە .... هتد..

وە لە هیچ چاخ و سەردەمێك دا ئینسان بە تاك و کۆمەڵییەوە نەیتوانیوە لەو دەردی کوشندەی تێ پەڕاندن و بەزایەدانە سەلامەت و پارێزراو بێ مەگەر بە پێی ڕووناکیی وەحیی و هیدایەتی خوای پەروەردگار ژیابێ و بەڕێوە چوو بێ. ئەو وەحی و هیدایەتەی کە لە زانیاری و بەزەیی و حیکمەتی بێ سنووری خواوە سەرچاوەی گرتوە و جەستە وگیان و، دەر و دەروون وعەقڵ و دڵ و دنیا و دوا ڕۆژ و تاك و کۆمەڵ و ورد و درشت و ...هتد هەمووی پێکەوە وێکڕا و لە

یەك كات دا دەبینێ و هیچیانی لێ بزر نابێ و هەقی هەر كامێكیان بە پێی خۆی دیاری دەكات و هیچ كامیان لەسەر حیسابی ئەوی دیکە گەورە ناكات.

بەڵێ-مەگەر ئەو كاتانە كە ئینسان پابەند بووبێ بە (وحي)و شەریعەتی خواوە، ئەگەر نا حەتمەن یان خزمەتی جەستەی خۆی كردوەو ڕووحی فەرامۆش كردوە، وەك ماددی یەكانی ئێستا یان (ئەبیقووری)یەكانی كاتی خۆی، (ئەبیقوور)یش فەیلەسووفێكی (یۆنانی) بووە و بەختەوەری ئینسانی لە تێركردنی جەستە و وەڵامدانەوەی غەریزە ماددی یەكانی دا دیوە جا ئێستاش ئەو فەلسەفەیە زاڵە لە هەموو دونیای ئەمڕۆدا كە شەریعەتی خوای تێدا لە مەیدانی حوكم كردن دوور خراوەتەوە، وە ئەو بیروبۆچوونە ئێستا بە شێوەیەك زاڵە كە گەورەترین ئامانج بۆ ژیان ئەوەیە كە ئینسان زیاتر لەززەت وەربگرێ، چونكە سەیری ژیان دەكرێ وەك ماددە، وە سەیری ئینسان دەكرێ وەك ئاژەڵ و جەستەی ڕووت و هیچی دیکە !

یان بە پێچەوانەوەوە هەر سەرگەرمی ڕووحی بووەو جەستەی پشت وگوێ خستوە.

جا بێ گومان هەر(تصور)ێك (تصّرف)ێك پەیدا دەكات وەك خۆی؛ ئینسان ئەگەر وا سەیری خۆی بكات كە تەنیا هەر جەستە و لاشەیە، دیارە هەر بیریش لەوە دەكاتەوە، وە ئەگەر وا سەیری ژیان و بوون بكات كە تەنیا ئەم ژیانە دونیایی یەیە دیارە هەر بیریش لە ژیانی دونیا دەكاتەوە، هەروەها بە پێچەوانەشەوە.

بەڵێ بێجگە لەو كاتانە و جگە لەو كەس وكۆمەڵگایانەی كە دەستیان بە شەریعەتی خواوە گرتوە مرۆڤایەتی هاوسەنگیی (توازن) بە خۆوە نەبینیوە، بەڵكو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بە گشتی وهەر كەسێك بە دوای

پێغەمبەران کەوتبێ و بە پێی شەریعەت و بەرنامەکانی خوا بەڕێوە چووبێ، هاوسەنگی ڕاگرتوە لە نێوان دونیا و دوا ڕۆژ و ڕووح و جەستە وخۆی وخەڵك و عەقڵ و دڵ و وەحی و بیر و هۆش و ... هتددا.

بەڵام ئیسلام کە دوایین نوسخەی هیدایەتی خوایە وشەریعەت و بەرنامەی کۆتایی خوایە بۆ مرۆڤایەتی بە جوانترین وتەواوترین شێوە ئەو هاوسەنگی یەی تێدایە، چونکە لە هەندێك لە شـــــەریعەتەکانی خوادا کە وەك کاردانەوەی هەڵس وکەوتی هـــــەڵەی هەندێك لە کۆمەڵگایەکان هاتوون ڕەنگە بەو لای دیکەدا تێ پەڕێنرابێ بۆ ئەوەی تەرازووە لاسەنگەکە ڕاست بێتەوە، وەك چۆن ئینسان کاتێك باری ولاخێکی لـێ خوار دەبێ و زۆر بە لایەکدا شۆڕ دەبێتەوە، دەبێ زۆر تەکان بدات بۆ ئەوەی بەرزی بکاتەوە بە لایەکەی دیکەدا تاکو بێتەوە حاڵەتی هاوســەنگیی (توازن).

بۆ نموونە: جوولەکەکان لە بواری ماددیگەرایی و گرنگی دان بە دونیا و بیرکردنەوە لە جەستەو تێرکردنی غەریزەکانی زۆر تێیان پەڕاندبوو، بۆیە خوای پەروەردگار (عیسی)ی (علیە الصلاة والسلام) نارد کە بۆ خۆی نموونەی زەقی ڕووحانیەت وشکانەوەیە بەو لایەنەدا، چونکە لە ژیانی دا ژنی نەهێناوە ومالّ و حالّی پێکەوە نەناوە و هەتا بلّێی دنیا بە کەمگر (زاهد) بووە.

وە ئەگەر تەماشای (ئینجیل)یش بکەین دەبینین زۆربەی ڕێنموونی یەکانی خـــوای پەروەردگار کە بۆ (عیسی)ی (علیە الصلاة والسلام) ناردوون، وە ئامۆژگاری یەکانی (عیسی)ش زیاتر باســـی لایەنی ڕووحی دەکەن، هەڵبەتە ئەو تەورات و ئینجیلەی کە ئێستا لەبەر دەستت دان جێگەی متمانە نین، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا کە (باطـــــل) و ناهەقی زۆریشیان تێکەڵ کراوە، هەر

چۆنێك بێت شتێك هەقیان هەر پێوە ماوە بایی ئەوەندەی کە نێوەڕۆکەکانیانی پێ بزانین و ڕێڕەو (إتجاه)ی گشتیی یانی پێ دەرك بکەین.

بەڵێ جا سەرجەم ڕێـرەوونییەکانی ئینجیل زیاتر باسی لایەنی ڕووحی و ئەخلاقی و بیر کردنەوەن لە قیامەت، کە دیارە ئەوە وەك کاردانەوەیەك بووە بۆ ڕۆچوون (غلّو) و تێ پەڕاندن (إفراط)ی جوولەکە بە لای دونیاو ماددی یەت و جەستەدا.

مەبەستم لێرەدا ئەوەیە: ئیسلام کە دوایین شـــەریعەتی خوایە لە کاردانەوەی وەزعێکی تایبەت دا نەهاتوە، بەڵکو شـــەریعەتێکی خواییە بۆ ئینسان بە بێ ئەوەی ئەوە لەبەرچاو بگیرێ کە بەرپەرچی فلان و فیسار وەزع و لایەنە بداتەوە، بەڵکو بە هاوسەنگیی (توازن)یەوە هاتوە و حاڵەتی خوارسك (فطري) و سروشتی مرۆڤی تێدا ڕەچاو کراوە.

جا لە کاتێك دا کە ئینسان پابەند دەبێ بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە ئەو حاڵەتی هاوسەنگیی (توازن)ەی بۆ پەیدا دەبێ کە تەنیا لەو حاڵەتەش دا دەبێتە ئینسانێکی ڕاست و دروست، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْـرٌ لِلْعَالَمِينَ (27) لِمَنْ شَاءَ مِنْكُمْ أَنْ يَسْتَقِيمَ ﴾ [283] .

جا برا شـــیرینەکانم! من تێبینی ئەوەم کردوە کە هەندێك لە ئێمە وەك ئیسلامیی لە دونیادا بە گشـــتی و لە کوردستان دا بە تایبەتی لە ئەنجامی ئەوەدا کە بێ بەند و باریی و ڕۆچوونی خەڵکێك بە ماددی یەت دا دەبینین، وە زیادە ڕۆیی کردنی خەڵکێك لە دونیا ویستی و بەڵکو لە دونیا پەرستیی دا دەبینین، لە ئەنجامی ئەوەدا زۆرجار بێ ئەوەی خۆمان هەست پێ بکەین بە لای

---

(283) التكوير (27، 28) .

دیکەدا تێ دەپەڕێنین و زیاتر ئیسلام لەوەدا دەبینین کە شتێکی مەعنەویی و قیامەتییە و بایەخ و ئەمیەت بە دنیا و ژیان و گوزەرانی خەڵك نادات !!

لە کاتێك دا کە درێژترین ئایەتی قورئان ئایەتی (دَیْن)ە کە ئایەتی ژمارە (282)یە لە سوورەتی (البقرة)ە و باسی هەندێك یاسای بازرگانی و مامەڵە دەکات !

هەروەها لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەو هەل ومەرج و واقیعە ماددیگەراییەی کە ئێستا لە دنیادا باوە و پەرەی ستاندوە زادە و بەرهەمی فیکری بەشەرە بە تایبەت خەڵکی ڕۆژئاوا پاش ئەوەی یەکجارەکی ئایینی نەصرانییان وەلانا و لە ژیان و گوزەرانی خۆیان دایانڕنی و دووریان خستەوە و پەنایان بردە بەر چەندان ڕێچکە و بیردۆزە بۆ ڕێکخستنی ژیان و گوزەرانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەلایەتیی یان، لە کاردانەوەی ئەوەدا کەسانێکمان هەن کە حەساسیيەتیان پەیدا کردوە بەرانبەر بە سەرجەم ئەو ڕێچکە و بیر و بۆچوون و بیردۆزانە بێ ئەوەی سەرنج بدەن داخۆ ڕاددەی دووریی ونزیکی یان چەندە و چی و چی و کوێ و کوێیان لەگەڵ ئیسلام ناگونجێ و چی و چی و کوێ و کوێشیان لەگەڵی دا تەبا و گونجاوە !!

ئاشکراشە کە لە ئاکامی ئەو جۆرە هەڵوێست وەرگرتنە عاتیفییانە و کاردانەوە هەستیارانەوەیەوە بابای مسوڵمان کەم و زۆر هاوسەنگیی و ڕێکیی (توازن تعادل)ی سروشتییانەی خۆی کە بە هۆی ڕاست لێ تێگەیشتن و باش پێوە پابەند بوونی شەریعەتەوە بۆی پەیدا بووە، لە دەستی دەدات و خۆی لاتەڵ و لاسەنگ دەکات و خەڵکی دیکەش کە لە ئیسلام بێ ئاگان ئەو لاتەڵیی و لاسەنگییە دەگێڕنەوە بۆ خودی ئیسلام !

بۆ نموونە: ئێستا لەم ڕۆژگارەمان دا باس وخواسی (مافی مرۆڤـ)[284] گەرم و گوڕە، جا ئایا پێویست دەکات ئێمەی ئیسلامیی حەساسییەتمان بەو باس و خواسە هەبێ؟!! بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێ زۆرمان پێ خۆش بێت، بۆچی؟! لەبەر دوو هۆ:

یەکەم: دین و شـــەریعەتی خوای دادگەر لە بنەڕەت دا بۆ لەسەر کردنەوەی ئینسان و پاراستنی کەسایەتیی و ڕێز و حورمەتی هاتوە.

دووەم: مرۆڤ لە ژێر سایەی شـــوومی ســـیستەم و ڕژێمە لائیك و ئینسان کردەکان دا چەوسێنراوەتەوەو دەچەوسێنرێتەوەو کەسایەتیی و کەرامەتی پێشێل کراوە و دەکرێ، بۆ وێنە لە ڕووی ئابوورییـــەوە ئینسان لە ژێر سایەی سیستەمی ســـەرمایەداریی (کاپیتالیزم)دا، بە دڕندانەترین و بێرەحمانەترین شێوە خوێنی دەمژرێ و ڕەنجی دەدزرێ و مافەکانی پێشێل دەکرێن و لە مرۆڤـ دەشۆرێنرێ وەك ئامێر و شـــمەك مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ!

جا کاتی خۆی لە کاردانەوەی سیســـتەمی سەرمایەداری (کاپیتالیزم)دا، سیستەمی (سوسیالیزم) دروست بوو، کە بە بلووکی ڕۆژهەڵات ناسرا بوو و لە ســـەرەتای نەوەدەکان دا لەبەریەك هەڵوەشا، بەڵام وەك فیکرە هەر ماوە لەو سیستەمەش دا دیسان چەوسێنرانەوەی مرۆڤـ هەر بەردەوام بوو، چونکە ئەگەر لە پێش دا بە دەستی سەرمایەدارەکان دەچەوسێنرایەوە ئەمجارە بە دەســـتی حیزبییەکان و ئەوانەی کە بە ناوی چینی کرێکار (پرولیتاریا)وە حوکمیـــان

(284) یەکێك لە بابەتە سەرەکییەکانی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) (مافەکـــانی مرۆڤـ)ە، بڕوانە: چاپی پێنجەم نووسینگەی تەفسیر : لاپەڕە 133 تا 190.

دەکرد چەوسێنرایەوە، وەك (میلۆڤان دۆگیلاس) لە کتێبەکەی دا بە ناوی چینی نوێ (الطبقة الجديدة) باس دەکات و ڕەخنە لە کۆمۆنیزم و مارکسیزم دەگرێت و دەڵێ: (ئێمە ڕەخنەمان هەبوو لە کاردانەوەی ڕژێمی سەرمایەداریی دا دروست بووین پێمان وابوو سەرمایەدارەکان خەڵك و میللەت دەچەوسێننەوە، بەڵام ئێستا لە ژێر سایەی سۆسیالیزم و مارکسیزم دا (حیزب) بۆتە چینێك کە جێگای سەرمایەدارەکانی گرتۆتەوە وە ئەگەر لە ژێر سایەی سیستەمی سەرمایەداریی دا خەڵك تەنیا لە ڕووی ئابووری یەوە دەچەوسێنرایەوە لە لای ئێمە وێڕای لایەنی ئابووریی بەهۆی قانوون و دەستەڵاتی دەوڵەتیشەوە هەر دەچەوسێنرێتەوە چونکە ئێمە خاوەنی هەموو شتێکین وەك حیزب، میللەت و جەماوەری بێچارەش هیچی بەدەست نیە).

بەڵێ شیوعیی یەکان و مارکسییەکان لە کاردانەوەی سیستەمی سەرمایەدارییدا بڕوایان بە (دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا) هێنا و دەیانگوت دەبێ چینی کرێکار صەلاحیەت ودەستەڵاتی موتڵەقی هەبێ و هەموو شتێکی بە دەست بێ.

بەڵام دوایی سەیریان کرد هەر بە ناوی چینی کرێکارەوە لە ژێر پەردەی دا چینێکی نوێ پەیدا بوو کە زۆر لە سەرمایەدارەکان خراپتر خەڵکی بە گشتی و خودی چینی کرێکاری بە تایبەت دەچەوساندەوە!

مەبەستم لەم برە توێژینەوەیە ئەوەیە کە کاتی خۆی جووڵانەوەی داوا کردنی مافی مرۆڤ دروست بوو تاکو داوای مافی ئینسان بکات، تاکو ئینسان ژیانێکی مرۆڤانەی هەبێت و نەچەوسێنرێتەوە و خوێنی نەمژرێت، چ لە ڕووی

سیاسییەوە، چ لە ڕووی ئابووریی و ژیان و گوزەرانەوە، وە لە چ ڕووی کۆمەلایەتییەوە.

کەواتە: ئێمەی ئیسلامیی پێویست ناکات حەساسیەتمان هەبێ بەرانبەر زاراوە و وشەی "مافی مرۆڤ " لە سۆنگەی ئەوەوە کە ڕۆژئاواییەکان دایانهێناوە، بەڵکو دەبێ پشتگیری هەر کەسێك بین کە داوای مافی مرۆڤ دەکات و بڵێین بە حەقیقەت مافی مرۆڤ وەك پێویست تەنها لە دینی خوا دایە چونکە خوا مرۆڤی بە جێنشینی خۆی داناوە وەك فەرمووویەتی: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾[285] وە ڕایگەیاندوە کە ڕێزی لە وەچەی ئادەم ناوە بە گشتی و بێ هەڵاواردن، وەك فەرمووویەتی : ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ ﴾ [286] وە ڕوونی کردۆتەوە کە لە چاکترین شێوە پێکهاتن دا دروستی کردوە، وەك فەرمووویەتی: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴾[287]. وە ڕۆژێك تەرمێکیان بە شوێنێك دا هێنا پێغەمبەر ﷺ لە بەری هەڵسا، گوتیان (یا رسول الله إنه یهودي) ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە کابرایەکی جوولەکەیە، ئەویش فەرمووی(أولیست نفسا؟!) ئایا ئینسان نیە؟! واتە مادام مرۆڤە هەر جێگای ڕێز و حورمەتە و دەبێ لەبەری هەڵسین و ڕێزی بگرین.

کەوابوو کاتێك باسی مافی مرۆڤ و ئازادیی مرۆڤ و نەچەوسێنرانەوەی مرۆڤ ، دەکرێت با ئێمە وا نەزانین کە ئەوە پێچەوانەی دینی ئێمەیە !

---

(285) البقرة (30) .

(286) الاسراء (71).

(287) التین (4).

هەرچەندە زۆر جار ئەهلی کوفر و نیفاق بە ناوی مافـــی مرۆڤەوە دەیانەوێ دژایەتی ئیسلام بکەن، بەڵام مافی مرۆڤـ لە بنچینـەدا نەك هـــەر دژ و پێچەوانەی ئیسلام نیە بگرە یەکێکە لەو شـــتانەی کە ئیسلام زۆر جەختی لەسەریان کردوە و ئێمەش نابێ هەق (حـــق)ێك ڕەفز بکەین چونکە ناهەقی (باطل) یەکی لەگەڵ تێکەڵ کراوە بەڵکو پێویستە هەق و ناهـــەق و پاك و پیس لەیەك جیا بکەینەوە.

یان مەســـەلەی دیموکڕاسی[288]، دیارە دیموکڕاسی وەك سیستەمی حوکمـــڕانی کاتی خۆی لە ڕۆژئاوا پەیدا بوو، لە کاردانەوەی دیکتاتۆریەتی پادشاکانی ئەورووپادا، وە لە کاردانەوەی زوڵم و ســـتەم و چەوسانەوەی دام و دەزگاکانی کلێسادا پەیدا بوو، چونکە هەم پادشـاکان و هەم پاپا و قەشەکان پاڵیان لە یەك دابوو و خەڵکیان دەچەوســــاندەوە، یەکەمیان بە سوڵتەی سیاسی ودووەمیان بە سوڵتەی ڕووحی، بۆیە خەڵك و جەماوەری چەوسێنراوەی ڕۆژئاوا شۆڕش و ڕاپەڕینیان دەست پێ کرد، سەرەتا وڵاتی (فەڕەنسا) و دوایی شـــوێنەکانی دیکەشی تەنیەوە و گرتەوە، وە لە ئەنجام دا خەڵك گوتیان دەبێ دیموکراســـی (حوکمی گەل) بێتە سیستمی حوکمڕانی و دیکتـــاتۆریەت تور بدرێ.

جا ئێمە دەزانین کە دیموکراسی هەڵەی تێدان، وەك چۆن عەلمانیەت و دیکتاتۆریەتیش هەڵەنە، بەڵام دەبێ بشزانین کە دیموکڕاسی کە پوختەی مانایەکەی (حوکمی گەل)ە، لە ڕاســـتی دا لە کاردانەوەی دیکتاتۆریەت دا

(288) لە کتێبی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)دا مەسەلەی دیموکراسی مان توێژیوەتەوە بڕوانە: چاپی پێنجەم : لاپەڕە : 241 تا 356.

پەیدا بوو، بۆیە وەختێك دەڵێین دیموکراسی هەڵەیە و پێی ڕازی نین، دەبێ وریا بین و خەڵك بە هەڵە لێمان حاڵی نەبێ و وا بزانێ مادام بە دیموکراسی ڕازی نین مانای وایە لایەنگری دیکتاتۆریەتین!! چونکە ئێمە کە جارێك ڕقمان لە دیموکراسی بێ لەبەر لایەنە خراپەکانی و ئەو هەڵە و کەم و کووڕییانەی دەیانگرێتە خۆی، ئەوە بێگومان دە جاران ڕقمان لە دیکتاتۆری یەت و خۆسەپاندن و چەوساندنەوەیە و لە بەرانبەر ئیسلامیش دا هەردووکیان بە هەڵە و پووچ دەزانین، بەڵام بێگومان دیموکراسی هەندێك شتی تێدایە کە لە ئیسلامیش دا هەن وشتی پەسەند ورەوا (حق)ن بۆ نموونە:گێڕانەوەی دەستەڵات بۆ خەڵك و دەستاودەست پێکردنی دەستەڵات بە ئاشتییانە و هەڵبژاردن و ڕەخنە گرتن لە دەستەڵات و چاودێری کردنی و ...هتد.

بەڵام بێگومان هەر کام لەو ئەسڵ و بنەمایانە کە خاڵی پێکگەیشتنی نێوان سیستمی حوکمڕانی ئیسلامیی و دیموکراسیین لە ئیسلام دا تایبەتمەندیی خۆیانیان هەیە.

کەواتە: دەبێ وریا بین و لە هەموو حاڵان دا پابەندی شەریعەتی خوا بین، وە حەساسیەتمان نەبێ بەرانبەر بە هیچ بۆچوون وقسەیەك کە لە زاتی خۆی دا هەق بێ یان شیعارێك کە لە خودی خۆیدا هەق بێ و دژی باتلێك بێ، بەڵکو ئێمە هەر شتێك هەق بێ لەگەڵی داین چونکە بەرلەوە لە دینی خۆمان دا هەیە، وە هیچ شتێکی داهێنراو و نوێ نیە کە چاك بێت و لە شەریعەتی خوادا بنەمای نەبێ، چونکە خوای پەروەردگار و بەدیهێنەر (سبحانە و تعالی) ئاگاداری ورد و درشتی داخوازی یەکانی ئینسانە و بۆ خۆی لە خەڵك چاکتر دەزانێ کە چی یان پێویستە و بۆیان باشە چ وەك تاك چ وەك کۆمەڵ، بۆ

سیاسەت و عیبادەت و ڕووح و جەستە و دونیا و دوا ڕۆژ و ... هتد وە چی یان پێویستە و چی یان بە کەڵك دێت خوای پەروەردگار هەمووی لە شەریعەت و بەرنامەکەی خۆی دا ڕەچاو کردوە.

ئینجا ئێمە پێویستە لە بواری دینداریی (تدیّن)ی شەخسیشمان دا وریا بین بە تایبەت لە بواری مامەڵە لەگەڵ (عەقڵ و نەقڵ) دا، بۆ نموونە مسوڵمانی وا هەیە حەساسیەتی بەرانبەر بە عەقڵ و بیرکردنەوەو کۆشش کردن (إجتهاد) هەیە و پێی وایە کە ئەوە دین لاوازیی دەگەیەنێ!! بەڵام نەخێر وانیە، بەڵکو ئینسان بۆیە لە لایەن خواوە کراوە بە جێنشین و ئەمانەتی پێ سپێردراوە و، بۆیە بە کەڵکی بەندایەتی کردن بۆ خوا و بە کەڵکی تاقیکردنەوە دێت، چونکە عەقڵی هەیە، وە بۆیەش پەروەردگار ڕووی دواندن (خطاب)ی خۆی ئاراستەی ئاژەڵان (حیوانات) و بێ گیانان (جمادات) نەکردوە چونکە، ئەو عەقڵ و شعوورەیان نیە کە بتوانن بە ویستی خۆیان فەرمانەکانی خوا جێبەجێ بکەن و پێشتر لێی تێ بگەن، بۆیە بە کەڵکی ئەوە نەهاتوون خوا شەریعەت وبەرنامەیان بۆ بنێرێت و تاقیان بکاتەوە، کەواتە نابێ بە هیچ جۆرێك حەساسیەتمان بەرانبەر بە عەقڵ هەبێت، چونکە خوای زانا لە چەندان ئایەت دا مەدحی کەسانی عاقڵ و تێگەیشتوو دەکات و لێ تێ گەیشتنی ئایەتە قورئانییەکانی و پەی پێ بردنی ئایەتە بوونەوەرییەکانی تایبەت دەکات بەوانەوە:

1- ﴿ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ (البقرة -242).

2- ﴿...وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (النحل-44).

3- ﴿...وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَ أُوْلُوا الأَلْبَابِ﴾(البقرة -269) .

4- ﴿ قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴾ (الانعام -98) .

کۆتایی ئەم بابەتەش بەو چەند دێڕەی خوارەوە دێنم:

ئەگەر بمانەوێ لە سایەی ئیمانمانەوە مسوڵمانی هاوسەنگ بین، دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین کە پارێزکاریی (تقوى) هەموو بوارەکـــانی ژیان دەگرێتەوە، واتە: (تقوى) ی عەقیدەیـی هەیە و (تقوى)ی عیبـــادەت هەیە، (تقوى) ی ئەخلاقی هەیە، (تقوى) لە ســــەرجەم بوارەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و جیهادی دا هەیە، واتە: پارێزکاریی تێر وتەواو ئەوەیە کە لە هەموو ئەو بوارانەدا پابەند بێ بە شەریعەتی خواوە ئەوجار دەبی بە ئینسانێکی پارێزکـــار (متقي)، نەك پێمـــان وابێ تەنیا بە نوێژ کردن و ڕۆژوو گرتن و قورئـــان خوێندن و زیکـر و ویرد و ڕیش هێشتنەوە و نەزەر و درۆ و غەیبەت نەکردن دەبینە پارێزکار نەخێر، چونکە ئەگەر سەیری ئایەتەکان بکەین کە باسی (تقوى) دەکەن، خوای پەروەردگار لە هەموو بوارەکانی ژیان دا (تقوى) دێنێتەوە پێش، پوختەی مانای (تقوى)ش واتە لە خۆ وریا بوون و خۆ پاراستن لە هەر شتێك کە خوا پێی ناخۆشە، دەجا وەك چۆن خوا پێی ناخۆشە ئینسان درۆ بکات، بە هەمان شێوەش پێی ناخۆشە کە لە بازرگانی دا فێڵ لە خەڵك بکات، وە وەك چۆن پێی ناخۆشە نوێژ بچوێنێ، ئاواش پێی ناخۆشە لە ڕوو بەڕووبوونەوەدا پشت لە دوژمن بکات، وە وەك چۆن پێی ناخۆشە ڕۆژوو نەگرێ، ئاواش پێی ناخۆشە کە عەقڵی خۆی بەکار نەهێنێ و ورد نەبێتەوە و ڕانەمێنێ و ... هتد، کەواتە با پارێزکاریی یەکەمان تێرو تەواو وهەمە لایەنە بێت و دینداریی یەکەشمان گشتگیر و هاوسەنگ بێت.

**شەشەم: بەهۆی ئیمانەوە ئینسان خۆی مەرزەم و كۆنترۆڵ دەكات:**

خوای پەروەردگار لە ئینسان دا كۆمەڵێك غەریزەو پاڵنەر و داخوازی و وزەی بەرهەست و نابەرهەستی (محسوس، غیر محسوس)ی داناون، بۆ ئەوەی بگونجێ تاقی بكرێتەوە و ژیانی سەر زەوی بگوزەرێنێ.

بۆ نموونە با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین:

**﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا (8) قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا(9) وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا ﴾**(289) واتە: سوێند بە (نفس) وە بەو زاتەی كە ڕێكی خستوە، ئینجا خراپەكاریشی فێر كردوە و پارێزكاریشی فێر كردوە. بێگومان سەرفرازە ئەوەی خۆی پاك و چاك كردوەو،زیانبارە كەسێك خۆی نوقمی خراپە و تاوان كردوە، (إلهام) واتە فێر كردن بە شێوەیەك كە بخرێتە نێو دڵی ئینسان و خۆی پێوەی ماندوو نەبێت، لێرەدا دەبینین خوای پەروەردگار خۆی ئینسانی وا دروست كردوە كە بتوانێ خراپە و گوناح بكات وە بشتوانێ چاكە و تاعەتیش بكات، چونكە بەوە نەبێ تاقی ناكرێتەوە، خۆ ئەگەر خوا ویستبای ئینسان هەر چاكەو فەرمانبەربی بكات، ئەوە فریشتەی زۆرن و ئەوان وەك خوا (سبحانه و تعالی) پێناسەی كردوون:

**﴿ لاَ يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾**(290) .

(289) الشمس (7-10) .

(290) التحريم (6) .

بەلاَم خوای کاربەجێ ویستوویەتی کائینێك دروســــت بکات کە بتوانێ ڕاست بڕوا و خواریش بڕوات: بەرز بێتەوە و نزمیش بێتەوە، چاك بێ و خراپیش بێ، وە بتوانێ خواش لە خۆی ڕازی بکات، تووڕەشی بکات !

ئینجا ئایا خوای کاربەجێ (سبحانە وتعالی) حیکمەت و مەبەستی لەوەدا چی بووە ؟!

ئەوە دەگونجێ بە دوو شێوە وەلاَمی بدەینەوە:

یەکەم: خوا (سبحانە وتعالی) تەنها خۆی بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەنــی هەموو شتێکە و هیچ کەس مافــی ئەوەی نیە ئەو پرســــیارەی ئاڕاستە بکات، وەك فەرموویەتی :

﴿ لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴾[291] .

وە لە ڕاستی دا حیکمەت و نهێنی یەکانی کردەوەکانی خوای بەرز و مەزن بێ سنوورن و لەوە زیاتر و بەرزتر و مەزنتر و قووڵتــرن کە لە عەقڵی ئێمەی مرۆڤــ دا جێیان ببێتەوە.

جا من زیاتر ئەم وەلاَمەم پێ ڕاست و بەجێیە .

دووەم: کە ژمارەیەك لە زانایان وپسپۆڕانی بواری تەزکیەو عیرفان گوتوویانە: خوای پەروەردگــار خاوەنی هەرچی ناوی هەرە چاك و سیفەتی هەرە بەرز و پەسندە کە بێجگە لە خۆی هیچ کەســـێك پەیبیان پێ نابـــات و دەرکی هەموویان ناکات، جا بۆ ئەوەی ئەو ناوو سیفەتە هەرە بەرز و پەسند و چاکانەی خوا (سبحانە وتعالی) دەربکەون و بدرەوشێنەوە، خوا ویستی وا بووە کە دروست کراو (مخلوق)ێك بخولقێنێ بە کەڵکی ئەوە بێ کە ببێتە

(291) الانبــیاء (23) .

ئاوێنەی تێدا دەرکەوتن و درەوشانەوەی ئەو ناوو سیفەتانە و فەرموودەی: (ان الله تعالى خلق آدم على صورته) رواه البخاري یش پێویستە هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستییەدا ڕاڤە بکرێ.

جا لە ئەنجامی تاقی کرانەوەی ئینسانەکان لە ژیانی دنیایی سەر زەمین دا و پاشان وەرگرتنەوەی پاداشت و سزایەکانیان بە پێی کردەوەو هەڵوێستەکانیان، وایان لێ دێ کە وەك ئاوێنەیەك سیفەتەکانی خوای پەروەردگاریان تێدا بدرەوشێتەوە، بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی مەبەستیش دەڵێین:

خوای پەروەردگار وەك چۆن بەزەیی و بەخششی هەیە، بە هەمان شێوەش تووڕەیی و سزاشی هەیە وە هەم چاکە (فضل) و هەم داد (عدل)یشی هەیە، هەر بۆیەش بەهەشتی داناوە بۆ ئەوانەی چاکە و ڕەحمەتی خوا دەیانگرێتەوە، دۆزەخیشی داناوە بۆ کەسانێك کە تووڕەیی و خەشمی خوا دەیانگرێتەوە، ڕێگایەکیشی دیاری کردوە بەرەو بەهەشت، وە ڕێگایەکیش کە بەرەو دۆزەخ دەچێت، جا هەرچی فریشتەکانن جۆرە دروستکراوێکی خوان کە هەرچەندە خاوەن عەقڵ و ئیرادەن، بەڵام خوا وای دروست کردوون کە ناتوانن بێ فەرمانی وی بکەن، هەروەها ماددەی بێ گیان (جماد) و ڕووەك (نبات) و گیاندار (حیوان)یش کە عەقڵ و ئیرادەیان نیە بە هەمان شێوە لە یاساکانی خوا لانادەن، بەڵام شەیتانەکان (شیاطین) لەو بارەوە جیان. جارێ خوای کاربەجێ لە سەرەتادا (ابلیس)ی بە جۆرێك دروست کردبوو کە بتوانێ چاکەش و خراپەش بکات بەڵام دوایی کارێکی وای کرد کە بە ئیختیاری خۆی ڕێگەی چاکە کردنی لە خۆی گرت، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە کە (ابلیس)یش لە سەرەتاوە دەیتوانی چاکە وتاعەت بکات ئەوەیە کە ئەو لە (جن)ە ﴿ **فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ كَانَ مِنْ الْجِنِّ** ﴾ و (جن)یش وەك (انس) وەك کائینێکی عاقڵی

خاوەن ئیرادە دەتوانن بە هەردووك ڕێی خێر و شەڕدا بڕۆن، واتە دەتوانن چاكە بكەن و خراپەش بكەن، بەڵام لە ئەنجام دا شەیتان بەهۆی سەرپێچی كردنی لە فەرمانی خوا و پاشان تەحەددا كردنی و مۆڵەت وەرگرتنی بۆ خراپەكاریی تاماوە وای لە خۆی كرد كە ئێستا هەر دەتوانێ خراپە بكات.

جا لەو نێوانەدا ئینسان و(جن) بە گشتی دەتوانن چاكـــەش و خراپەش بكەن، بۆچی؟! بۆ ئەوەی سەرجەم ناووسیفەتەكانی خوا لەو دروستكراوانەی دا بدرەوشێنەوە، كە بە ویستی ئازاد و حیكمەتی بێ سنووری خۆی خوڵقاندوونی، بۆ نموونە: خوای بەرزو مەزن سیفەتی لــێ خۆش بوونی هەیە، جا ئەگەر خەڵكی گوناح نەكات ولــێی نەپاڕێتەوە كە لێیان خۆش بێ، سیفەتی لێبوردن و لێخۆش بوونی خوا (سبحانه وتعالى) لەچی دا و چۆن دەردەكەوێت؟! هەروەها خوا سیفەتی هیدایەت دانی هەیە و(الهادي)یە بۆیە بۆ درەوشــانەوەی سیفەتی هیدایەتدانی دەبێ دروستكراوانێك هەبن كە پێویستیان بە هیدایەت بێت و ئەویش هیدایەتیان بدات.

وە هەروەها باقی سیفەتەكانی دیكەی خوای پەروەردگار بەهەمان شێوە .

بەڵام من پێشتر ئاماژەم پێدا كە ئەو ڕایەم پێ ڕاســـتە و زیاتر بە دڵمەوە دەچەسپێ كە ناچێتە نێو وردەكارییەكان (تفاصيل)ەوە و هەر لە ڕێوە دەڵێ: خوا (سبحانه وتعالــى) بۆ خۆی خاوەن و پەروەردگاری هەموو شـــــتێكە و سیفەتەكانیشی لەوە بەرزتر و مەزنتــرن كە ئێمە بتوانین بە عەقڵی گچكــە و زانیاری كەمی خۆمان دەركی ڕاز و نهێنی یەكانیان بكەین.

ئینجا با بزانین ئایا چۆن چۆنی ئینسان دەتوانێ خۆی كۆنتــڕۆڵ بكات و ســـیفەتە بەرزەكان لە خۆیدا بێنێتــە دی و خۆی لە خەسڵەتە نزمەكان بژار بكات؟! خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا(9)وَقَدْ خَابَ

مَنْ دَسَّاهَا ﴾(292) واتە: بە ڕاستی هەر کەسێك نەفسی خۆی تەزکیە کردبێ سەرفرازە و، هەر کەسێك لە گوناهان دا نوقمی کردبێ پەشێمان و دۆڕاوە.

(تزكية)ش بریتی یە لە:

لە خۆدا نەهێشتن وخۆ بژار کردن وخۆ پاك کردنەوە لە سیفەتە خراپەکان، وە خۆ ڕازاندنەوە و لە خۆدا زیاد کردنی سیفەتە چاکەکان، واتە: (تقوى) لە خۆت دا بهێنیە دی و(فجور) لە خۆت دا لابەری و سەرکوتی بکەی بە جۆرێك کە نەتوانێ تووشی لادان و خلیسکانت بکات.

کەواتە سیفەتی (فجور) وەك (استعداد) لە ئینسان دا هەیە، بەڵام بە هۆی ڕوو لە خوا کردن و ئیمان و بەندایەتی کردن بۆ خواوە ئینسان دەتوانێ غەریزە و هاندەرەکانی نەفسی بەرەو چاکە ببات کە خوا (سبحانه وتعالى) بە مەبەستی تاقی کردنەوە لە ئینسان دا داینا‌ون، چونکە ئەگەر ئینسان غەریزەی تووڕە بوون و تۆڵە ستاندنەوەی نەبووایە، یان غەریزەی موڵکایەتی و شت هەبوون (غريزة التملك) یان غەریزەی جینسی، یان توانای فرت و فێڵ و فریو دان .. یان .. هتدی نەبووایە، ئەوە مانای وایە بە ناچاری چاکەکار دەبوو و نەیدەتوانی لابدات و ئەو گوناح و خراپانە بکات کە دەبنە مایەی کەوتنی لە تاقی کردنەوەی ژیانی دنیایی دا، وەك: قەتڵ و دزیی و زوڵم و زینا و ستەم وخراپە وفێڵ و... هتد، ئینجا ئەگەر واش بووایە مەجالی تاقی کرانەوەی نەدەبوو، وەك چۆن فریشتەکان بە کەڵکی تاقی کرانەوە نایەن، چونکە ناتوانن گوناح بکەن، لە سۆنگەی ئەوەوە کە غەریزە و پاڵنەری خراپیان تێدا دانەنراوە دەجا ئینسانیش ئەگەر وەك وان بووایە دیارە بە کەڵکی ئەوە نەدەهات کە

(292) الشمس (9، 10).

لەسەر زەوی دابنرێ بۆ تاقی کردنەوە و شایستەی ئەوە نەدەبوو کە خوا بیکات بە جێ نشـــینی خۆی وئاوەدان کردنەوەی سەر زەوی پێ بسپێرێ کە مایەی ڕەزامەندیی یەتی، وەك فەرموویەتی:

﴿ هُوَ أَنشَأَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا... ﴾(293) .

پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی چۆنیەتی و شێوازی خۆ پاك و چاك (تزكية) كردن دەفەرموێ : (**اللهم آتِ نفسي تقواها، و زكِّها أنت خير من زكاها، أنت وليها ومولاها**)(294) واتە: ئەی خوایە پارێزکـــــاریی (تقوى) یەك بە نەفسم بدە کە شایستە و تەواو بێت، وە پاك و چاکی بکە چونکە چاکترین کەسی کە پاك وچاکی بکەی، بێ گومان هەر تۆی پشتیوان وسەرپەرشتیاری.

کەواتە: نەفس بە تێدا جێگیر بوونی پارێزکاریی تەزکیە دەبێ و پاڕانەوەش لە خوا یەکێکە لە میکانیزمەکانی. هەروەها خوای پەنها بین لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ **فَأَمَّا مَنْ طَغَى(37)وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا(38)فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى(39) وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنْ الْهَوَى(40)فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى** ﴾(295) لێرەدا خوا (سبحانه وتعالـى) دوو جۆرە ئینســـــانمان بۆ پێناسە دەکات:

یەکەم: کەسێك کە لە خوا یاخی دەبێت و سەرەنجام سەرپێچی دەکات و ژیانی دونیا بەسەر هی دوا ڕۆژدا هەڵدەبژێرێ، ئاشکراشە هەر کەسێك

---

(293) هود (61) .

(294) رواه مسلم .

(295) النازعـات (37-41) .

لە خوا یاخی بێت دەبێتە دونیا پەرست و ئەویش ﴿ فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى ﴾ دۆزەخ شوێن و مـاوایەتی .

دووەم: کەسێك کە لە پلە و پایەی خوا دەترسێ یان لە ڕاوەستانی خۆی دەترسێ لە بەردەم خوای پەروەردگاردا وە نەفسی خۆی لە هەواو ئارەزووەکانی دەگێڕێتەوە، کەسێکی واش بەهەشت جێگا و شوێن و ماوایەتی، دیارە کاتێکیش ئینسان دەتوانێ نەفسی خۆی لە ئارەزووە نا شەرعییەکان بگێڕێتەوە کە لە خوا بترسێ، کەواتە: ڕاستە کە ئینسان: بەهۆی ئیمانەوە خۆی کۆنترۆڵ و مەرزەم دەکات و جڵەوی نەفسی خۆی بە دەست خۆی دەبێت و سەرەنجام دەبێتە ئەهلی تەقوا و خۆی پاك و چاك دەکات.

**حەوتەم: بەهۆی ئیمانەوە ئینسان هەم بەسەر ستەم و نەفامیی دەروونی خۆی دا و هەم بەسەر سێ کوچکەی شووەی: (دەستەڵات و سامان و فریودان)ی تاغووتەکانیش دا زاڵ دەبێ:**

بەڵێ خۆشەویستان! ئینسان بەهۆی ئیمانەوە هەم بەسەر زوڵم و جەهلی خۆی دا زاڵ دەبێ و هەم بەسەر دەستەلات و زوڵم وسەروەت و سامان و تەماع وەبەردان و چەواشە کردن و فرت و فێڵی تاغووتەکانیش دا زاڵ دەبێ.

وەك پێشتریش گوتمان: لە سۆنگەی ئەوەوە کە خوای پەروەردگار ئینسانی بۆ تاقی کردنەوە دروست کردوە وەك فەرموویەتی : ﴿ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ ﴾[296] کاتێکیش دەگونجێ تاقی بکرێتەوە کە ئیحتیمالی دەرچوون و دەرنەچوونی هەبێ، کاتێکیش ئیحتیمالی دەرچوون و دەرنەچوونی

(296) الملـك (2) .

دەبێ کە بتوانێ چاکە بکات و خوا لە خۆی ڕازی بکات، یاخود خراپە بکات و خوا لە خۆی برەنجێنێ و توورە بکات، بۆیە وەك چۆن کۆمەڵێك سیفەتی باشی لە ئینسان دا دروست کردوون دەتوانێ پێیان بەرز بێتەوە، بەهەمان شێوە کۆمەڵێك سیفەتی خراپیشی تێدا دروست کردوون کە دەتوانێ پێیان نزم بێتەوە.

وە لە ڕاستی دا ئینسان مەخلووقێکی زۆر ناوازە و گرنگە، چونکە ئەو مەسافەیەی کە ئینسان دەتوانێ حەرەکەی تێدا بکات زۆر فراوان و سەر سووڕهێنەرە و هیچ دروستکراوێکی دیکەی خوا ئاوا نیە، ئینسان دەتوانێ هێندە بەرز بێتەوە کە خوای پەروەردگار بە فریشتەکانی بڵێ کڕنووشی بۆ بەرن وەك دەفەرموێ:﴿ **وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُوا لآدَمَ فَسَجَدُوا** ﴾! دەشتوانێ هێندە نزم بێتەوە کە خوای کاربەجێ ودادگەر خۆی و دروستکراوەکانی نەفرین و لەعنەتی لێ بکەن، وەك فەرموویەتی: ﴿ **إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنْ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِنْ بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُوْلَئِكَ يَلْعَنُهُمْ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمْ اللاَّعِنُونَ** ﴾[297] واتە: ئەوانەی ئەو بەڵگەو ئایەتانە و ئەو هیدایەتە دەشارنەوە کە ئێمە ناردوومانە خوارێ، پاش ئەوەی بۆ خەڵکیمان ڕوون کردوونەوە ئەوانە خوا بۆ خۆی و هەرچی لەعنەت کەرە لەعنەتیان لێ دەکات، کەواتە: هیچ دروست کراوێك لەوە خراپتر نەبووە و نابێ !

(297) البقـرة (159) .

هەروەها فەرمووبەتی: ﴿ **لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ(4)ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ** ﴾(298) واتە: بێ گومان ئینسانمان لە باشترین شێوەدا دروست کردوە دوایی گێڕامانەوە بۆ نزمترینی هەموو نزمان.

وە فەرموویەتی : (**إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِنْدَ اللَّهِ الَّذِينَ كَفَرُوا فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ**)(299) واتە: بێ گومان خراپترین زینـدەوەر لە لای خوا ئەوانەن کە بێ بڕوا و کـافرن، کەواتە هیچ دروستکراوێك لەوە خراپتر نابێ، وە هیچ کەسیش لەو کەسە چاکتر نیە کە خوای پەروەردگار بیکا بە جێ نشـینی خۆی و هەڵی بژێرێ بۆ ئەوەی فریشتەکان کە پاکترین دروست کراون کڕنووشی بۆ بەرن، چونکە کە فریشتەکان کڕنووشیان بۆ ئادەم (علیه الصلاة والسلام) بردوە و ئادەمیش باوکی ئێمەیە، کەواتە: ئەو ڕێز وحورمەتە کەم و زۆر ئێمەی وەچەی ئەو بابە بەرێزەش دەگرێتەوە. بەلاّم بە مەرجێك ئێمەش کەم و زۆر وەك باوکمان (ئادەم) بین ئینجا شایستەی ئەو جۆرە ڕێزەی فریشتەکان دەبین، بەڵێ بەهۆی ئەو سیفەتە دژ بە یەکانەی کە خوای پەروەردگار لە ئینسان دا دروستی کردوون ئینسان دەتوانێ بەرزیش بێتەوە و نزمیش بێتەوە، بەهۆی سیفەتە چاکەکانەوە بەرز و بەهۆی خراپەکانیشەوە نزم بێتەوە، بەڵێ ئەو سروشتە دوو فلیقانە (مزدوج) یەکە ئینسانی وا لـێ کردوە بتوانێ (علم)یش وەدەست بهێنێ و هەم (جهل)یش، وە هەم دادگەر (عـادل)یش بێت و هەم ستەمکار (ظالم)یش خوای زانا و دادگەر (سبحانه وتعالی) لەو بارەوە فەرموویەتی:

(298) التیـن (5-6) .

(299) الأنفـال (55) .

**﴿ إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً(72)لِيُعَذِّبَ اللَّهُ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ وَيَتُوبَ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا﴾**[300]

سەرەتا دەچینە سەر توێژینەوەی ئایەتی یەکەم، پاشان ئەوەی دووەمیان دەتوێژینەوە، خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی: ئێمە ئەمانەتمان ڕانواند لەسەر ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان (واتە ئەو ئەمانەتەمان نیشانیان دا کە کامەیان دەتوانێ هەڵی بگرێ) بەڵام ڕازی نەبوون هەڵی بگرن و لێی ترسان نەبادا پێیان هەڵنەگیرێ، کەچی ئینسان هەڵی گرت، هەرچەندە ئینسانیش زۆر ستەم کارە و زۆریش نەفامە.

جا ئێستا با سەیر بکەین! بێگومان خوای پەروەردگار هیچ مەخلوقێك لە فەرمانی دەرناچێ و ناگونجێ کە بە شتێك بفەرموێ: فلانە شتەم بۆ هەڵگرە ! ئەویش بڵێ نەخێر هەڵی ناگرم ! ، واتە: بە ئاسمان و زەوی و چیاکان بفەرموێ: ئەمانەت هەڵبگرن ! ئەوانیش بڵێن: نەخێر هەڵی ناگرین !!، نەخێر شتی وا مەحاڵە و نابێ، وەك فەرموویەتی: **﴿ أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴾**[301] واتە: ئایا ئەوانە غەیری دین و بەرنامەی خوا دەخوازن، لە کاتێك دا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە بۆ وی مل کەچە چ پێی خۆش بێ. چ پێی ناخۆش بێ، وە تەنها بۆ لای ویش دەگەڕێنەوە.

---

(300) الاحزاب (72–73).

(301) آل عمران (83) .

بەڵێ هیچ شتێك نیە چار ناچــــار ملكەچی خوا نەبێ، ڕەنگە زۆر كەس پێی ناخۆش بێ خوا دروستی كردوە، بەڵام خوا هەر دروستی كردوە، یان هەیە پێی ناخۆشـــــە بژیەت و حەز بە مردن دەكـــات، بەڵام خوا هەر دەیژیەنێ ! كورتەی قســـــان: هیچ كام لە دروســتكراوەكانـــــی خوا ناتوانن لە فەرمانی دەربچن. كەواتە: لێرەدا كە خوای باڵا دەســـــت دەفەرموێ : ئێمە ئەمانەتمان نیشانی ئاسـمانەكان و زەوی و چیـــاكان دا بەڵام ئەوان ئامادە نەبوون هەڵی گرن و لـــێی ترسان، مەبەست ئەوە نیە كە خوای پەروەردگار فەرموو بێ: هەڵی بگرن و ئەوانیش هەڵیان نەگرتبێ !!

بەڵكو وەك توێژەرەوان (مفسرین) گوتوویانە: مەبەست لەو جۆرە تەعبیرە ئاوایە: ﴿ئێمە ئەمانەتێكمان هەبوو نە ئاسمانەكان بەو پان وپۆڕیی و زەبەلاحی یەیان و نە زەوی بەو هەموو شتە سەرسورهێنەرانەی كە تێیدایە و نە چیاكان بەو هەموو سەختی یە كە هەیانە نەیان توانی هەڵی بگرن و لێشی ترسان. واتە: لە خۆیان ڕانەبینی و ئامادەیی یان نەبوو هەڵی بگرن چونكە خوای پەروەردگار بۆ ئەوەی دروست نەكردوون كە ئەو ئەمانەتە هەڵبگرن، بۆیە ئەو ئامادەیی یەی تێدا دروست نەكردوون كە شایستەی ئەوە بن و لە توانایان دا هەبێ ئەو ئەمانەتە هەڵبگرن، بەڵام ئینسان لە توانای دا هەبوو و شایستەی ئەوە بوو كە ئەو ئەركەی پێ بسپێررێ و ئەو ئەمانەتە هەڵبگرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا ئینسان دوو خاڵی بێ هێزیی هەن كە چاوگی گەلێك كەم وكووڕی و نەهامەتیین و بریتین لە: ستەم و نەزانینی (الظـــلم والجهـــــل)﴾، ئا ئەوەیە مەبەست و چەمكی ئەو ئایەتە بەپێــزە.

بەڵام لێرەدا پێویستە بزانین کە مەبەست لە (إنسان) هەموو ئینسانێك نیە بە بێ هەڵاواردن، بەڵکو مەبەست ئینسانە بێ ئیمان و لاڕێیەکانە، وەك خوای زانا لە شـــوێنێکی دیکەدا فەرموویەتی : ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ (4) ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ (5) إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ [302] واتە: بێگومان ئینســانمان لە جوانترین و باشـترین شێوەدا دروست کردوە، دوایی گێڕاومانەتەوە بۆ نزمی هەرە نزمان بێجگە لەوانەی کە ئیمانیان هێناوە و کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن.

جا لێرەش - واتە لە ئایەتی ژمارە (72)ی (أحزاب) دا  مەبەســت لە ئینسان کە خوا لە پێناسەکەیدا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً ﴾ زۆر زاڵم و ستەمکار و زۆر نەفام و نەزانە، ئینسانە بێ بڕوا و سەرگەردانەکانە، نەك ئینسانەکان بە گشتی و بێ هەڵاواردن، چونکە بێ گومان ئەو پێناسەیە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ناگرێتەوە هەروەها شوێنکەوتووانی پێغەمبەران ناگرێتەوە بەڵکو تەنها ئەو جۆرە ئینسانە دەگرێتەوە کە ئامادە نیە هیدایەتی خوا وەربگرێ و ســەرەنجام ســەری لە زوڵم و ســتەمێکی زۆر و لە نەفامـــی و نەزانی یەکی زۆرەوە دەردەچێ، بەڵام ئینسان بەهۆی هیدایەتی خواوە (جهل)ەکەی دەگۆڕێ بۆ (علـم) و (ظـلم)ەکەیشی دەگۆڕێ بۆ (عدل)، (جهل)یش بریتی یە لە تێکچوونی هێزی فیکریی (القوة النظرية) و (ظلم) یش تەعبیـــر لە تێکچوونی هێزی کردەیی (القوة العملية)ی ئینسان دەکات، چونکە ئینسان دوو جۆرە هێزی هەن،

---

(302) التيـن (4، 5) .

هێزێکی فیکریی کە شتی پێ دەزانێ و، هێزێکی کردەیی کە کردەوە و چالاکییەکانی پێ ئەنجام دەدات.

جا کاتێك ئینسان لە هیدایەتی خوا (سبحانە وتعالی) دوورە لە جیاتی زانیاری (علم) گیرۆدەی نەزانیی (جهل) و لە جیاتی دادگەریی (عدل)یش دووچاری ستەم (ظلم) دەبێ.

دیارە مەبەستیش لە (جهل) لێرەدا ئەوە نیە کە بابای دوور لە خوا و بێ بڕوا هیچ جۆرە زانیاریی و شارەزاییەکی نیە! چونکە خوای پەنها بین لە وەسفی کافرەکان دا فەرموویەتی: ﴿ يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ﴾[303] ، واتە: ڕووکەشێك لە بارەی ژیانی دنیاوە دەزانن، بەڵکو مەبەست لە نەزانیی لێرەدا خۆنەناسین و خوانەناسین و دەوروبەر نەناسین و سەرەنجام ڕاست و چەوت و حەڵاڵ و حەرام و چاك و خراپ نەزانینە !

هەروەها مەبەستیش لە (ظلم) ئەوە نیە کە بابای کافر بە هیچ جۆرێك هیچ شێوەیەك لە شێوەکانی دادگەریی تێدا نەبێ !، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە بە بێ ئیمان ئینسان ناتوانێ لەسەر بناغەیەکی ڕاست و ڕەوا و پتەوو بە شێوەیەکی دادگەرانە لەگەڵ خواو خەڵك دا مامەڵە بکات وکەم و زۆر تووشی ستەم ولادان وسەرکێشی دەبێ، چونکە وەك چۆن کردەوە و هەڵوێستێك لەسەر زانیاری بنیات بنرێ سەردەکێشێ بۆ دادگەریی و ڕەوایی، کارو هەڵوێستێکیش لەسەر نەزانیی ڕۆنرابێ جگە لە ستەم و نارەوایی هیچی دیکەی لێ چاوەڕوان ناکرێ.

هەر بۆیەش لە سورەتی (الاحزاب) دا فەرموویەتی :

---

(303) الروم (7) .

﴿ لِيُعَذِّبَ اللَّهُ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ وَيَتُوبَ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا ﴾ .

وەك دەبینین خوای کاربەجێ (سبحانه وتعالی) دابەش بوونی خەڵکی بۆ هەرسێك دەستەی : دەغەڵان (منافقون) و هاوبەش دانەران (مشرکون) و بڕوا داران (مؤمنون)ی کردۆتە حیکمەت و هۆکار یاخود سەرەنجام و ئاکامی سپاردە (أمانة) پێ سپێررانی ئینسان !

کە دیارە سزا و تۆڵەی پڕ بە پێستی دەغەڵ و هاوبەش دانەران ئازار و ئەشکەنجەی هەتا هەتایی دۆزەخ و پاداشتی ڕەوای بڕوادارانیش بەهەشتی ڕازاوە و نەبڕاوەیە. حیکمەت و ڕازی ئەو دابەشبوونەش - وەك من تێی دەگەم - ئاوایە:

ئینسانەکان لە بەرانبەر ناسینی هەق و پێوە پابەند بوونی دا سێ دەستەن:

1- یان هەق دەناسن بەڵام پێیەوە پابەند نابن و بە ئانقەست مامەڵەیەکی جاهیلانەی ستەمکارانە لەگەڵ خوا و خەڵکی دا دەکەن، کە نموونەی هەرە زەقی ئەم پێڕە بریتین لە:

دەغەڵ و دوو ڕووەکان بە هەردووك ڕەگەزی نێر و مێیانەوە (المنافقین و المنافقات).

2- یان هەر لە ئەسڵ دا ئاشنای هەق نین و حەزیان بە چارەی نایەت و لەو سۆنگەیەشەوە نوقمی زەلکاوی نەزانیی بووون، ئاشکراشە کە جاهیلان جگە لە ستەم و لادان لێیان چاوەڕێ ناکرێ، نموونەی زەقی ئەو جۆرە کەسانەش پێڕی هاوبەش بۆ خوا دانەرانن بەهەردووك ڕەگەزەکەیانەوە: (المشرکین و المشرکات).

3- یان هەم هەقیشـــیان ناسیوە و هەم پێشییەوە پابەند بوونە، واتە هەم ئەهلی (علم)ن و هەم ئەهلـــی (عَدْل) یش، ئەوانیش بڕواداراني کردەوە چاکن بە نێر و مێیانەوە: (المؤمنين و المؤمنات) .

شایانی باسیشە کە هەر کـــام لە دەغەڵان (منافقين) و هاوبەش دانەران (مشركين) پشـــکیان لە هەر کام لە (ظلم) و (جهل) دا هەیە، بەڵام بۆیە خوای کاربەجێ - بە پێی تێگەیشـــتنی بەندە لە ئایەتەکە - دەغەڵەکانی کردوونە نموونەی هەرەزەقی زاڵمان و هاوبەش دانەرانیشـــی کردوونە نموونەی زەقی جاهیلان چونکە دەغەڵەکان ســـتەمیان زیاتر تێدا بەرجەستە بووە و هاوبەش دانەرەکانیش نەزانیی !

بەڵێ بە ڕاستی ستەمێکی گەورەیە ئینسان هیدایەتی خوا (سبحانه و تعالــى) شارەزا بێ و لێی حاڵی بێت کەچی ڕەفتاری پێ نەکات: ﴿ إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ ﴾(304) .

هەروەهـــــا نەزانیی و نەفامیی یەکی بێڕەزایە کە ئینسان یەکێك لە دروســـتکراوەکانی خوا (سبحانه وتعالــى) بکاتە هاوبەش (شريك)ی خوا: ﴿ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴾(305) .

بەڵام ئینسان بەهۆی ڕووناکی و هیدایەت وەحی و ئیمان پێهێنانییەوە، بە ئەندازەی ئیمانەکـــــەی هەم لە زانیاری (علم) بەهرەمەند دەبێت و تاریکی

---

(304) المنافقون (1).
(305) الحج (31) .

(جهل)ی لە عەقڵ و دڵ دا لادەچێ و، هەم بە هۆی (عدل)یشەوە شەرەفمەند دەبێت و لادان و لاتەڵیی (ظلم) ی لـێ وەدوور دەکەوێ.

وە لە کۆتاییی ئەم برە توێژینەوەیەدا کە لە بارەی ئەو دوو ئایەتەی کۆتاییی سوورەتی (الأحزاب) ەوە کردمان ئاماژە بە مەسەلەیەکی دیکەش دەکەم:

ڕەنگە یەکێك بپرسێ: بۆچی خوای زانا ودادگەر فەرموویەتی: ﴿ **وَيَتُوبَ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا** ﴾؟!

لە وەڵام دا دەڵێین:

لەبەرئەوەی خۆپاراستن لە (جهل) و (ظلم) شـتێکی ئاسان نیە و ئینسان هەرچەندە مسوڵمان و ئیماندار بێت کەم و زۆر گیـرۆدەی ئەندازەیـــەك لە ســـتەم و نەفامیـــی هەر دەبێت. بۆیە ئەهلی ئیمانیش هەرچەندە لە سایەی ئیمان و پارێزکارییانەوە لە ئەسڵی ستەم و نەفامیی پارێزراون بەڵام کەم و زۆر قور و چڵپاوی ستەمیان هەر پێ هەڵدەپژێ و تۆز و گەردی نەفامیی یان هەر لێدەنیشێ و لە سۆنگەی ئەوەشەوە پێویستی یان بە لێبوردن و بەزەیی خوای بە بەزەیی و لێبوردە هەیە کە لێیان خۆش بێت و چاوپۆشی یان لێ بکات:

ئێستاش با بێینە سەر تەوەرەی دووەمی باسەکەمان و بزانین:

چۆن ئینسان بەهۆی ئیمانەوە بەسەر سێ کوچکەی: دەستەڵات و ماڵ و سامان و فرت و فێڵی تاغووتەکان دا زاڵ دەبێ؟!

وەڵامی ئەم پرسیارەشـــمان بە ئاسانی لە بەســـەرهاتی (مووسا ﷺ و فیرعەون)دا چنگ دەکەوێ کە خوای زانا و توانا (سبحانه وتعالـی) لە چەند شوێنێکی قورئانێ بۆمان دەگێڕێتەوە و ئێمـــەش بە کورتی و لەبەر تیشکی

چەند ئایەتێك ئاماژە بە چەند ڕووداوێكی ئەو بەسەرهاتە دەكەین كە زیاتر پەیوەندییان بە باسەكەی ئێمەوە هەیە:

خوای بەرز و مەزن (سبحانه وتعالـى) مووسا و هاڕوونی برای عليهما السلام كردە پێغەمبەر و ڕەوانەی لای فیرعەونی میصری كردن كە هەتا بلێی بابایەكی خۆ بەزلگر و ملهوڕ بوو وە گەیشـــتبۆ حەددێك كە ئیدیعای پەروەردگاریّتی بەسەر خەڵكی میصردا دەكرد و دەیگوت دەبێ تەنها من بپەرستن و قبووڵ ناكەم بێجگە لە خۆم پەرستراوێكی دیكەتان هەبێ!

ئینجا ســـەربارەش ستەم و زۆرێكی بێ ئەندازەی لە خەڵكی میصر بە گشتی و گەلی (بەنی ئیسرائیل) بە تایبەتی دەكرد، ئەمانەش چەند ئایەتێك كە ئاماژە بە ملهووڕیی و لە خوا یاخووبوون و خۆ بە زلگـــــریی و جەورو ستەمی فیرعەون دەكەن:

*.﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلاَ فِي الأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنْ الْمُفْسِدِينَ ﴾(306) .

*.﴿ هَلْ أتَـــاكَ حَدِيثُ مُوسَى (15) إِذْ نَادَاهُ رَبُّهُ بِالْوَادِي الْمُقَدَّسِ طُوًى (16) اذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى ﴾(307).

*.﴿ فَكَذَّبَ وَعَصَى(21)ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَى(22)فَحَشَرَ فَنَادَى(23)فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمْ الأَعْلَى ﴾ (308).

(306) القصص (4) .

(307) النازعات (15، 16، 17) .

(308) النازعات (21الى 24) .

*.﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَاأَيُّهَا الْمَلاَ مَا عَلِمْتُ لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرِي ﴾(309).

*.(قَالَ لَئِنْ اتَّخَذْتَ إِلَهًا غَيْرِي لأَجْعَلَنَّكَ مِنْ الْمَسْجُونِينَ)(310).

جا کاتێك مووسا و هاڕوونی برای سەلامی خوایان لــێ بێ چــوونە لای فیــرعەون و پەیامی خوای پەروەردگــاریان پێڕاگەیاند، پرسیاری لە مووسا کرد و گوتی:

﴿ فَمَنْ رَبُّكُمَا يَامُوسَى ﴾(311) ئەی مووسا ئەدی پەروەردگاری ئێوە- ئەگەر من نەبم - کێیــە ؟!

مووساش سەلامی خوای لــێ بێ فەرمووی:

﴿ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى ﴾(312)، پەروەردگارمان ئەو کەسەیە کە بوون (وجود)ی بە هەموو شـــتێك بەخشیوە و پاشــان ڕێنماییشی کردوە - واتە ڕێوشوێنی بەڕێوە چوونی بۆ دیاری کردوە -.

هەڵبەتە ئەم بەڵگەیەی مووسا ﷺ کە ئاماژە دەکات بە هەردووك(313) یاسای ژێربێژێیــانەی: (السببيّة)و(النظام)، کە دەڵێن: هیچ پەیدابوونێك بێ پەیداکەر نابێ (لكل حادث مُحْدِث)، وە هەموو ڕێك وپێکییەك ڕێکخەرێکی

---

(309) القصص (38) .

(310) الشعراء (29) .

(311) طــه (49) .

(312) طــه (51) .

(313) لە هەر کام لە کتێبی (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) و (خواناسیی ، ئایین، ئیمان)دا لەو دوو یاسایە توێژراونەوە. هەروەها لە بەرگی دووەمی ئەم زنجیرە درەسەش دا تیشکمان خستۆتە سەریان.

پێویستە (لكل نظام مُنَظِّم) ، وەڵامێکی ددان شکێن و بەهێزی پرسیارەکەی فیرعەونە، بەڵام ئایا فیرعەون گوێ بۆ بەڵگە و دەلیل دەگرێ؟! نەخێر، بەڵکو پاش بەڵگە هێنانەوەی ئارام و هێمنانەی مووسا ﷺ و دوای ئەوەی دەمی دەبێتە تەڵەی تەقیو پەنا دەباتە بەر هەڕەشە و گوڕەشە و تۆقاندن و زیندانی کردن:

﴿ قَالَ لَئِنْ اتَّخَذْتَ إِلَهًا غَيْرِي لأَجْعَلَنَّكَ مِنْ الْمَسْجُونِينَ ﴾[214] واتە: ئەگەر بێجگە لە من پەرستراوێکی دیکە بگری ڕەگەڵ گیراوانت دەخەم !

ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی دیکەشەوە فیرعەون بۆ ئیقناع کردنی خەڵکی میصرِ و ڕازی کردنیان بە مانەوە لە ژێر نیری ستەم و زۆر و چەوسێنرانەوەدا، مۆڵك و ماڵ و سامان و كۆشك و تەلاری خۆییان پێشان دەدا و دەڵێ:

﴿ وَنَادَى فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِ قَالَ يَاقَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ وَهَذِهِ الأَنْهَارُ تَجْرِي مِنْ تَحْتِي أَفَلاَ تُبْصِرُونَ(51)أَمْ أَنَا خَيْرٌ مِنْ هَذَا الَّذِي هُوَ مَهِينٌ وَلاَ يَكَادُ يُبِينُ !.. ﴾[215] هەروەها لە لایەکی دیکەی سێیەمەوە چەکی چەواشەکاریی و فرت و فێڵ و تەڵەکە بازیی بەکاردێنێ و لە بەرانبەر بەڵگە بەهێز و موعجیزە ڕوون و بێ چەند و چوونەکانی مووسادا فەرمان بە (هامان)ی وەزیری دەکات کە بینایەکی بڵێندی هەور ڕووشێنی بۆ دروست بکات تاکو لەوێوە سەیری ئاسمان بکات داخۆ ڕاستە مووسا ﷺ جگە لە فیرعەون پەروەردگارێکی دیکەی هەیە:

---

(214) الشعراء (29) .

(215) الزخرف (51، 52) .

**﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَاهَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحًا لَعَلِّي أَبْلُغُ الأَسْبَابَ(36)أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لأَظُنُّهُ كَاذِبًا ﴾**[316] .

بەڵام ئايا هيچ كام لەو سێ چەكانەی فيرعەون و بەهەر سێكيشيانەوە كە سێ كوچكەی حوكمی هەر تاغووتێك پێك دێنن واتە: دەستەڵات و سامان و چەواشەكاريی، يان بە زاراوەی دكتۆر عەلی شەريعەتی: (زۆر و زێڕ و تەزوير) دەتوانن، چۆك بە ئينسانی مسوڵمان دابدەن؟! نەخێر، جا با بۆ زانينی ئەو ڕاستييەش سەرنجی هەڵوێستی ئەو جادووگەرانە بدەين كە سەرەتا فيرعەون وەك گەلە كۆمەكی كردن لە دژی مووسا ﷺ خڕی كردبوونەوە بۆ ئەوەی بە خەياڵی خاوی خۆی موعجيزە و بەڵگەی ڕوون و ئاشـــكرای مووسا ﷺ هەڵبوەشـــێنێتەوە، بەڵام سەرەنجام فێڵ و تەڵەكەی فيرعەون بەسەر خۆی دا شكاوەتەوە و جادووگەرەكانی پاش ديتنی هەق و بێ ئاشـــنا بوونی ســـەرجەم ئيمانيان هێناوە و بۆ خوای پەروەردگار چوونەتە سەجدە:

**﴿ فَلَمَّا جَاءَ السَّـــحَرَةُ قَالُوا لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لأَجْرًا إِنْ كُنَّا نَحْنُ الْغَالِبِينَ(41) قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَمِنْ الْمُقَرَّبِينَ(42)قَالَ لَهُمْ مُوسَى أَلْقُوا مَا أَنْتُمْ مُلْقُونَ (43) فَأَلْقَوْا حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُوا بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ الْغَالِبُونَ (44) فَأَلْقَى مُوسَى عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ (45) فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ(46)قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ(47)رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ(48) قَالَ آمَنتُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمْ الَّذِي عَلَّمَكُمْ السِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ لأَقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ مِنْ خِلاَفٍ وَلأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ (49) قَالُوا**

---

(316) غافـر (36، 37) .

لاَ ضَيْرَ إِنَّا إِلَى رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ (50) إِنَّا نَطْمَعُ أَنْ يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَايَانَا أَنْ كُنَّا أَوَّلَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾(317) .

واتە:

جا کاتێك جادووگەرەکان هاتن بە فیرعەونیان گوت: ئایا ئەگەر ئێمە زاڵ بووین - بەسەر مووسادا - کرێ و پاداشتمان دەبێ؟! گوتی: بەڵێ بەڵکو ئەگەر زاڵ بن ئێوە لەو کەسانە دەبن کە زۆر نزیك خراوە دەبن. مووسا بە جادووگەرەکانی فەرموو بیهاوێن ئەوەی کە دەتانەوێ بیهاوێن. ئەوانیش پەت و گۆچانەکانی خۆیان فڕێدا و گوتیان: سوێند بە عیززەتی فیرعەوون هەر ئێمە زاڵ دەبین. ئینجا مووسا گۆچانەکەی خۆی فڕێ داو یەکسەر هەموو ئەوەی کە بە جادوو و درۆ و دەلەسە خستبوویانە ڕوو، هەڵلووشی. وە یەکسەر جادووگەرەکان بە کڕنووش بردن خران. گوتیان: بڕوامان بە پەروەردگاری جیهانەکان هێنا. پەروەردگاری مووسا و هاروون. (فیرعەون) گوتی: ئەوە بۆچی بڕواتان پێ هێنا بەرلەوەی مۆڵەتتان بدەم. بێ گومان ئەو (مووسا) ئەو گەورەیەتانە کە فێری جادووی کردوون. جا دوایی دەزانن - چیتان پێ دەکەم - دەست و پێیەکانتان ڕاست وچەپ دەبڕم و هەمووانیشتان هەڵدەواسم. گوتیان: زیانی نیە چونکە ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. ئێمە ئومێدمان وایە کە پەروەردگارمان گوناهەکانمان بۆ ببۆشێ چونکە بووینە یەکەمینی بڕواداران.

---

(317) الشعراء (41 تا 51) .

وەك دەبینین لێرەش فیرعەون چەکی ســــێکوچکەی : (تەماع ، ترس ، چەواشە)ی لەگەڵ جادووگەرەکانی دا بەکارهێناوە بەڵام بەهۆی ئیمانەکەیانەوە ئەو چەکەیان پووچەڵ کردۆتەوە و هیچ جۆرە کاریگەرییەکی لەسەریان نەبووە:

سەرەتا فیرعەون پەنای بردۆتە بەر سەروەت و سامانەکەی و دوای ئەوەی جادووگەرەکان لــێی دەپرسن کە ئایا کرێ و پاداشتێکیان دەداتێ و خەڵاتیان دەکات ئەگەر بەسەر مووسادا زاڵ بوون؟ لە وەڵامیان دا دەڵێ: (نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذاً لَمِنْ الْمُقَرَّبِينَ) بەڵێ ، وە ئێوە ئەو کاتە لە زۆر وەنیزیکخراوان دەبن.

پاشان دوای ئەوەی جادووگەرەکان بەهۆی دیتنی موعجیزەو بەڵگە ڕوون و بێ چەند و چوونەکانی مووسا ﷺ لە کوفرو فیرعەون پەرستی هەڵگەڕانەوەو ڕوویان کردە ئیمان و خواپەرستی. فیرعەون چەکی دووەمی کە چەواشەکاریی و فریودانە بەکاردێنێ ودەڵێ: ﴿ إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمْ الَّذِي عَلَّمَكُمْ السِّحْرَ ﴾ بێ گومان مووسا ئەو مامۆســـــتایەتانە کە جادووی فێری ئێوە کردوە بۆیە بەسەرتان دا زاڵ بــــوو !

وە سەرەنجام پەنا دەباتە بەر چەکی سێیەم کە هەڕەشە و تۆقاندنە و دەڵێ: ﴿ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ مِنْ خِلَافٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ بێگومان دەست و پێیەکانتان ڕاست و چەپ دەبڕم و هەمووشتان هەڵدەواسم !

بەڵام ئایا ئەو چەکە ســـێکوچکەیە هیچ کاریگەرییــــەکی لەسەر جادووگەرەکان هەبوو دوای ئەوەی خوا (سبحانە وتعالــی) لە نیعمەتی ئیمان بەهرەمەندی کردن؟! نەخێر چونکە ئەوەتا پڕ بە زاریان فیرعەون بێ منەت دەکەن و پێی دەڵێن:

﴿ لاَ ضَيْرَ إِنَّا إِلَى رَبِّنَا مُنْقَلِبُونَ ﴾ هیچ زیانی نیە - واتە مردنـــمان بەو شـــێوەی کە هەڕەشەی پێ دەکەی لێمان - چونکە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە !

پاشان دەڵێن:﴿ إِنَّا نَطْمَعُ أَنْ يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَايَانَا أَنْ كُنَّا أَوَّلَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ ئێمە ئومێدمان وایە کە پەروەردگارمان لە گوناهەکانمان بمان بووریّ چونکە یەکەمینی بڕواداران بووین.

کەواتە:

ئەوەی بۆتە هۆکاری گوێنەدانی جادووگەرەکان بە هەڕەشـــە و گوڕەشە و پێشتریش تەماع و چەواشەکاریی فیرعەون و داروودەستەکەی بریتیی بووە لە:

1- ئیمانیان بە خوای پەروەردگار و گەڕانەوەیان بۆ لای.

2- ئومێد و هیوایان بە ڕەحمەت و بەخشش و پاداشتی خوا.

لە شـــــوێنێکی دیکەی قورئانیش دا خوای بەرز و مەزن ئاوا وەڵامی جادووگەرە ئیماندارەکان دەخاتە ڕوو:

﴿ قَالُوا لَنْ نُؤْثِرَكَ عَلَى مَا جَاءَنَا مِنْ الْبَيِّنَاتِ وَالَّذِي فَطَرَنَا فَاقْضِ مَا أَنْتَ قَاضٍ إِنَّمَا تَقْضِي هَذِهِ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا(72)إِنَّا آمَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَايَانَا وَمَا أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنْ السِّحْرِ وَاللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَى ﴾[318] .

واتە: گوتیان: تۆ - بە هەموو خەڵات و بەرات و هەڕەشـە و گوڕەشەوە - هەڵنابژێرین بەسەر ئەو زاتەدا کە ئێمەی هێناوەتە دی و ئەو بەڵگە ڕوونانەی کە دەیانبینین ، بۆیە هەر چیت لە دەست دێ درێغی مەکە چونکە هەرچی بیکەی هەر لە جوغزی ئەم ژیانە دنیاییەدایە. بێگومان ئێمە بڕوامان بە

(318) طه (72، 73) .

پەروەردگارمان هێنا تاکو لە هەڵەکانمان بمانبەخشێ وە لە جادووەکەی کە بە زۆر فێرت کردین و پێت کردین، دیارە خوا - و پاداشـــتەکەی - ش چاکترە و بەردەوام تریشە - لە دنیا و ئەوەی تێیدایە - .

جێی سەرنجیشە کە جادووگەرەکان پێش ئیمان هێنان زۆر نەفس نزمانە چاوەڕوانی دیاری و خەلاتی فیرعەونیان کردوە چونکە ئینسانی بێ ئیمان خۆی لە لا بچووك وسووك و دنیا وتەماعیشـــی لە لا بەرز و گەورەیە ! بەلاَم دوای ئەوەی ئیمانیان هێناوە نەك هەر گوێیان نەداوەتە تەماع و دنیا و خەلات و بەراتی فیرعەون بگرە لە مەرگ و مردنیش بێ منەت بووون !

بەڵێ پێش ئیمانیـــان گوتوویانە: ﴿ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا..؟! ﴾ بەلاَم دوایی کە لە نیعمەتی ئیمان بەهرەمەند بوون و لە سایەی دا عیززەتمەنـــد بووون گوتوویانە: ﴿ فَاقْضِ مَا أَنْتَ قَاضٍ..﴾ چیت پێدەکرێ بیکە !!

کەواتە:

ئێستا بۆمان دەرکەوت وزانیمان چۆن ئیمان ئینسانی مسوڵمان و کۆمەڵی مسوڵمان زاڵ دەکات بەسەر سێکوچکەی شوومی تاغووتەکـــان دا کە فیرعەونایەتی خۆیانی لەسەر بنیات دەنێن: دەستەلاَت و ســـامان و فێڵ و چەواشەکاریی !

وصلی الله تعالی علی سیدنا محمد و اله اجمعین.

# کاریگەریی ئیمان و عەقیدە لە پێگەیاندن و بنیات نانی کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی ساغ و تۆکمەدا

**خاڵەکانی:**
1، 2، 3، 4، 5

**بەڕێزان !**

ئێمە لە دوو دەرسی پێشوودا گرنگیی و کاریگەریی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی مان لە ژیانی ئینسان دا وەك تاك (فرد) خستە ڕوو، خوا یار بێ لەم

دوو دەرسەی کە دێین باسی کاریگەریی ئیمان و عەقیدە دەکەین لە ژیانی کۆمەڵ و کۆمەڵگای[319] مسوڵمان دا.

جا بۆ ئەو مەبەستەش یەکێك لە سوورەتە بە پێزەکانی کتێبی سەرسووڕهێنەری خوا (قورئان)مان هەڵبژاردوە کە سوورەتی (الحجرات) ە و هەڵساوین بە هەڵهێنجانی یازدە (11) بنچینەی گەورە و گرنگ لێی، کە پێم وایە هەر کۆمەڵ وکۆمەڵگایەك لەسەر ئەو یازدە بنچینەیە دابمەزرێ و پەروەردە بکرێ کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی ساغ و سەلیم و تۆکمە و دامەزراو دەبێ.

بۆیەش هەڵهێنجرانی ئەو یازدە بنچینەیەم لە سوورەتی(الحجرات) کردۆتە بەڵگەی کاریگەریی ئیمان و عەقیدە لە: ﴿پێگەیاندن و بنیات نانی کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی ساغ و تۆکمە﴾دا چونکە ئەم سوورەتە باسی کۆمەڵگای ئیسلامیی دەکات و چواردە (14) جارانیش وشەی (إيمان)ی بە هەموو شێوە و صیغەکانی بەکارهێنانەوە تێدا دووبارە بۆتەوە.

ئێستاش با بەر لەوەی بچینە سەر خستنە ڕووی ئەو یازدە بنچینەیەی کە ئەم سوورەتە گرتوونیە خۆی و بە ڕوونی دەلالەتیان لەسەر دەکات، چاوێکی گشتی پێدا بخشێنین:

سوورەتی (الحجرات) یەکێکە لە سوورەتە (مَدَنّي)یەکان - واتە ئەو سوورەتانەی کە دوای هیجرەت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتوونە خوارێ - وە ژمارەی ئایەتەکانی هەژدە (18)یە.

---

(319) مەبەستمان لە (کۆمەڵی مسوڵمانان) بوونی مسوڵمانە بەر لە هاتنە دی قەوارە سیاسیی و، کۆمەڵگای مسوڵمانیش بریتی یە لە بوونی مسوڵمانان وەك قەوارەی سیاسیی و دەستەڵاتی شەرعیی.

وە لەم سوورەتەدا:

(27) جار وشەی (**الله**) کە ناوی عەلەمی خوای پەروەردگارە لە زمانی عارەبی دا هاتوە. وە (14) جاران وشـەی (**إیمان**) بە هەموو صیغەکانی یەوە دووبارە بۆتەوە. وە (6) جاران ناوی پێغەمبەری خوا (مُحَمَّدٌ) ﷺ بە وشـەی: (رسول الله)و(النبـي)و(رسوله). وە(5) کەڕەتانیش وشەی (تقوی) بە هەموو شێوە بەکارهێنانەکانی یەوە هاتوە.

دیارە هەر لە بەراییشەوە لە کۆی ئەو سەرژمێریی یانە ئەوەمان دەستگیر دەبێ کە لەم سوورەتەدا ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر جەختی لەسەر کراوە و بایەخ و گرنگیی پێدراوە بریتی یە لە:

1- پەیوەست کردنی کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسولمان بە خوای بەرزو مەزنەوەو ئیمان پێهێنانی و بەندایەتی و تاعەت بۆ ئەنجام دانی.

2- شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمانبەریی کردنی و ڕێزو حورمەت لێگرتنی.

3- پارێزکار (متّقي) بوون وهەرچی زیاتر وچاکتر خۆ ڕازاندنەوە بە خەسڵەتی بەرزی پارێزکاریی (تقوی) کە هەرچی خێر و چاکەیە لە دنیا و دوارۆژدا بۆ خاوەنەکەی دەستەبەر دەکات.

وشەی (الحجــــرات)یش کۆی (حجـرة)یە کە بە مانای ژوور دێ و هۆی ناونرانی ئەم ســــوورەتەش بەو ناوەوە ئەوەیە کە ئەم وشەیە لەم سوورەتەدا هاتووە ، مەبەستیش لە ژوورەکان (الحجــرات) ئەو ژوور و هۆدانەن کە کاتی خۆی پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرە بەرێزەکانی خۆی (أمهات المؤمنین) خوا لــێیان ڕازی بێ تێدا نیشتەجێ کردبوو، شایانی باسیشە ئەو شوێنەی ئێستا گۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ و گۆڕی هەر کام لە ئەبووبەکــر و عومەری خوا

لـێیان ڕازی بێ لێیە ژوورەکەی دایکمان (عائشـــة) یە خوا لـێی ڕازی بێ ، جا دیارە ژوورەکانی دیکەش کە هاوسەرەکانی دیکەی پێغەمبەری خوای تێدا نیشتەجێ بووون هەر بە تەنیشــت ئەو ژوورەی (عائشة) وە بووون بەڵام دوایی خراونەتە سەر مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی فراوان کردنی دا.

ئێستا با بزانین ئەو یازدە بنچینە(قاعدة)یەی کە پێویستن بۆ پێگەیاندن و بنیات نانی کۆمەڵ وکۆمەڵگای ئیسلامیی چین و چۆن چۆنی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە دەلالەتیان لەسەر دەکەن ؟!

((**بنچینەی یەکەم**)):

کۆمەڵ وکۆمەڵگـــــــای بڕوادار بە بێ مۆڵەت و فەرمانی شەرع هیچ هەنگاوێك بەرەو هیچ کارێك نانێ:

وەك خوای پەروەردگار لە ئایەتی یەکەمی ئەم سوورەتەدا فەرمووویەتی :

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ .

واتە: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە.

ئەی ئەوانەی ئیمانتـــان هێنـــاوە هیچ شـــتێك پێش دەســـتی خوا و پێغەمبەرەکەی مەخەن وە پارێز لە خوا بکەن، بێ گومان خوا بیسەر و زانایە.

بەڵێ بەڕێزان، (یەکەمین بنچینە)ی کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی ئیسلامیی لەم ئایەتی یەکەمەوە هەڵدەهێنجرێ، کە بانگی بڕواداران بە ناوونیشانی (إیمان) ەوە دەکات و دەیاندوێنێ و ئەو بانگ کردنەش یەکەمین ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾یە کە لەم سوورەتەدا دێت (4) چوار جاری دیکەش دووبارە دەبێتەوە، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە کۆمەڵ و کۆمەڵگا هەتا خاوەن ئیمان نەبێ

شایستەی ئەو دوینران و قســـــە لەگەڵ کرانەی خوای بەرز نیەو ئەرك و فەرمانەکانی خوای بۆ بەڕێوە ناچن!

جا یەکەمین فەرمانێك کە خوای پەروەردگار ئاراستەی بڕوادارانی دەکات ئەوەیە کە دەفەرموێ:﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە هیچ شتێك پێش دەستی خوا و پێغەمبەرەکەی مەخەن، واتە: هیچ قسەیەك مەکەن و هیچ بڕیارێك مەدەن و هیچ کردەوەیەك مەکەن و هیچ هەڵوێستێك مەنوێنن، تاکو ئیزنی شەرعتان پێ نەبێ و تا نەزانن لە قورئانی خوادا، وە لە ســــوونەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ حوکم و بڕیاری چی یە، وەك لە ســــوونەت دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ، (معاذ)ی کوڕی (جبل) خوا لــێی ڕازی بێ بۆ یەمەن دەنێرێ و پێی دەفەرموێ : چۆن حوکم دەکەی؟! ئەویش لە وەڵام دا دەڵێ: بە کتێبی خوا (قورئان) ، ئینجا پێی دەفەرموێ: ئەدی ئەگەر لە قورئانیدا حوکمەکەت دەست نەکەوت؟

(معاذ)یش لە وەڵام دا دەڵێ: ئەو کاتە بە پێی سوننەتی پێغەمبەر حوکم دەکەم، ئەویش دەفەرموێ : ئەدی ئەگەر لەویش دا حوکمی ئەو مەسەلەیەت چنگ نەکەوت چی دەکەی؟! ئەویش دەڵێ: (قال أجتهد رأيي ولا آلو) خۆم کۆشش دەکەم و بیر دەکەمەوەو کەمتەرخەمیی ناکــــەم هەوڵ دەدەم حـــەق بپێکم و، حوکمی ئەو مەسەلەیە بدەم، پێغەمبەر ﷺ یش فەرمــــووی: ﴿ الحمد لله الذي وفق رسولَ رسول الله لِما يَرضي الله ورسوله ﴾[320]

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە نێردراوی پێغەمبەری خوای ڕێڕوونیی کردوە بۆ شتێك کە جێگای ڕەزامەندیی خوا و پێغەمبەری خوا بێت.

(320) صححه الالباني رحمه الله.

کەواتە: هەتا قورئان وسوننەت لەوێ بن مسولمان بۆیان نیە هیچ بڕیار و هەلوێست و هەلس وکەوت و ڕەفتارێك ئەنجام بدەن بە بێ ئیزنی وان.

بەلێ ئەوە یەکەمین تایبەتمەندیی و یەکەمین بنچینەی هەر کۆمەلُ و کۆمەلگایەکی ئیسلامی یە، مەبەستیشم لە (کۆمەلی ئیسلامی) بزووتنەوەو ڕێکخراوە ئیسلامی یەکانن و کۆمەلگاش ئەوەیە کە دەبێتە کیان و قەوارەی سیاسی و حوکم و دەستەلاتی بە دەست دەبێ.

چونکە مسولمانان چ لە حالەتی کۆمەلُ بوون و، چ لە حالەتی کۆمەلگا بوون دا دەبێ پابەند بن بە بڕیارەکانی شەرعەوە کە لە قورئان و سوننەت دا خۆیان دەنوێنن.

شایانی باسیشە کە ڕستەی:﴿ لاَ تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ﴾ ئەواش خوێنراوەتەوە: ﴿ لاَ تَقَدَّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ﴾ کە ئەو کاتە مانایەکەی ئاوای لێ دێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە وە پێش خوا (سبحانه وتعالى) و پێغەمبەری خوا مەکەون!!(321) کەواتە ئەو کەسەی قسەیەك دەکات و ڕەفتارێك و ئاکارێك و هەلوێستێك دەنوێنێ بە بێ پرسی قورئان و سوننەت، وەك ئەوە وایە کە پێغەمبەر ﷺ لە ژیانی دا بێت و وە پێشی کەوتبێتەوە، کە بێ گومان ئەوە هەرگیز لە مسولمان ناوەشێتەوە ڕەفتارێکی زۆر ناشیرین و نا ماقوولە، بەلکو دەبێ مسولمان هەمیشە بە دوای خوا (سبحانه وتعالى) و پێغەمبەری خواوە بێت و بە دوای قورئان و سوننەت و شەریعەتی خواوە بێت، نەك پێشیان بکەوێتەوە و خۆ بەسەرانە هەلس وکەوت بکات، چونکە ئەگەر

(321) کەواتە: بابای پرس نەکەر بە قورئان و سوننەت بۆ قسە و بڕیار و ڕەفتار وەك کەسێك وایە کە لە کاتی ڕۆیشتن دا پێش پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتبێتەوە.

وا ڕەفتار بکات مانای وایە هیچ ڕێز و حورمەتی لێ نەگرتوون و خۆی لەوان بە شارەزاتر و دەمڕاستر زانیوە.

ئینجا دەفەرموێ : ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ پارێز لە خوا بکەن بێ گومان خوا بیسەرەو زانایە، واتە: خوا هەموو شتێك دەبیستێ و دەزانێ چی دەڵێن، وە زاناشە و دەزانێ چی دەکەن و چی یان لە دڵ دایە، کەواتە: ئەی بڕوادارینە ئەگەر دەتانەوێ بە مسوڵمان و ئیماندار دابنرێن هیچ قسەیەك مەکەن و هیچ نیەتێکتان لە دڵ دا نەبێ و هیچ ڕەفتارێکتان لێ نەپشکوێتەوە کە پێچەوانەی قورئانی خواو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بێ.

(( **بنچینەی دووەم** )):

ڕێز و حورمەت گرتن لە پێغەمبەر ﷺ ، وە خۆ پاراستن لە هەر جۆرە بێ ڕێزی یەك لە خزمەتی دا.

بێ گومان ئەم حوکمە کە بنچینەی دووەمی پێکهاتنی کۆمەڵ و کۆمەڵگای ئیسلامیی پێك دەهێنێ، جێ نشینانی پێغەمبەریش ﷺ وە زانا و پێشەوایان و میراتگرانی ڕەسەنیشی دەگرێتەوە، بەڵام دیارە هەر کەسە بە پێی خۆی، چونکە بەو ئەندازەیەی کە ڕێز لە پێغەمبەر ﷺ دەگیرێ لە کەسی دیکە ناگیرێ، بەڵام هەر کەسێك کە لە جێی پێغەمبەر ﷺ بێ ج وەك چوار جێ نشینە سەر ڕاستەکان یان هەر زاناو پێشەوایەك کە دینی پێغەمبەر ﷺ بە خەڵکی ڕادەگەیەنێ و بە ڕێبازی ئەودا دەڕوات ئەویش دەبێ بە ئەندازەی خۆی ئەو ڕێز و ئەدەبانەی لەگەڵدا بەکاربهێنرێن، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ دا هاتووە: (( **ومن اطاع الامير فقد اطاعني و من عصى الامير فقد عصاني**)) رواه البخاري.

ئەم بنچینەیەش لە ئایەتەکانی (2تا 6)دا خراوەتە ڕوو، کە هەموویان ئامۆژگـــاری و ئاڕاستەن لە لایەن خوای پەروەردگارەوە بۆ ئەهلی ئیمان کە پێویستە چۆن چۆنی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ هەڵس و کەوت بکەن.

سەرەتا خوای پاك و تاك (سبحانە وتعالــی) فەرموویەتی: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ ﴾واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە دەنگی خۆتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ بەرز مەکـەنەوە، ﴿ وَلاَ تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ ﴾ وە لە کاتی دواندن و قســـە کردن لەگـــەڵی دا دەنگ هەڵ مەهێنن و بەرز مەکەنەوە وەك هەندێکتان لەگەڵ هەندێکتان دا کە قســـــــە دەکەن دەنگ بەرز دەکەنەوە، واتە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ وا مەبن، بۆچی؟! ﴿ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لاَ تَشْعُرُونَ ﴾ نەوەك کردەوەکانتان هەڵبوەشێنەوە بە هۆی ئەو دەنگ هەڵهێنـــــان و بەرز کردنەوەیە بەسەر دەنگی پێغەمبەردا بێ ئەوەی هەست بە هەڵوەشانەوەی کردەوەکانتـــــان بکەن، کەواتە: بێ ئەدەبی لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ تەنانەت بە دەنگ بەسەردا بەرزکردنەوەشی دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی کردەوە چاکەکانی ئینسانی مسوڵمان .

جا لێرەدا ئەم ئایەتە دوو واتای هەن، واتایەکی ئاشـــــکرا و دیار، وە واتایەکی شێرراوەو(ضمني)، یان بە زاراوی زانایانی: (أصول الفقه): (مفهوم النص) و (إشارة النص)، جا واتا ڕواڵەتیی و ئاشکرایەکەی ئەوەیە کە : ئەی بڕوادارینە!: دەنگ بەرز مەکەنەوە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ واتە لە کاتی دواندن و قســـە لەگەڵ دا کردنی دا.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەش ئەوە بوو کە ڕۆژێك (أبوبكر)و (عمر) خوا لـــێیان ڕازی بێ لە خزمـــــەت پێغەمبەردا بوون و وەفدێك هات بۆ

خزمەتی، (أبوبكر) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ڕام وایە (القعقاع بن معبد) دابنێی بە برا گەورەیان، (عمـــــر)یش گوتی: من ڕام وایە (الأقرع بن حابس) بێت، (أبوبكر) گوتی ئەی (عمر) دیارە هەر مەبەستت ئەوە بوو کە پێچەوانەی قسەی من قسە بکەی! ئەویش گوتی: نەخێر مەبەستم ئەوە نەبوو، ئیدی لەسەر ئەوە کەمێك مشت ومڕ ودەنگ بەرز کردنەوەیان بوو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ و ئەم ئایەتانە هاتنە خوار(322).

هەندێکیش دەڵێن: یەکێك لە هاوەڵان (أصحاب) بە ناوی (ثابت بن قیس بن شماس) دەنگی هەر لە خۆیەوە قەبە و بەرز بووە و دیـــــارە لە خزمەت پێغەمبەریش دا ﷺ هەر بەو دەنگە ئاساییەی خۆی قسەی کردوە، بۆیە ئەم ئایەتانە هاتوونە خوارێ تاکو ئەویش و غەیری ویش لە کاتـــــی دواندنی پێغەمبەردا ﷺ هێندە دەنگ هەڵنەهێنن(323).

کەواتە: واتا ڕواڵەتیی و ئاشکرایەکەی ئایەتەکە بە مسۆگەری مەبەستە، بەڵام لە ژێر ئەویشەوە ئەوەش دەگەیەنێ: ئەی مسوڵمان! تۆ هیچ حوکم و بڕیارێك مەدە و زاڵی مەکە بەسەر حوکم و بڕیاری شەرع دا و هیچ بۆچوون و ڕایەکی خۆت زاڵ مەکە بەسەر قورئان و سووننەت دا، چونکە ئەوە وەك ئەوە وایە کە دەنگ بەسەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ بەرز بکەیەوە، وە لە ڕاستی دا ئەو ماناو واتایەش- کە مانا شێرراوەو پەنهانەکەیەتی- زۆر جوان و بەجێیە، چونکە بێگومان زۆر پێچـەوانەی ئەدەب و ڕێزە کە بگوترێ : پێغەمبەر ﷺ لە بارەی فـــلان شتەوە ئاوای فەرمووە، کەچی تۆ بڵێی: بەڵام من ئاوای لـــێ

(322) رواه البخاري و غيره.

(323) أخرجـه الطبري عن قتادة : وعن محمد بن ثابت بن قيس بن شماس: في (أسباب النزول) للسيوطي.

حاڵیم! - واتە شتێك بلــێی لە بارەی ئەو مەسەلەیەوە كە دژ و پێچەوانەی قســەی پێغەمبەر بێت - چونكە ئەوەی پێشی دەنگ هەڵێنان و دەنگ بەرز كردنەوەی ڕواڵەتی و ماددی یە و ئەمەشیان دەنگ هـــــەلێنان و دەنگ بەرز كردنەوەی پەنهان و مەعنەوییە و دیارە هەردووكیشیان بێ جێ و حەرامن.

ئینجا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ أُولَئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَى لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴾ توێژەرەوان (مفسرون) گوتوویانە: دوای ئەوەی ئایەتی پێشتر هاتە خوارێ، (ابوبكر) و (عمر) خوا لــێیان ڕازی بێ كە زۆر پابەند بوون بە قورئان و ســـوننەتەوە و دیارە دەنگ بەرزكردنەوەشیان هەر بەشێوەیەكی ئاسایی بووە، نەك مەبەستیان ئەوە بووبێ دڵی پێغەمبەر ﷺ ئازار بدەن، جا دوای ئەوەی ئایەتەكەی پێشوو هاتە خوارێ ئەوەندە بە دەنگی نزم و (كپ) لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ قسەیان دەكرد، جاری وا هەبوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ئەوە چیتـــــان گوت؟! دەبووایە قسەكەیان بۆ دووبارە كردبایەوە، جا بەو بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ كە زۆر مەدحی (ابوبكر) و (عمر)ی تێدایە و دەفەرموێ : ئەوانەی كە دەنگی خۆیان لە لای پێغەمبەری خوا كپ و نزم دەكەنەوە، ئەوانە كەسانێكن كە خوا دڵی پاڵاوتوون بۆ پارێزكاریی (تقوی)، وشەی (إمتحان) واتـــــە، تاقی كردنەوە و لێرەدا مەبەست پێی پاك كردنەوەو لە بێژینگ دان و پاڵاوتنە، واتە خوا دڵی پاك كردوونەوە بۆ ئەوەی هیچ سەرپێچییەكی تێدا نەمێنێ، تاكو باش تەقوای خوا بكەن، چونكە بە ئەندازەی هەبوونی ڕەگ و ڕیشەی سەرپێچی یەكانی شەرع لە دڵ و دەروون دا تەقوای كەمتر تێدا جێگیر دەبێ وە بە پێچەوانەوەوە هەتا دڵ و دەروون پاكتـــر بێتەوە باشتر تەقوای تێدا جێگیر

دەبێ، جا دەفەرموێ : ئەوانەی بەو شێوەیەن لێ بووردن و پاداشتێکی گەورە و مەزنیان هەیە.

پاشان دێتە سەر باسی ئەدەبێکی دیکە: ئەوەی پێشێ دەربارەی قسە کردن بوو لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەمەشیان دەربارەی بانگ کردنی پێغەمبەرە ﷺ، توێژەرەوان لە بارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا گوتوویانە: ڕۆژێك [324] کۆمەڵێك لە عەرەبە خێڵەکی یەکان هاتنەماڵی پێغەمبەر ﷺ ، ئەویش لە ژوورەوە بوو، لە دوورەوە بانگیان کرد: (یا مُحَمَّد أخرجْ إلینا) ئەی محمد وەرە دەرێ بۆ لامان ئیشمان پێتە، ئاوا بە شێوەیەکی زۆر نەزانانە، دیارە پێغەمبەریش پێی ناخۆش بوو، بەڵام پێغەمبەری خوا کە خاوەنی بەرزترین ڕەوشت بووە وەسەر خۆی ناهێنێ و هیچ نافەرموێ ، چونکە شەرمی زۆر بووە وەك خوای پەروەردگار دەربارەی دەفەرموێ:﴿ **يستحي منكم** ﴾، بەڵام خوا شەرم لە هەق ناکات، مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا زۆر جار شتێکی پێ ناخۆش بووە بەڵام دەنگی نەکردوە و چاوپۆشی کردوە جا لە بەرانبەر ئەو هەڵوێستەی عەرەبە خێڵەکی یەکان دا ئەم دوو ئایەتە هاتنە خوار کە دەفەرموێ : ﴿ **إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِنْ وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ** ﴾ واتە: بێگومان ئەوانەی کە لە پشت ژوورەکانەوە بانگی تۆ دەکەن زۆربەیان نەفام و نەزانن، ﴿ **وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا حَتَّى تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَهُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ** ﴾ وە ئەگەر ئارامیان گرتبایە تا دەچووی بۆ لایان

---

(324) أخرجه الطبراني وابو يعلي عن زيد بن ارقم واخرجه كل من احمد و الطبري عن الاقرع بن حابس، كما في (اسباب النزول) للسيوطي.

ئەوە بۆ ئەوان باشتر بوو، بەڵام هەر چۆنێك بێت خوا لـێ بوردە و بەخشندەیە و با جارێکی دیکە دووبارەی نەکەنەوە.

دیارە ئەم ئەدەبانە وەك پێشتر باسکرا مەبەست پێیان ئەوەیە کە پێویستە مسوڵمانان لە خزمەت پێغەمبەردا ئاوا ڕەفتار بکەن، جا ئەوانەی ئەو کات لە خزمەتی دا بوون و ژیاون، بۆ ئەوان چەمکە ئاشکرا و ڕواڵەتی یەکەی زیاتر مەبەست بووە، بەڵام بە پێی چەمکە مەعنەویی و شێرراوەکەی دەبێ ئێستاش هیچ کەس دەنگی خۆی و ڕاو بیرو بۆچوونەکانی خۆی یان غەیری خۆی بە هیچ شێوەیەك بەسەر شەرع دا بەرز نەکاتەوە و ڕەسەری نەخات، هەروەها چەمکی ڕواڵەتیی ئایەتەکە بوارێکی دیکەی جێبەجێ کردنیشی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە بابای مسوڵمان ئێستاش کاتێك دەچێتە شاری مەدینەو سەردانی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ دەکات و سـەلام لە گۆڕی پڕ نووری دەکات نابێ زۆر دەنگی بەرز بکاتەوەو زانایان دەڵێن: کە بۆ پاڕانەوە لە خواش لە نزیکی گۆڕەکە دەبێ بە دەنگی نزم بێ و پشتیشی لە گۆڕەکە بێت و ڕووی لە قیبلە بێت.

جا وەك پێشتر گوتمان: هەرچەنـدە ئەم ئایەتانە دەربارەی ئـەدەب و ڕێز نواندن لەگەڵ پێغەمبـەردا هاتوونە خوارێ بەڵام جێ نشـینانی پێغەمبەریش ﷺ دەبێ ئەو ڕێز و ئەدەبەیان لەگەڵ بەکار بهێنرێ هەر کەسە بە ئەندازە و بە پێی خۆی، واتە لەگەڵ زانا و مامۆستا و میراتگرانی ڕەسەنی پێغەمبەردا ﷺ ،وە لەگەڵ کەسێك دا کە بەرپرس وکاربەدەستێکی شەرعیی مسوڵمانانە، هەروەها هەر کەسـێکی دیکە کە لە سەرووی خۆتـەوەیە لە تەمەن و زانست دا جا مامۆستا بێ یان باب و دایك یان ڕیش سپی و پیاوی ماقووڵ و دیندار، هەر کەسە بە ئەندازەی خۆی.

## ((بنچینەی سێیەم))

هۆشیاریی و وردبینی و دوور بینی و نەکەوتنە ژێر کاریگەریی قسە و قاڵ و هەواڵی سەرچاوە نادیار و گومان لێکراوو پەلە نەکردن لە هەڵوێست وەرگرتن دا:

ئەم بنچینەیەش لە ئایەتی (6)ی ئەم سوورەتەدا دەدرەوشێتەوە، خوای پەروەردگار جارێکی دیکەش دەفەرموێ: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ ﴾ واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، ئەگەر گوناهبارێك (لە ڕێ دەرچوویەك) هەواڵێکی بۆ هێنان، هەواڵەکە زۆر باش ڕوون بکەنەوە، نەوەك بە نەزانیی و بێ ئاگایی زیان بە خەڵکێك بگەیەنن و هەڵوێستێکی هەڵەیان لە بەرانبەردا وەربگرن، دوایی لەسەر ئەوەی کردووتانە پەشێمان ببنەوە و پەنجەی پەشیمانی بگەزن.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەش ئەوە بوو کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵێکی نارد بۆ لای کۆمەڵێك کە زەکاتیان لێ وەربگرێ، جا لەبەر ئەوەی وەرگرتنی زەکاتەکە کەمێك لە کاتی دیاری کراوی ساڵانەی خۆی دا دوا کەوتبوو، سەرۆکی هۆزەکە لەگەڵ وەفدێکی نێو هۆزەکەی بەرێ دەکەون و دەیانەوێ بێن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە بزانن بۆچی زەکات کۆکەرەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەم ساڵ دواکەوت، ئیدی ئەوان بەرەو (مەدینە) دێن و ئەو هاوەڵەش کە پێغەمبەر ﷺ ناردوویەتی (ولید)ی کوڕی (عقبە) کاتێك بەرەو ئەوێ دەچێ لە دوورەوە وەفدەکە دەبینێ و وا دەزانێ ئەوانە هاتوون بۆ کوشتن و شەڕ لەگەڵدا کردنی، چونکە پێشتریش ناخۆشی یەکی شەخسی لەگەڵیان دا دەبێت،

یاخود هەر ویستوویەتی تووشی گرفتێکیان بکات. بۆیە یەکسەر کە دەیان بینێ بەرەو لای پێغەمبەر دەگەڕێتەوە و پێی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فلان کەس و هۆزەکەی زەکاتیان پێ نەدام و هاتبوون شەڕیشم لەگەڵ دا بکەن، لەبەر ئەوە گەڕامەوە، پێغەمبەریش ﷺ (خالد بن الولید) خوا لێی ڕازی بێ دەنێرێ و پێی دەفەرموێ: بچۆن ئەو مەسەلەیە ڕوون بکەوە و هەر پێنج کاتەکان گوێ هەڵبخە ئاخۆ بانگ دەڵێن: (خالد)یش لەگەڵ دەستەیەك دا دەچێت وگوێ هەڵدەخەن، سەیر دەکەن پێنج فەرزە بانگ دەڵێن، دوایی دەچێتە لایان و پێیان دەڵێ: ئەوە بۆچی ویستووتانە شەڕ لەگەڵ نوێنەری پێغەمبەردا بکەن؟! ئەوانیش دەڵێن: سوێند بەوەی کە (مُحَمَّد)ی بە ڕاست ناردووە ئێمە ئەو کابرایەمان هەر نەشبینیوە! جا خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ[325] تاکو مسوڵمانان پەند و عیبرەت لەم ڕووداوە وەربگرن و پێی فەرموون : ئەی بڕوادارینە !

ئەگەر کەسێکی لاڕێ (فاسق) هەواڵێکی بۆتان هێنا یەکسەر لێی وەرمەگرن، وشەی (فاسق) لێرەدا بەهەر کەسێك دەگوترێ کە لە شەرع دەرچووبێ، بەڵام بە یەکجاریی نا، بەڵکو بە شێوەیەکی کەم (جزئي)، واتە گوناهێکی کردبێ، چونکە مسوڵمان تەنیا بەوەی کە وەك ئەو کابرایەی کە باسمان کرد شتێکی نەبوو بۆ کەسێك هەڵبەستێ پێی (فاسق) دەبێ، لە ڕووی شەرعەوە کەسێك گوناهێکی گەورە بکات پێی (فاسق) دەبێت، ئینجا کە (فاسق) یش بوو بە کەڵکی شایەدیی نایەت و قسەشی لێ وەرناگیرێ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ وَلاَ تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُوْلَئِكَ هُمْ

(325) أخرجه احمد بسند جيد ، كما في (أسباب النزول) للسيوطي.

**الْفَاسِقُونَ ﴾**(326) واتە ئەوانەی بوختانی داوێن پیسی بە خەڵك دەکەن هەرگیز شایەدیی یان لــێ وەرمەگرن و ئا ئەوانەن لارێ بووان.

بۆیە زۆربەی هەرە زۆری زانا و پێشـــەوایانی ئیســـــلام دەڵێن: هاوەڵان (أصحاب)ی پێغەمبەر ﷺ هــــەموویان دادگەر (عادل)ن ، چونکە ئەگەر گوناهیشیان کردبێت - واتە گوناهی گەورە چونکە گوناهی گچکە ئینسانی پێ (فاسق) نابێ - ئەوە یان تۆبەیان لێکردوە و لــێی پەشــێمان بوونەتەوە، یان لەسەر ســزا دراون ، واتە: بۆیە هاوەڵان خوا لــێیان ڕازی بێ سەرجەم بە (عُدول) دادەنرێن، چونکە: یان گوناهـــی گەورەیان نەبووە ، یان بوویانە بەڵام پەشێمان بوونەوە، یان تۆڵەیان لێ وەرگیراوە و پاك بوونەتەوە.

دیارە هەر لەسەر ئەم بنەڕەتەشـــە کە هەر فەرمایشـــــتێك ئەوان لە پێغەمبەر ﷺ بیگێـــڕنەوە بێ سێ و دوو ئێمە بە ڕاســـتی دەزانین و لــێیان وەردەگرین لەبەرئەوەی بە (فاسق) دانانرێن تاکو ناچار بین ڕیوایەت و هەواڵەکانیان ساغ بکەینەوە.

**((بنچینەی چوارەم))**:

ڕەفتـــــار و هەڵس و کەوت نەکردنی میزاجی یانە و تاك ڕەوانە و پابەند بوون بە ئاڕاســــتەکان (توجهات)ی باڵاوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ و جێ نشینە ڕەسەنەکانی و میراتگرانی ڕاستەقینەی دەگرێتەوە، وە بە پێی شەرع جووڵانەوە و بە پێی ئیمان هەنگاو نان نەك بە پێی (طبع) و ئارەزوو !

ئەم بنچینەیەشمان لە ئایەتەکانی (7- 8) وەرگرت، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ **وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الأَمْرِ**

---

(326) النور(4) .

لَعَنِتُّمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ أُوْلَئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ(7)فَضْلاً مِنَ اللَّهِ وَنِعْمَةً وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ کە هەر دەربارەی ئەو ڕووداوەیە کە ئایەتی پێشووی لە بارەوە هات، دەفەرموێ : وە بزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو ئێوەدایە و ئێوە لە خزمەتی ئەودان، ئەگەر لە زۆر شت دا بە قسەی ئێوە بکات و بە پێی بۆچوونی ئێوە ڕەفتار بکا،بۆ خۆتان تووشی نارەحەتی دەبن و تووشی گرفتاری و دەردەسەری دەبن، بەڵام خوا ئیمانی لە دڵ دا خۆشەویست کردوون و ڕازاندوویەتەوە، ﴿کەواتە بە پێی داخوازی ئیمانەکەتان ڕەفتار بکەن، نەك بە پێی داخوازی ئارەزووتان، کە ڕقتان لە کەسێك بۆوە یەکسەر قسەیەکی بۆ هەڵبەستن، نەخێر، دەبێ هەست و نەست و هەڵوێستتان بە پێی ئیمان بێ﴾ (هەروەها خوای کاربەجێ) بێ بڕوایی و لە ڕێ دەرچوون و سەرپێچی لە دڵی ئێوەدا کردۆتە شتێکی ناخۆش و ڕق لێ هەستاو، ﴿کەواتە شتێك مەکەن کە وەك هی کافران یان فاسقان یان سەرپێچی کەران بێ و خۆتان لەوە بپارێزن کە بخرێنە ژێر ئەو جۆرە ناوونیشانانەوە وە بێگومان ئەوانەی بە پێی داخوازیی ئەو ئیمانەیان ڕەفتار دەکەن کە لە دڵیان دا خۆشەویست کراوە و ڕازێندراوەتەوە نەك بە پێی داخوازی یەکانی نەفسیان کە فەرمان بە بێ بڕوایی (کفر) و لاڕێ بوون (فسق) و سەرپێچی (عصیان) دەکات﴾ ئەوانە کەسانێکی سەر ڕاست و هیدایەت دراون و ئەوەش بەخشش و چاکەیەکە لە خواوە، وە بێ گومان خوا زانا و کاربەجێیە.

جا بەڕێزان ! دیارە کە کاتی خۆی هاوەڵانی بەڕێز خوا لێیان ڕازی بێ لە خزمەت پێغەمبەردا بوون ﷺ، ئێستاش ئێمە هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیان دا نیە و ئێمە بە شێوەی جەستەیی و ڕواڵەتی لە خزمەتی دا نین،

بەڵام بە شێوەی مەعنەویی هەر لە خزمەتی داین، لە خزمەتی ڕێ وشوێن و ڕێبازەکەی داین، کەواتە دەبێ ئێمەش وەك هاوەڵان پابەند بین بە ڕێبازی پێغەمبەرەوە، وە پابەند بین بە فەرمان و بڕیاری باڵامانەوە مادام بە پێی شەریعەت و ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بەسەرمان دا دەدرێ چونکە تەنیا فەرمانی پێغەمبەر بەرەهایی و بە بێ قەید و مەرج وەرگیراوە، ئەگەر نا فەرمانی هەر کەسێکی دیکە بە مەرجداریی (مقید)یەوە وەردەگیرێ، بە مەرجی ئەوە کە سەرپێچی تێدا نەبێ - واتە سەرپێچی لە شەریعەت ئەو شەریعەتەی کە لە قورئان و سوننەت دا بەرجەستەیە - چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **(انما الطاعة في المعروف)** [327] واتە: گوێ ڕایەڵی و بە قسە کردن تەنیا لە چاکە دایە، بەڵێ بێجگە لە فەرمانبەریی بۆ پێغەمبەر ﷺ تاعەت و گوێ ڕایەڵی بۆ هیچ کەسێکی دیکە بێ مەرج نیە کابرا بڵێ لە هەق و ناهەق دا هەر دەبێ بە قسەم بکەن !! ئەوە دەبێتە فرعەونایەتی، چونکە (فرعون) دەیگوت ﴿ **مَا أُرِيكُمْ إِلاَّ مَا أَرَى وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلاَّ سَبِيلَ الرَّشَادِ** ﴾[328] واتە: من تەنیا ڕای خۆمتان پێ دەڵێم، هەر چی یەك منیش پێتان بڵێم هەمووی هەر ڕاستە!! نەخێر هیچ کەسێك بۆی نیە وا بڵێ بەڵکو دەبێ بڵێ: بۆچوون و ڕای من یەکێکە لە بۆچوون و ڕایەکان وە ڕای منیش مەرج نیە هەر ڕاست بێ، وەك ئیمام شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەو بارەوە قسەیەکی جوانی هەیە کە دەڵێ (رأيي صواب يحتمل الخطأ و رأي غيري خطأ يحتمل الصواب) واتە: (ڕای خۆم پێ ڕاستە و دەشگونجێ هەڵە بێ،

---

(327) رواه البخاري هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق) رواه اصحاب السنن.

(328) غـافر (29) .

وە ڕای بەرانبەرەکەم پێ هەڵەیە و دەشگونجێ ڕاست بێ)، بەڵام تۆ بڵێی : ڕای من ڕاستە و ناشگونجێ هەڵە بێ، وە ڕای بەرانبەرەکەشم هەڵەیە و ناشگونجێ ڕاست بێ، ئەوە سەری لە فرعەونایەتی یەوە دەردەچێ.

بەڵێ، کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان دەبێ پابەند بێ بە ڕێبازی خوا و پێغەمبەرەوە و بە ئاڕاستە و فەرمانی باڵاوە، بە مەرجێك ئەو ئاڕاستە و فەرمانە پێچەوانەی شەرع نەبێ، نەك هەر کەسە بە میزاجی خۆی تاك ڕەوانە بەڕێوە بچێ و کەس بە (ڕبە)ی کەس نەپێوێ و کەس لە مەڕی کەس نەخێوێ و هەر کەسە بەڕێی خۆی دا بڕوا !!، چونکە هەرگیز کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان ئاوا دروست نابێ وە ئاواش بەڕێوە ناچێ، تۆ بڵێی من گوێ گرتن (سمع) و بە قسە کردن (طاعة)م هەیە بەڵام لەو شتانەدا کە بۆ خۆم پێم خۆشە !، نەخێر بەڵکو گوێ گرتن و بە قسە کردن دەبێ لە هەموو حاڵان دا بێت وەك لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: ((**علیك بالسمع و الطاعة في عسرك و یسرك و منشطك و مکرهك**))[329] واتە: گوێ گر و فەرمانبەر بە بۆ سەرەوەی خۆت لە کاتی تەنگانە و سەغەڵەتیی و خۆشی و فەرحانیی دا، وە لە کاتێك دا کە بۆ خۆت پێت خۆشە و لە کاتێکیش دا کە پێت ناخۆشە، چونکە جاری وا هەیە فەرمانێکت پێ دەکرێ بەڵگەت بە دەستەوە نیە کە ناشەرعی یە، بەڵام هەر پێت ناخۆشە، بۆ نموونە پێت دەڵێن: سەر بکەوە بۆ سەر ئەم چیایە تۆش پێت ناخۆشە دیارە مەرجیش نیە ئینسان هەر شتێکی پێ ناخۆش بوو ناهەق و ناشەرعیی بێت، بۆیە ڕاست نیە بۆ هەر شتێك کە پێت ناخۆش بوو بڵێی ناشەرعی یە، نەخێر وا نیە، هەروەها

(329) رواه مسلم .

مەرجیش نیە هەرشتێکیش پێت خۆش بێ شەرعی بێت، چونکە تەرازووی شەرع ئەو شتانە دیاری دەکات نەك میزاج و طـەبع !

کەواتە دەبێ پابەندیی بە فەرمانی سـەروو و باڵاوە هەبێ، بە مەرجـی ئەوەی فەرمانەکە خۆی لە خۆی دا و بە بەڵگـەی ڕوون و بێ چەند و چوون ناشەرعی نەبێ، چونکە ناگونجێ هەر کەسە بە پێی هەوا و ئارەزووی خۆی بەڕێوە بچێ، بەڵکو دەبێ بە پێی داخوازی ئیمانەکەمان ڕەفتار بکەین، ئەو ئیمانەی لە دڵمان دا خۆشەویست کراوە و ڕازێنراوەتەوە.

((**بنچینەی پێنجەم**)):

دەست وبرد کردن لە چارەسـەر کردنی کێشە و گیروگرفتەکانی کۆمەڵ و کۆمەڵگای ئیسلامی دا بە شـێوەیەکی دادگەرانە، وە هەڵوێست وەرگرتن لە بەرانبەر یاخیبووان و دەست درێژکاران دا و گێڕانەوەیان بۆ ژێر سایە و ڕکێفی شەرع، وە پێکەوە جۆش دانی ڕیزەکانی کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان لەسەر بنچینەی ئیمان:

ئەم بنچینەیەش لە ئایەتەکانی (9-10) وەردەگیرێ کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ **وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ(9)إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ** ﴾ واتە: ئەگەر دوو کۆمەڵ لە بڕواداران پێکەوە کەوتنە جەنگەوە، ئاشـتەوایی یان لە نێوان دا بکەن و پێکیان بێننەوە، جا ئەگەر لایەکیان هەر بەردەوام بوو لەسـەر دەست درێژیی بۆ سەر لایەکەی دیکە، (وە بە قسەی ئێوەشی نەکرد و نەگەڕایەوە بۆ

شەرع، ئەوە دیارە چاوی لە ستەم و یاخی بوون و دەستدرێژییە)، بۆیە ئێوەش جەنگی لە دژ بکەن، تا دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی شەرعی خوا، (واتە: مادام بە خۆشی ناگەڕێتەوە بە ناخۆشی بیگێڕنەوە بۆ ژێر ڕکێفی شەرع)، جا ئەگەر گەڕایەوە و ڕازی بوو، ئەوە کێشەکەیان بە دادگەرانە بۆ چارەسەر بکەن بەڵام دادگەر بن بێ گومان خوا دادگەرانی خۆش دەوێ. پاشان خوای دادگەر (سبحانه وتعالى) لە ئایەتی دواتردا دەفەرموێ:

بێ گومان تەنیا بڕواداران بران[330]، ﴿خەڵکی دیکەش برایەتی دەکات بەڵام برایەتی یەکەیان تەنیا ڕواڵەتی و ڕووکەشی یە، بەڵام بڕواداران برای ڕاستەقینە و حەقیقی یەکترن، برای دونیا و قیامەت﴾ کەواتە لە نێوان دوو برادا یان دوو کۆمەڵ لە برایان دا (کە کێشەیان دەبێ) ئاشتەوایی بکەن، وە پارێزکاریی لە خوا بکەن، بەڵکو خوا بەزەیی پێتان دا بێتەوە، ﴿بەهۆی ئەوەوە کە چاوتان لە ئاشتەوایی (صلح) و برایەتی یە لە نێوان ئەهلی ئیمان دا﴾.

جا بەڕێزان! بە ڕاستی ئەم ئایەتانە هەموویان شتی زۆریان تێدایە، بەڵام من بە ناچاری هەروا بە کورتی بە سەریان دا ڕەت دەبم، ئەگەر نا زانایان زۆر شتی گرنگیان لەسەر گوتوون، بە تایبەت ئەم دوو ئایەتە کە باسی مەسەلەیەکی گەورە و گرنگ دەکەن، کە بریتی یە لە مەسەلەی یاخییەکان (البغاة)، کە شەرعزانان (الفقهاء) لە کتێبەکانیان دا و توێژەرەوانی قورئان لە تەفسیرەکانیان دا، شتی زۆریان لەو بارەوە خستۆتە ڕوو، بەڵام دەتوانین بڵێین:

(330) وشەی: (إخوة) بۆ نێر و مێ بەکاردێ، بە بەڵگەی: ﴿وَإِنْ كَانُوا إِخْوَةً رِجَالاً وَ نِسَاءً...﴾ (النساء -176) کەواتە: ڕستەی: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ یانی: بێگومان تەنها پیاوانی مسوڵمان برای یەکترن و تەنها ئافرەتانی مسوڵمان خوشکی یەکترن و، تەنها پیاوان و ئافرەتانی مسوڵمان برا و خوشکی ڕاستەقینەن بۆ یەکتر.

شیلە و پوختەی ئەو قسەو باسانە ئەوەیە کە دەبێ مسوڵمانان لە نێو خۆیان دا تەبا و ڕێك بن نەهێڵن کێشە و گرفت لە نێوانیان دا سەرهەڵبدات، وە کە سەریشی هەڵدا یەکسەر و دەست و برد دەبێ بچن چارەسەری بکەن، چونکە بە (فاء)ی بە دوادا هاتن (تعقیب) ئەوە دەگەیەنێ ﴿ **فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا**﴾ کەواتە: هەر کە کێشە و گرفت سەری هەڵدا پێویستە مسوڵمانان بێ وەخران بە دەمییەوە بچن و یەکسەر چارەسەری بکەن، نەك بڵێن: با لە یەکدی دەربکەن[331]! نەخێر مسوڵمان نابێ زەرەر و زیانی مسوڵمانی پێ خۆش بێ، دیارە مەرجیش نیە ئەو صولحە تەنها بۆ دوو کۆمەڵ بێ کە بە شەڕ هاتبن و کوشتاریان لە یەکتر کردبێ، چونکە وشەی (اقتتلوا) ئەوە ناگەیەنێ کە بە کردەوە (فعلي) یەکتریان کوشتبێ، بەڵکو دەگونجێ تەنها مشت ومڕیان بووبێ، یان لە یەکتر دامەزرابن و سەنگەریان لە یەکتر گرتبێ، لەو حاڵەتانەدا مسوڵمانان دەبێ وریا بن و دەست بەجێ هۆکارەکانی دروست بوونی کێشە و گرفتی نێوان براکانیان بنبڕ بکەن و نەهێڵن کێشە و کوشتار ڕووبدات و خوێن بڕژێ یان خوێنی زیاتر بڕژێ.

ئینجا ئەگەر هەردوولا مل کەچی شەرع بوون و بە قسە و تەکلیفی مسوڵمانان بە گشتی و دەستەڵاتی شەرعیی (السلطة الشرعية) بە تایبەتی - چونکە مەرج نیە تەنها دەوڵەت بەو کارە هەڵسێ - ڕازی بوون ئەوە زۆر باشە، بەڵام ئەگەر لایەکیان ڕازی نەبوو و بە خۆشی خۆی نەهاتە ژێر ڕکێفی شەرع. ئەوە پێویستە بە زۆری و بە زەبر بهێنرێ، ئا ئەوەیە هەڵوێستی مسوڵمانان لە کاتی ڕوودانی کێشە وگرفت دا، نەك بڵێین : (دەست بە کولاوی

(331) با لە یەکدی دەربکەن، واتە: با دەربکەوێ کێ زاڵ دەبێ و کێ ژێر دەکەوێ!

خۆمانەوە دەگرین بۆ ئەوەی "با" نەیبات) یان (ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە)، چونکـــە ئەم قسانە چەند پەندێکن کە خەڵکی ترسنۆك و بێ هەڵوێست گوتوونی، دیارە پەندی پێشـــینانیـــش کە زۆری قســـــەی بەجێ و ڕاستە، هەندێکیشی درۆ و ناڕاستە بۆ نموونە پەندی: (ئاگـــرە سوورە لە خۆم دوورە)، ئەو ئاگرە ســــوورە ئەمڕۆ تۆ دەســـووتێنێ سبەینێ دەگاتە من و منیش دەسووتێنێ، هەروەها ئەو کەسەی کە کڵاوی تۆ بە زللەیەك لادەبات سبەینێ هی منیش لادەبات !!، بەڵكو هەڵوێستی ئینسانی مسوڵمان ئەوەیە کە بڵێ: تۆ منی و من تۆم! با سەیر بکەین خوای پەروەردگار دەربارەی بوختانەکەی کە بە (عائیشە) کرا، چی دەفەرموێ : ﴿ لَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا ﴾ واتە: دەبووایە کە ئەو هـــەواڵەتان دەبیســـت بڕواادارانی پیاوو ئافرەت گومانی باشـــیان بە خۆیان بردبایە، واتە: ئەی مسوڵمانینە! بۆچی بڕواتان کرد کاتێك خێـــزانی بەڕێـــزی پێغەمبەر ﷺ تۆمەت و بوختانی بۆ هەڵبەسترا، چونکە هەر شیمانە (ئیحتمال) دانان کە ئەو شــــتە وابێ، ئەوە گوناهە و نابێ لە خۆتانی بوەشێننەوە ؟! کەواتە ئەو گومانە کە بە (عائیشە) ببرێ وەك بە نەفسی خۆیان بیبەن وایە.

بۆیە کاتێك یەکێك لە ئافرەتانی هاوەڵان بە مێردەکەی خۆی گوت: ئەرێ گوێت لـێیە چی دەڵێن دەربارەی(عائیشە)؟! مێردەکەیشی گوتی: بەڵێ گوێم لـێیە، بەڵام ئایا تۆ ئەو کارە لە خۆت دەوەشێنی یەوە؟! ژنەکە گوتی: نەخێر، مێردەکەیشـــی گوتی: دەجا سوێند بە خوا (عائیشە) لە تۆ مسوڵمانتـــر و ئیماندارترە و پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵ من ناچێتـــە تەرازووەوە و بابــــی (عائیشە)ش خوا لـێیان ڕازی بێ لە بابی تۆ باشـتر و مسوڵمانتـرە، کەواتە بۆچی ئەو گومانە خراپـــــە بە خۆت نابەی و بەوی دەبەی؟! ، جا توێژەروان

(مفسرون) دەڵێن [332]: ئەم ئایەتە لەسەر ئەو مشت و مڕو و تووێژە هاتۆتە خوارێ، کەواتە: ئەگەر گومانی خراپ بە مسوڵمانان بەری ئەوە بە خۆتت بردوە و ئەو زیانەی ڕوو لە تۆ دەکات ڕووی لە من کردوە و ئەو زوڵمەی لە تۆ دەکرێ لە منە ..... ئا ئەوە چەمکی ئەو ئایەتەیە، هەر ئەو جۆرە بیرکردنەوە و تێڕوانینەش لە ئینسانی مسوڵمان و کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان دەوەشێتەوە.



(332) بڕوانە : (جامع البيان في تأويل آي القرآن) للطبـري ، ج18، المجلد (10) ص120، رقم : 25812.

# دەرسی دوازدەیەم:

# کاریگەریی ئیمان و عەقیدە لە پێگەیاندن و بنیاتنانی کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی ساغ و تۆکمەدا

خاڵەکانی: 6 و 7 و 8 و 9 و 10 و 11.



((**بنچینەی شەشەم**)): کە لە ئایەتەکانی (11-12) وەرگیراوە.

خاوێن کـــــردنەوەی کۆمەڵ و کۆمەڵگا و بژار کردنیان لە خوو و خدە و خەسڵەتە پیس و زیان بەخشەکان، کە پێچەوانەی ئیمان وبرایەتی و گیاکەڵە و ملۆزمی کۆمەڵ و کۆمەڵگان:

وەك چۆن بابایەکی باخەوان یان خاوەن کشتوکاڵ ئەگەر بیەوێ ئەو باخە یان ئەو کشتوکاڵە چاك بەرهەم بێت و گەشـە بکات و چاك بەر بگرێت دەبێ وەك چۆن مشـــووری ئاودان و ئاودێری و پەین و کیمایی پێوەرکردنی لەبەرە، بەهەمان شێوەش دەبێ مشووری ئەوەشی لـێ بخوات کە هەر شتێك زیانی پێ بگەیەنێت لـێی بژار بکـات و لای بەرێ، وەك لە باسی (تزكية)ش دا گوتمان (تزكية) هەم مانای پاك بوونەوە دەگەیەنێ و هەم گەشە کردنیشی .

کۆمەڵگاش لەو ڕووەوە وەك تاکە کەس وایە، واتە وەك چۆن ئینسان هەم پێویستی بە خۆ پاك ڕاگرتن و هەم پێویستیشی بە خۆ چاك کردن هەیە، واتە: هەم پاك و هەم چاکیش بێ، هەم خۆی لە خەسڵەت و سیفەتە زیان بەخشەکان پاك بکاتەوەو هەم خۆیشی بڕازێنێتەوە بە سیفەتە باش و پەسندەکان، کۆمەڵ و کۆمەڵگاش بە هەمان شێوەیە.

هەروەها چۆن ئینسان وەك خودی خۆی، ساغ دەبێ و نەخۆشـــــیش دەبێ کۆمەڵگاش بە هەمان شێوە، کۆمەڵگای ساغ هەیە و کۆمەڵگای نەخۆشیش هەیە.

دیسان وەك چۆن ئەو نەخۆشی یانەی کە تووشی ئینسان دێن، هەندێکیان تووشی جەستەی (جسم)ی دێن و دیوی ڕووالەت و بەرچاوی تووشی دەرد و گرفتاری دەکەن و هەندێکیشیان تووشی دەروون (باطن) و گیان (روح)ی دێن، کۆمەڵگاش بە هەمان شێوە، هەندێك لە نەخۆشی یەکانی کۆمەڵگا نەخۆشی

بەرچاو و بەرهەست و هەست پێ کراو و ڕواڵەتین و هەندێکیشـــیان نەخۆشی دەروونی (باطني) و پەنهان و شێرراوەن.

جا خوای کاربەجـــێ (سبحانه وتعالـی) لەم دوو ئایەتەدا بۆمان باسی شەش جۆرە نەخۆشی دەکات کە تووشی کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان دەبن، سێیان نەخۆشی ئاشکرا و بەرچاون و زیاتر تووشی دیوی ڕواڵەتی و بەرچـاوی کۆمەڵ و کۆمەڵگا دێن و سێشـیان نەخۆشی پەنهان و شـیرراوەن و تووشی (روح) و ماهییەت و هەناوی دێن.

خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنهُمْ وَلاَ نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنهُنَّ وَلاَ تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلاَ تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ بِئْسَ الاِسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الإِيمَانِ وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ ﴾ واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێنـــــاوە با کۆمەڵێك لە پیاوان گاڵتە بە کۆمەڵێك نەکەن نزیکە کە لەوان چاکتـر بن، هەروەها با کۆمەڵێك لە ئافرەتان گاڵتە بە کۆمەڵێکیان نەکەن نزیکە کە (گاڵتە پێکراوەکان) لەوان چاکتر بن، وە عەیب لە خۆتان مەگرن، وە ناوو ناتۆرە لە یەکدی هەڵمەدەن، چونکە خراپترین ناو پاش ئیمان ناوی لاڕێ (فاسق) بوونە (کە بە سەرتان دا ببڕێ بەهۆی ئەو جۆرە ڕەفتارانەوە) وە هەر کەسێکیش نەگەڕێتەوە ئەوە هەر ئەوانەن ستەمکاران.

**1- نەخۆشی و گوناهی ڕواڵەتیی یەکەم: گاڵتە بە خەڵك کردن:**

ئەم ئایەتە بە پێزە باسی سێ نەخۆشییە ڕواڵەتییـــەکان دەکات، کە یەکەمیان گاڵتە بە خەڵك کردنە: سەرنجی ئەو (تعبیر)ە بدەن ! نەیفەرمووە : ﴿ لا يسخر بعضكم من بعض ﴾ بەڵکو فەرموویەتی : ﴿ لاَ يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ ﴾ واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە با کۆمەڵێك گاڵتە بە کۆمەڵێك

نەکات بۆیە بەو شێوەیە هێناویەتی چونکە وەك بڵێی بڕوادان زۆر لەوە بەرزترو دوورترن کە گـــاڵتە بە یەکتر بکەن، کەواتە: خوای پەروەردگـــــار دەربڕین (تعبیر)ێکی زۆر ناسکی بەکار هێناوە و ئەیفەرموو: ئەی بڕوادارینە گاڵتە بە یەکتری مەکەن و فەرموویەتی: با کۆمەڵێك گـــاڵتە بە کۆمەڵێك نەکەن، چونکە گاڵتەکردن بە یەکتری سیفەتی مسوڵمانان نیە و سیفەتی هەر کۆمەڵ (قوم)ێکە کە لە ئیمان و ئیســــلام حاڵی نەبووبن و هیدایەتی خوایان وەرنەگرتبێ، هەڵبەتە لێرەدا (قوم) بە مانای هەر کۆمەڵێکە نەك میللەت و نەتەوەیەك .

ئینجا دەفەرموێ : ﴿ **عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ** ﴾ نزیکە کە گاڵتە پێ کراوەکان لە گاڵتە پێ کەرەکان چاکتر بن، چونکە کەســـێك گاڵتە بە خەڵك دەکات کە بۆ خۆی هەقی پێ نەبێت و کەسێك بە چاوی سووك سەیری خەڵك دەکات کە بۆ خۆی سووك بێت، ﴿ **وَلاَ نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ** ﴾ وە با کۆمەڵێك لە ئافرەتانیش گاڵتە بە کۆمەڵێکیان نەکەن، نزیکە کە گاڵتە پێ کراوەکان لەوان چاکتر بن لای خوا، چونکە هەر نەبێ بەو سیفەتی گاڵتە پێ کردنە تای تەرازووی خۆیان لەنگ دەکەن، ئەوە نەخۆشی یەکەم کە نەخۆشی یەکی ڕواڵەتی و ئاشکرایە.

**2- نەخۆشی و گوناهی ڕواڵەتیی دووەم: عەیب لە خەڵکی گرتن:**

نەخۆشـــی دووەمیش ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ **وَلاَ تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ** ﴾ عەیب لە خۆتان مەگرن، (لَمْز) ئەوەیە کە بەرەو ڕوو عەیب لە کەســێك ببینی یەوە و عەیبــی لــێ بگری و پڵلار و توانجی تێ بگری، جا بێگومان ئەم دەربڕینە زۆر وردە و مانای وایە ئەگەر تۆ عەیب لە مسوڵمانێك بدۆزیەوە ئەوە لە خۆتت دۆزیوەتەوە، چونکە ئەگەر خۆت بە مسوڵمان دەزانی و ئەویش

بە برا و خوشکی مسولّمان دەزانی دەبێ ئەوت پێ وەك خۆت و خۆتت پێ وەك ئەو بێت، واتە وەك چۆن پێت ناخۆشە گاڵتە بە خۆت بکرێ، دەبێ هەرواش پێت ناخۆش بێ گاڵتە بەو بکرێ، نەك هەر نابێ بۆ خۆت گاڵتەی پێ بکەی، بەڵکو دەبێ پێت ناخۆش بێ کە خەڵکیش گاڵتەی پێ بکات و توانجی تێ بگرێ وعەیبـی لـێ بگرێ!، ئینجا ئەگەر هاتوو ئەو بابایە عەیب وکەم و کووڕی یەکیشی هەبوو، دیسان نابێ ڕووشکێن بکرێ، بەڵکو دەبێ بە شێوەیەکی لەبار و گونجاو پێی بگوترێ، وەك چۆن ئەگەر شـــتێکی پیسی بە بەرگ و پۆشاکی یەوە یان شوێنێکی یەوە بێت، دیـــارە ناچی لە نێو خـەڵك دا لـێی بکەیە گاڵە وهەرا وهۆریا و بە لەباری بانگی دەکەیە پەنایەك و بە بێ دەنگی پێی دەڵێی، دەجا عەیب وڕەخنەی مەعنەویش بە هەمان شێوەو، مسوڵمانان نابێ لە عەیب و کەم و کوڕی یەکتر بێ دەنگ بن، بەڵام ناشبێ لە یەکتـــر لە هەڵلا بدەن، بەڵکو دەبێ بە شێوەیەکی گونجاوو لەبار هەڵە بۆ یەکتر ڕاست بکەنەوە، دیارە عەیب و ڕەخنە لە یەکتر گرتنیش زۆر شت دەگرێتەوە بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان ناتەواویی خستنە بەرچاو نەفسی کابرا پێی ناخۆش بێ، ئەوە دەکەوێتە بەر حوکمی عەیب لێگرتن (لمز)، تەنانەت ئەگەر یەکێك بەوی دیکە بڵێ: ئەو پێڵاوە زلانە چین لە پێت دا ! بە کورتی هەر شتێك کە بزانی ئەو کەسە پێی ناخۆشە و هیچ قازانج و بەرژەوەندییەکیشـــــی تێیدا نیـــــە.[333]

3- **نەخۆشی و گوناهی ڕواڵەتیی سێیەم: ناووناتۆرە لە خەڵك دینەوە:**

(333) بەڵام ئەگەر قازانج و بەرژەوەندیی تێیدا هەبوو ئەو کاتە حوکمەکەی جیایە و گوتراویشە: دۆست ئەو کەسەیە کە دەتگریەنێ و دوژمنیش ئەو کەسەیە کە دەتهێنێتـە پێکەنیـن .

پاشان خوای کاربەجێ فەرموویەتی : ﴿ وَلاَ تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ ﴾ واتە: وە ناوو ناتۆرەش لە یەکتــر مەدۆزنەوە، ﴿ الألقاب ﴾ کۆی (لقب)ە واتە نازناو و شۆرەتێك کە ئینسان پێی ناخۆش بێ، وشەی ﴿ تنابزوا ﴾ش لە (باب)ی (تفاعــــل)ە کە بۆ هاوبەشی (مشــــارکة) دوو لایەن (طرف)ە یاخود زیاتر، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەم ئەگەر لە سەرەتاوە ناوو ناتۆرە لە کەسێك هەڵبدەی بێ ئەوەی ئەو لە پێشدا ناو و ناتۆرەی لە تۆ هەڵدابێ هەر حەرامە و هەم ئەگەر لە بەرانبەریش دا وا بکەی هەر حەرامە، کەواتە: هەم لە سەرەتاوە وا مەکەن و هەم ئەگەر بەرانبەرەکەشتان دەست پێشخەر بوون ناو و ناتۆرەیان لە ئێوە هەڵدا و ئێوەش پێتان ناخۆش بوو، هەر وا مەکەن لە کاردانەوەی ئەو بەرانبەرانەتان دا، هەڵبەتە ناو و ناتۆرەی خراپ و ناشیرین، ئەگەر نا زانایان دەڵێــــن: ئەگەر کابرا شۆرەتێکی هەبوو کە پێیــــەوە دەناسرا، وەك فلاَن کەسە (کەڕ) یان (شەل) یان (کوێر) یان (ڕەش)، وە هەر لەقەبێکی دیکەی ئاوا کە بزانرێ پێی ناخۆش نیە ئەوە حەرام نیە و قەیدێ ناکات.

ئینجا دەفەرموێ: ﴿ بِئْسَ الاِسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الإِيمَانِ ﴾ واتە: خراپتــــرین شت ناوی لارێ (فسق) هاتنە سەر ئینسانە دوای ئەوەی کە بڕوادار (مؤمن) بووە. چونکە (مؤمن) نابێ (فاسق) بێ و خراپترین شت ئەوەیە کە ئینسان لە پێشدا (مؤمن) بێت کەچی دوایی خۆی (فاسق) کردبێ و بەهۆی گوناهێکی گەورەوە لەقەبی (فسق)ی وەرگرتبێ، جا ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە بەهەر کام لەم سێیانە ئینسان (فاسق) دەبێ.

1- گاڵتە کردن بە خــــەڵك .

2- عەیب لــێ دۆزینەوە و توانج و پلار تێ گرتن.

3- ناوو ناتۆرە و شۆرەتی خراپ لە یەکتر هەڵدان، پاشـــان دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ ﴾ واتە: کەسێکیش لەو جۆرە کردەوە و ڕەفتارانە (کە هەر کامیان گوناهێکی زلە) پەشیمان نەبێتەوە، ئەوە هەر ئەوانەن ستەم کار.

دیارە ئەگەر خاوەنی ئەو جۆرە گوناهانە کە بێگومان هەموویان گوناهی گەورەن نەگەڕێنەوە و (توبة) نەکەن، تۆڵەی قیامەتی یان لەسەرە، هەرچەندە تۆڵە و ســـزا (عقوبة)ی دونیایی یان لەسەر نیە، بەڵام دەگونجێ برا گەورە و پێشەوای مسوڵمانان لەسەر ئەوە ئەو جۆرە کەسانە سەر کۆنە بکات و بە جۆرێك لە جۆرەکانی تەمبێ کردن (تعذير) تەمبێیان بکات.

ئەوانەی ڕابردن سێ نەخۆشی دیار و ڕواڵەتی و بەرچاو بوون، ئینجا دێتە سەر باسی سێ نەخۆشی دیکە کە پەنهان و دەروونی (باطني) و شێرراوەن و دەفەرموێ: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنْ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلاَ تَجَسَّسُوا وَلاَ يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ ﴾ واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێنـــــاوە خۆتان لە زۆر جۆرە گومانان دوور بگرن، چونکە هەندێك گومان گوناهن، وە جاسووسیی لەســـــەر یەکتر مەکەن. وە هەندێکتان پاش ملە بە خراپە باسی هەندێکتان مەکەن ئایا یەکێکتان حەز دەکات کە بە مردوویی گۆشتی برایەکەی بخوات ! بێ گومان پێتـــان ناخۆشە، وە پارێز لە خوا بکەن بێگومان خوا زۆر تۆبە وەرگر و بە بەزەیی یە.

1- نەخۆشی و گوناهی دەروونیی یەکەم: گومانی خراپ بە خەڵك بردن:

سەرەتا پێویستە واتای سێ وشان بزانین کە بریتین لە: (شك، ظن، يقين)، (شك) ئەوەیە کە دڵت نە بەم لادا نە بەو لادا بێ و هەردوو لات پێ وەك یەك وابێ وبوون ونەبوونی ئەو مەسەلەیەت لە لا وەك یەك بێ، (ظن)یش ئەوەیە کە بوونی شـــتێکت بەسەر نەبوونی دا زاڵ کردبێ، یان بە پێچەوانەوەوە،(يقين)یش ئەوەیە کە بوون یان نەبوونی شتێکت بە تەواوی و بە دڵنیایی‌یەوە بە لایەکیان دا ساغ کردبێتەوە و حەسمت کردبێ.

جا لێرەدا خوای پەنهانبین دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە خۆتان لە زۆر گومان (ظن) بپارێزن، واتە: زۆر بۆچوون کە لە ڕاستیشەوە نزیکە، بەڵام تەواو لێت نەبۆتە (يقين) خۆتی لـێ بپارێزە بەرانبەر بە خەڵکی بۆچی ؟! چونکە ﴿ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ ﴾ بێ گومان هەندێك لە گومانەکان گوناهن جا مادام هەندێکی گوناهە تۆ خۆت لە زۆری بپارێزە بۆ ئەوەی تووشی ئەو هەندێکـــەش نەبی[334]، بۆچی نەیفەرمووە: لە هەموو گومانەکان خۆتان بپـــارێزن؟ چونکە ئەوە ناکرێ و ناگونجێ؟ خوای پەروەردگاریش کاربەجێ‌یە و شـــتێك پێویست ناکات کە نەگونجێ جێبەجێ بکرێ، جاری وایە پێویستە گومان بردنی خراپت هەبێ لە بەرانبەر ئینسانی خراپ دا، وەك زانایان گوتوویانە: (الحَزْمُ سوءُ الظَّن) واتە: دووربینی ئەوەیە کە گومانی خراپت هەبێ لە جێگای خۆی دا، دیســـان بۆیە نەشی فەرمووە: هەموو گومانێکی خراپ یان زۆربەی گومانی خراپ گوناهە و فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ ﴾ لە پێشـــدا فەرموویەتی: خۆتان لە زۆربەی بپارێزن، دوایی فەرموویەتی:

(334) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (لا يبلغ العبد درجة المتقين حتى يَدَعَ ما لا بأس به مخافة أن يدركه ما به بأس) .

هەندێکی گوناهـــــە، کەواتە: لەبەر ئەو هەندێکە خۆت لە زۆربەی بپارێزە بۆیەش نەی فەرمووە: خۆت لە هـــــەمووی بپارێزە، چونکە ئەگەر وای فەرمووبایە دەبووایە هێندە سافیلکەبی کە ئەگەر قاچت ببـڕنەوە و (70) فێڵت لـێ بکەن دەنگ نەکەی و هەر بۆیان هەڵ بخەڵەتێی !! بەڵام نەخێر، مسوڵمان هەرچەندە دەبێ دڵی (صاف) و بێ گـــــەرد بێ بەڵام ناشبێ سادە و گێل بێ ! ئەگەر ئینسان ڕێگای نەبێ هەرگیز گومانی خراپ بە کـــەس بەرێ با کابرای گومان پێبراو خراپیش بێ، بەوە ئینســـــان تووشی جۆرێك لە سادەیی و گێلی دەبێ !، بەڵام ئینسانی مسوڵمان دەبێ هۆشیار و بێدار بێت، وەك پێغەمبەر فەرموویەتی: ﴿ المؤمن كَيِّسٌ فَطِنٌ ﴾[335] واتە: مسوڵمان وریا و زیرەکە، (عمر بن الخطاب)یش گوتوویەتی: (لستُ بالخَبِّ ولا الخَبُّ يخدعني) واتە: فێڵ باز نیم و فێڵ لە خەڵکی ناکەم، بەڵام فێڵ بازیش نام خەڵەتێنن، ئاوا باشە نە فێڵ بکەی و نە بشهێڵی فێڵت لێ بکری .

ئینجا بۆیەش فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ ﴾ ؟ واتە ئەو هەندێك گومانەی کە لە شوێن و جێگای خۆیان دا نین گوناهن ، بەڵام گومانێك کە لە شوێنی خۆی دا بێت ئەوە نەك گوناه نیە ، بەڵکو ئەجر و پاداشتیشی هەیە ، بۆ نموونە: کەسێك کە هەڵس وکەوتێکی نامۆ و سەیر وجێگای تۆمەتی لـــێ دەبینرێ ئەوە پێویستە چاودێریی (مراقبة) بکرێ، چونکە ڕەنگە لە ئەنجام دا ئەو کەسە دز یان جاسووس دەربچێ و ئاشـــــکرا ببێ، کە دیارە کابرا بە هۆی ئەوەوە کە گومانی خراپــــــی پێ براوە کەشف بووە ، بۆیە خاوەنی ئەو جۆرە گومانە پاداشتی هەیە و جێی ڕێز و سوپاسە.

---

(335) رواه

ئينجا ئەوە كە ئايا چ جۆرە گومانێك لە جێگــای خۆی دايە و كامەيان لە جێگـــای خۆی دا نيە؟ ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئيجتيهادی ئەو كەسە خۆی، بۆيە دەبێ زۆر لە خۆی وريا بێ و ئينسانی مسوڵمان دەبێ عاقڵ و خەڵك ناس و دەوروبەر ناس بێ و بزانێ هەر كەســـە بايی چەندە و چۆنە و پێويستە چ جۆرە هەڵس و كەوتێكی لەگەڵ بكات و چ جۆرە گومانێكی پێ بەرێ.

2- نەخۆشی و گوناهی دەروونی دووەم: جاسووسيی و بە دوای عەيبی خەڵك دا گەڕان:

گوناهــو نەخۆشی دووەمی پەنهان و ناديار بريتی يە لە جاســـووســـيی و بە دوای عەيب و هەڵەی خەڵكی دا گەڕان و سووڕان، وەك خوای كاربەجێ فەرموويەتی:(ولا تجسسوا )جاسووسی لەسەر يەكتر مەكەن، (جاسووسی) واتە هەست ڕاگرتنی بە پەنامەكی، وە (تجسّس) و (تحسّس) يەك مانايان هەيە ئەويش ئەوەيە هەست لە كەســێك ڕابگری بەڵام بە مەبەســـــتی ئەوەی كە عەيب و كەم و كووڕی و ناتەواويی كابرا بدۆزيەوە .

لە زمانی كوردی دا وشەی (جاسووس) ماناكەی بە (ســـــيخوڕ) لێك دراوەتەوە كەسێك كە قسەی يەكێك بۆ يەكێكی ديكە دەبات، بەڵام لە زمانی عەرەبی و زاراوی قورئان دا ماناكە ئاوا نيە، بەڵكو ماناكەی ئەوەيە كە تۆ هەست ڕابگری و خۆ مەڵاس بدەی و بە نهێنـــی بە دوای عەيـب و عـــــار و ناتەواوی يەكانی خەڵك دا بگەڕێی و وەك مار خۆت مەڵاس بدەی و پێيانەوە بدەی، كە بێ گومان ئەوە زۆر شتێكی خراپ و بێ جێيە و مسوڵمان نابێ بە دوای عەيب و ناتەواوی‌يەكانی خەڵكی دا بگەڕێ، بەڵام ئەگەر شتێكت كەوتە بەرچاو پێويستە وريا بی و ئاگات لە خۆت بێ، بەڵام كە هەميشە بە دوای

عەیبەکانی خەڵکدا گەڕای ئەوە وەك مێشە ڕەشەت لێ دێت دەبێ هەر بە سەر خاڵی ڕەش و پیســـەوە بنیشی و وات لــێ دێت هەر بە دوای عەیبــی خەڵکدا دەگەڕێی و عەیب و کەم وکووڕی یەکانی خۆت لە بیر دەچنــەوە، بۆیە گوتراوە (طوبى لمن شَغَلَتْهُ عيوبه عن عيوب الناس) خۆشــی بۆ ئەو کەســـەی کە عەیبەکانی خۆی لە عەیبەکانی خەڵك بێ ئاگای دەکەن.

3- **نەخۆشی و گوناهی دەروونیی سێیەم: پاشملە بە خراپە باسی خەڵك کردن:**

نەخۆشی ســـێیەمی نادیار و پەنهان (غەیبەت)ە کە لە بارەیـــــەوە دەفەرموێ: ﴿ **وَلاَ يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا** ﴾ هەندێکتان بە خراپە پاشـــملە باسی هەندێکتان مەکەن، (غيبة) لە زمانی عەرەبی دا واتە: بە خراپە باسی یەکتـــر کردن بە نادیار و پاشــملە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**أتدرون ما الغيبة؟**)) ((**ذكرك اخاك بما يكره**))[336] واتە: غەیبەت ئەوەیە کە باسی برایەکەی خۆت بکەی بە شێوەیەك کە پێی ناخۆش بێ، پاشان پرسیاری لێکرا: ئەدی ئەگەر ئەوەی باسی دەکەم سیفەتێك بوو لە برایەکەم دا هەبوو؟!، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر سیفەتەکەی تێدا بوو ئەوە غەیبـــەتت کردوە، بەڵام ئەگەر تێیدا نەبوو ئەو تۆمەتێکی ناڕەوات بۆ هەڵ بەستوە ((**ان كان فيه ما تقول فقد اغتبته وان لم يكن فيه فقد بهَّتَه**))، وشەی (بهتان)یش واتە: بە درۆ و ناڕەوا شتێکی خراپ بۆ کەسێك هەڵبەستن.

---

(336) رواه مسلم وغيره، بڕوانە (صحيح مسلم) ص1397 رقم: 2589.

بەلاّم پێویستە بزانریّ کە لە چەند حاڵەتێك دا بۆت بە گوناھ لە قەڵەم نادریّ و لە ســــەرت نانووسریّ کە بە خراپە باسی هــەندیّ کەس بکەی، بۆ نموونە:

یەکەم: کەسێك باسی مەزلۆومیەتی خۆی بکات لە دەســـت ستەم کارێك لە دادگادا یان لە لای مسوڵمانان و مەبەســـتی ئەوە بێت ئەو زوڵمە لەسەر خۆی لابەرێت، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ لاَ يُحِبُّ اللّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلاَّ مَن ظُلِمَ ﴾[337] واتە: خوا حەز ناکات کەس قسەی خراپ بکات مەگەر کەسێك زوڵمی لیّ کرابێت، کەواتە دروستە ئینسان باسی مەزلۆومیەتی خۆی بکات.

دووەم: یان بتـــــەویّ کەسێك ئاگادار بکەیەوە لە زیانی کەسێك، بۆ وێنە: برادەرێك و دۆستێکت دەیەویّ لەگەڵ کەسێك معامەلەیەك بکات یان ببیّ بە دراوسێی یان ســـەفەری لەگەڵ بکات تۆش شارەزای ئەو کەسەی دیکە هەی و دەزانی کەسێکی خراپە و ئەو دۆســتەت لــیّی تووشی زیان دەبێت لەو حاڵەتەش دا دروستە بڵێی لێی نزیك مەبەوە لەبەر ئەو چەند سیفەتانە کە تێیدا هەن.

سێیەم: یان بۆ پێناساندن، کەسێك داوات لیّ دەکات و دەتکاتە ئەمیندار و ڕاوێژکاری خۆی دەربارەی کەسێك یان ماڵێك بۆ خزمایەتی و ژن و ژن خوازی یان بۆ هەر شتێکی دیکە، تۆ دەبیّ بەو پەڕی ئەمینداریيەوە ئەوەی دەربارەیان دەیزانی بۆی باس بکەی، ئافرەتێـــك پرس و ڕاوێژی بە پێغەمبەر کرد ﷺ کە ئایا مێرد بە (معاوية)ی کوڕی (أبو سفيان)

---

(337) النساء (148).

بکات یان بە (أبو جهم) بکـــات، پێغەمبەر ﷺ یش فەرمووی[338] (هەرچی (معاوية) یە ڕووت و ڕەجاڵـــە و هیچ ماڵ و دارایی یەکی نیە، (أبو جهم) یش گۆچانەکەی لە ملی ناهێنێتە خوارێ، واتە زۆر لە ژنان دەدات، لێرەدا هەر کامێکیان چ نوختەیەکی لاوازی تێدا بووە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەمانەتەوە بۆی باس کردوە و کردوویەتە سەر پشك .

چوارەم: وە لە حاڵێك دا کە کابرایەك لە ڕێ دەرچوویکی ئاشکرا (فاسق بالجهر) بێت، واتە کەسێك بە ئاشکرا زۆر خراپ ودرۆزنە، یان زۆر شەڕاب خۆر و دزە، یان زۆر زاڵمە، ئەوەش دروستە باسی بکەی، بۆ ئەوەی یان بە خۆی دا بچێتەوە و چاك ببێ بەهۆی ئەوەوە کە پێی دەگاتەوە، یان خەڵك بیناسن و لێی تووشی زیان نەبن، ئەمانە وهەندێك حاڵەتی دیکەش هەن کە تێیان دا دروستە باسی خەڵك بکرێ و بە (غيبة)یش لە قەڵەم نادرێ، بەڵام لەوەش دا هەقە مسوڵمان لە خۆی وریا بێت وقسە و هەڵوێستەکەی لە نەفس و ئارەزوو و لە شکاندنی (طرف) بەرانبەرەوە هەڵ نەقوڵێ بەڵکو لە بەرژەوەندی یەکی شەرعی یەوە هەڵبقوڵێ، ئەو کاتە ڕەوایە.

ئینجا دەفەرموێ ﴿ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا ﴾ ئایا هیچ کامێکتان حەز دەکات گۆشتی برایەکەی بە مردوویی بخوات؟!﴿ فَكَرِهْتُمُوهُ ﴾ بە تەئکید پێتان ناخۆشە، ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ ﴾ وە پارێز لە خوا بکەن بێ گومان خوا تۆبە قبووڵ کەر و بەخشەرە وەك دەبینین خوای بە بەزەیی غەیبەتکردنی ئینسانی مسوڵمانی بۆ برا یان خوشکی مسوڵمانی وەك

(338) (أما أبو جهم فلا يَضَعُ عصاه عن عاتِقِه، وأما معاوية فصعلوك لا ماله له...) رواه مسلم، برقم (1480).

ئەوە داناوە کە بە مردوویی گۆشـــــتی لـێ بکاتەوە و بیخوات ! واتە خوای پەروەردگار بە جۆرێك حاڵەتی غەیبەتکردنی وێنا (تصویر) کردوە کە بابای مســـوڵمان بە هەموو شێوەیەك خۆی لێ بپارێزێ و بە هیچ بیانوویەك توخنی نەکەوێ، دیارە کەسێکیش بە ڕاستی ئیمانی هەبێ و حیسابی سزا و پاداشتی دوا ڕۆژ بکات هەروا دەکات، ئینجا ڕستەی:﴿ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ ﴾یش ئەوە دەگەیەنـــێ کە ئینسان مادام (توبة) لە غەیبـــەت بکات خوا لـێی خۆش دەبێت و دەیبەخشێ، نەك وەك هەندێك کەس دەڵێن: ئەگەر بابای غەیبەتکراو ئازادی نەکات، با (تۆبە)ش بکات خوا نایبووڕێت !.

**(بنچینەی حــەوتەم):**

هیچ کام لە ڕەگەز و ڕەچەڵـەك و ڕەنگ و زمان و دەســـتەڵات و سامان، ناگونجێ بکرێنە تەرازوو و پێوەری هەڵسەنگاندنی گرانی وسووکی وگەورەیی و بچووکی ئینسانەکان ، وە تەرازوو و پێوەر تەنیا پارێزکاری (تقوی) یە:

ئەم بنچینەیەش لە ئایەتی ژمارە (13)ی (الحجرات) وەردەگیرێ.

بێ گومان کتێبـــی خوا هاتوە کە کۆمەڵگایەك دروســـت بکات لەسەر بناغەی ئیمان و پابەندی بە شـــەریعەت، لەســـەر بناغەی ڕۆیشتن بە دوای پێغەمبەردا ﷺ، وە لەسەر بناغەی برایەتیی و پاکیـی و خۆڕازاندنـــەوە بە چاکەو بە سیفەتی بەرز وپەسند ، دیارە کۆمەڵگایەکی ئاواش ناگونجێ نەعرەی ڕەگەزیی و نەتەوەیی و ناوچەیی و عەشیرەتایەتی تێدا بێ و خەڵکـــی بەهۆی وەجاخ و بنەماڵە و پارە و سامان و دەستەڵات وحیزب و .... هتد خۆیان بەسەر یەکتـردا هەڵکێشن، چونکە ئەو شتانە هەموویان پێوەر و تەرازووی نەفامیی

(جاهلي) ن، واتە: ئەوە کە عەرەب بڵێ: من لە کورد چاکترم چونکە عەرەبم ! یان بە پێچەوانەوەوە ئەوە بێ گومان نەفامیێتی (جاهلیة) یە، هەروەها هەر گەل و نەتەوەیەکی دیکەش، یان عەشـیـرەتێك بڵێ من لە فلان عەشیرەت باشـترم، یان یەکێك بە بنەماڵـەی خۆیەوە بنازێ، یان یەکێك بڵێ: من کوڕە (شێخ)م و تۆش کوڕە کرێکار، یان بڵێ: من کوڕە ئاغام و تۆش کوڕە جووتیار، یان من کوڕە دەوڵەمەندم و تۆش کوڕە هەژار !!، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ئەو شتانە هەموویان قسەی بۆش و پووچن.

هەرچەندە جاری واش هەیە باو (عرف)ی کۆمەڵگا و میللەتێك بە هەڵە ئەو پێوەر و ترازووانە پەیدا دەکات، بەڵام لە ئیسـلام دا هەر هەڵە و ناشەرعییـن و چاکیی و خراپی، گرانی و سووکی بە پارێزکاریی (تقوی) یە و کێ پارێزکاریی (تقوی)ی زیاتر بێ ئەوە سەنگینتر و بەڕێزترە و کێ (تقوی)ی کەمتر بێ سووکتر وکەم ڕێزترە لە لای خواو دەبێ لای مسوڵمانانیش هەروابێ، چونکە مسـوڵمانانیش دەبێ تەنها بە تەرازووی خوا شت بکێشـن، نەك تەرازووی خۆیان.

جا دیارە ئەم بنچینەیـەش وەك گوتمان لە ئایەتی (13) وەردەگیرێت کە خوای دادگەر تێیـدا دەفەرموێ : ﴿ **يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ** ﴾ واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لە نێر و مێ (آدم و حواء) یەك خوڵقاندوە، وە گێڕاومانن بە چەند گەل و تیرەیەك، تاکو یەکتر بناسن، بێ گومان بەڕێزترتان لای خوا پارێزکارترتانە، وە خوا زۆر زانا و شارەزایە.

هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن [339]: ئەم ئایەتە کاتێك هاتە خوارێ کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی ئازاد کردنی (فتح)ی مەککەدا فەرمانی بە (بلال) کرد، کە لەسەر بانی (کعبة) بانگ بدات، (بلال) خوا لـێی ڕازی بێ، کابرایەکی حەبەشەیی بوو، کۆیلە (عبد)ێك بوو کە مسـولْمان بوو (أبو بکر الصدیق) خوا لـێی ڕازی بێ لە خاوەنەکەی کـــڕی و ئازادی کرد، جا کاتێك (بلال) چووە سەر بانی (کعبة) و بانگی دا هەندێك لە زلە زلەکانی (قریش) کە یان هەر مسولْمان نەبوون، یان تازە مسولْمان بوو بوون و چاك لە ئیسلام نەگەیشتبوون گوتیان: خۆزگە ئەم ڕۆژەمان بە چاوان نەبینیبایە ! ئەوە (مُحَمَّدٌ) هیچ کەسێکی دیکەی دەست نەکەوت جگە لەم کابرایە کە بچێتە سەر بانی (کعبة) کە پیرۆز (مقدّس) ترین شـــوێنی ئێمەیە و بانگ بدات ؟! جا کاتێك پێغەمبـــەر ﷺ گوێی لەم قسەیە بوو، فەرمووی[340] ((**دعوها فأنها منتنة**)) واز لەو قســـەیە بهێنن چونکە بۆگەنە ! خوای پەروەردگار و دادگەریش (سبحانە وتعالـی) ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ.

هەندێکی دیکەش لە توێژەرەوانی قورئان بەسە هاتێکی دیکەیان گێڕاوەتەوە کە بۆتە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە و دەڵێن:

ڕۆژێك (أبو ذر الغفاري) بە (بلال الحبشي) خوا لـێیان ڕازی بێ، گوت: (یا ابن السوداء) واتە ئەی کوڕی ئافرەتە ڕەشەکە!، (بلال)یش وەڵامی نەدایەو چوو بۆ لای پێغەمبەر و ﷺ و مەسەلەکەی پێ ڕاگەیاند، ئەویش (أبو ذر)ی بانگ کرد کە هەرچەند پیاوێکی چاك و ڕاست ومسولْمانێکی تێر و تەواویش بوو، فەرمووی: (( **یا أبا ذر ! إنك آمرؤ فیك جاهلیـــة**)) رواه البخاري واتە:

---

(339) أخرجه ابن أبي حاتم عن أبي مليكة، (أسباب النزول) للسيوطي.

(340) رواه احمد .

ئەی ئەبوو زەڕ تۆ پیاوێکی (نەفامێتی)ت تێدایە، واتە: ئەو خۆهەڵکێشانەت بە ڕەنگی سپی یەوە کە ئازایەتی خۆتی تێدا نیە و، توانج گرتنت لە (بیلال) بەهۆی ڕەنگی ڕەشـــی یەوە کە خەتای خۆی نیە ، ئەوە جۆرێك نەفامـــی یە، ئینسان هەرگیز نابێ خۆی هەڵکێشێ و بە خۆی بنـــازێ، بەڵام ئەگەر هەر خۆیشی هەڵکێشا، دەبێ بە شتێکەوە بێت کە بە ئازایەتی و دەستی خۆی بە دەستی هێنابێ، ڕەگـــەز و ڕەنگ و زمـــان و تیرە و تایەفە، نە تۆ ئازایەتی خۆتن نە ئەویش خەتـای خۆیەتی،کەواتە: نە بۆ تۆ (فضـــیلة)ن و نە بۆ ویش (نقیصة)ن! واتە بە هۆی ئەمانەوە چاکە و خراپە ڕوو لە کەس ناکەن .

## ((بنچینەی هەشـتەم))

ئەم بنچینەیەش لە ئایەتی ژمارە (14) وەردەگیرێ کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَتْ الأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلْ الإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ وَإِنْ تُطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ لاَ يَلِتْكُمْ مِنْ أَعْمَالِكُمْ شَيْئًا إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ واتە: عەرەبە خێڵەکی یەکان گوتیان ئیمانمـــان هێنا، پێیان بڵێ ئیمانتان نەهێناوە، بەڵام بڵێن مسوڵمان بووین، جارێ ئیمان نەچۆتە نێو دڵتانەوە، وە ئەگەر گوێ ڕایەڵیی خوا و پێغەمبەرەکەشی بکەن هیچ لە کردەوەکانتان کەم ناکاتەوە، بێ گومان خوا لێبوردە و بەخشندەیە.

لە ئایەتی پێشتردا خوای پەروەردگار سەرنجی ڕاکێشاین کە دەبێ خۆمان بە ڕەچەڵەك و ڕەگەز و ڕەنگ و ئەو شتانەوە هەڵنەکێشین و تەرازووی گرانی و سووکی و گەورە و بچووکی تەنیا پارێزکاریی (تقوی) و دینداریـــــــی و مسوڵمانەتی و بۆ خوا گونجانـــە، چونکە ئەگەر خۆ هەڵکێشان بە ڕەگەزەوە

بەردەوام بێت ســـــەرەنجامی ڕەگەز دەچێتەوە سەر (ئادەم و حەووا)، ئەوانیش چەند باوك و دایكی تۆن ئەوەندەش باوك و دایكی بەرانبەرەكەتن.

وە لەم ئایەتەی ئێســـتاش دا خوای دادگەر (سبحانە وتعالــی) ئەوەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە كە هیچ كەسێكیش بە دینــداریی و مسوڵمانەتی یەوە خۆی هەڵ نەكێشێ، چونكە ئەوانەی بە دینداریی و ئیــش و كار و خزمەتێكیان بۆ ئیسلام لە خۆبایی دەبن و لاف و گەزاف لێ دەدەن بە زۆری وایە كە مسوڵمانی باش نین و ئیمانەكەیان بە قووڵی نەچۆتە نێو دڵ و دەروون، بۆچی؟! چونكە ئەگەر تاعەت و چاكەت بۆ خوا كردوە نابێ باسی بكەی، چونكە بۆ كەسێكت كردوە كە لە هەموو كەس باشتر دەتوانێ پاداشت بداتەوەو لە هەموو كەسیش باشتر ئاگای لــێیە، هەر كەسێك كارێكی باشی كرد و بۆ خەڵكی باسی كرد دیارە زۆر بە ڕاستی بۆ خوای نەكردووە، بۆیەش خوای پەروەردگار لە سوورەتی (البقرة) دا دەفەرمـــــــوێ: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُمْ بِالْمَنِّ وَالأَذَى ﴾ واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێنـــاوە خێر و چاكەكانتان بە منەت كردن و ئازاردانی دڵی بابای خێر پێ كراو هەڵمەوەشـــێننەوە.

بەڵێ بەڕێزان! لە ڕوانگەی ئیسلامەوە هیچ كەس بۆی نیە خۆی بە كردەوە چاكەكانی یەوە هەڵكێشێ، كەواتە ئێستا ئێمە وەك كۆمەڵ و بزووتنەوەیەكی ئیســـــلامی بۆمان نیە خۆمان بەسەر فلان و فیسار لایەنی ئیسلامی دا یان بەسەر مسوڵمانان و خەڵكی دیكەدا هەڵكێشـــــین و پێیان بڵێین: ئێمە واو وامان كردوە و وەختێك كە ئێمە كاری ئیســـــلامیمان دەكرد تۆ هەر لە ئارادا نەبووی !!، چونكە ئەو قسانە ئەگەر حەقیقەت و واقیعیش بن هەر باش نین و پێویستە ئینسان بەو شتانەوە كە بە حیساب بۆ خوا دەیانكات هەرگیز خۆی هەڵنەكێشێ و باسیشیان نەكات، چونكە بێگومان پەروەردگار بینیویەتی و

دەیبینێ و پاداشتیشی لەسەر ئەو شتانە دەداتەوە، هەڵبەتە جاری وا هەیە ئەگەر حاڵ و مەقام پێویست بکات لەبەرئەوەی شوێنەکە تۆ ناناسن یان وا پێویست دەکات شتێکیان بۆ ڕوون بکەیەوە، یان بۆ ئەوەی دەرس و پەندی لێ وەربگرن، لەو حاڵەتانەدا حوکمەکـــەی جیایە، بەڵام دیارە ئەوەش دەبێ بە گوێرەی پێویست بێ و دەبێ ئینسان وریای نیاز (نیة) ەکەشیی بێ.

((**بنچـینەی نۆیـــەم**)):

لە بواری دینداریی دا ترازوو پێوەر بریتـــــی یە لە ئیمانی تێر و تەواوو دامەزراو جەنگ و جیهاد و فیداکاریی بەسەر و ماڵ و لە پێناوی خوادا:

ئەم بنچینەیەش لە ئایەتی ژمارە (15) وەردەگیرێ کە دەفەرموێ: ﴿ **إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَئِكَ هُمْ الصَّادِقُونَ** ﴾ واتە: بێ گومان بڕواداران تەنیا ئەو کەسانەن کە بڕوایان بە خوا و پێغەمبەرەکـــــەی هێناوە و پاشان لەو بارەوە نەکەوتوونە هیچ دوو دڵییەکەوە، وە بە سامان و گیانی خۆیان لە پێنـــاوی خوادا تێکۆشاون و جەنگیان کردوە ئائەوانەن ڕاستان.

پوختەی واتا و چەمکی ئەم (بنچینە)یەش ئەوەیە کە: (وەك چـــۆن لە بواری کۆمەڵایەتی دا پێوەر و تەرازووی ڕێز و حورمەت و پلە و پایە تەنهـــا و تەنها بریتی یە لە پارێزکاریی (تقوی) ، لە بواری خواپەرستیی دینداریش دا لاف و گەزاف وقسەی ڕووت هیچ نیە، بەڵکو تەرازوو و پێوەری خواپەرستیی و دینداریی بریتی یە لە ئیمانی تێـــر و تەواو و دامەزراوو، جەنگ و جیهاد و خەبات و فیداکاریی بە سەر و ماڵ لە پێناوی سەرخســـتن و چەسپاندنی بەرنامەی خوادا).

کەواتە: ئەگەر بە پێی ئەو تەرازوو و پێوەرە دەرچووی بۆت هەیە دڵت بە خۆت خۆش بێ و شاییت بە خۆت بێت، بەڵام خۆتی پێوە هەڵ مەکێشـــە، بەڵکو ستایشی خوا بکە و سوپاسی بکە، بەڵێ لەم ئایەتەدا خوای پەروەردگار سەرنجمان بۆ لای ئەوە ڕادەکێشێ کە چ شتێك جێگای دڵ پێ خۆش بوونی ئینسانی مسوڵمانە و پێویستە سوپاس و ستایشی خوای لەسەر بکات، چونکە بەڵگە و شایەدیی دینداریی و مسوڵمانەتیی ڕاستەقینەیەتی:

یەکەم: ئیمانی نە لە خشاوو تەواو.

دووەم: جیهاد و جەنگ و فیداکاریی و لـێ بڕانێکی زۆر باش، لە پێناوی خوا (سبحانه وتعالى) و ئایین و بەرنامەکەی.

وە خوای پەروەردگـــار لە بەرانبەر ئەوەدا دەفەرموێ: ﴿ **أُوْلَئِكَ هُمْ الصَّادِقُونَ**﴾ ئا ئەوانەن ڕاستان، یانی غەیری ئەوانە درۆ دەکەن لە ئیدیعای مسوڵمانەتیی و دینداریی دا! ، ئینجا سەیری ئەوەش بکەن کە ســـەرەتا دەفەرموێ : ﴿ **آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا** ﴾ بڕوایان بە خـــوا و پێغەمبەرەکـــــەی هەیە و هیچ گومان و دوو دڵیشیان نەماوە، پاشان دەفەرموێ : ﴿ **وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ** ﴾، بە ماڵ و گیانیان لە ڕێی خوادا تێکۆشاون، چونکە تا ئەو ئیمانە تێر و تەواوو نە لەخشـاو و دامەزراوە نەبێت، ئەو جیهاد و جەنگ و لێبڕان و فیداکارییە نایەتە دی، ئینجا ئەو جۆرە ئیمان و فیداکارییەش نیشـــانەی ڕاستی و ساغی یە لەگەڵ خوادا.

(( **بنچـینەی دەیەم** )):

منـــــەت کردن بەسەر خەڵکی دا بەهۆی ئەنجامدانی کارو چالاکـــــی ئیسلامەتییەوە وێڕای بێ ئەدەبیی لەگەڵ خوادا نیشانەی ڕووکەش بوون و بێ کاکڵیی مسوڵمانەتییشــــــە: ئەم بنچینەیەش لە ئایەتەکانی (16-17) وەردەگیرێ کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ **قُلْ أَتُعَلِّمُونَ اللَّهَ بِدِينِكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ(16)يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُلْ لَا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُمْ بَلْ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ** ﴾ واتە: پێیان بڵێ ئایا ئێوە دینداریی خۆتان پێشانی خوا دەدەن و خوا لە دینداریی خۆتان ئاگادار دەکەنەوە، لە کاتێك دا کە خوا (سبحانه وتعالـی) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە دەیزانێ وە خوا بە هەموو شتێك زانایە؟! ئەوانە منەتت لەسەر دەکەن کە مسوڵمان بوون، پێیان بڵێ ئیسلامەتی یەکەتان لەسەر من مەکەنە منەت، بەڵکو خوا منەت بەسەر ئێوەوە هەیە کە هیدایەتــی داون بۆ ئیمان، ئەگەر لە ئیمانەکەتان دا ڕاســت بکەن ! .

پوختەی چەمك و واتای ئەم (بنچینـــــە)یەش ئەوەیە کە (لاف لێدان و منەت لەسەر خەڵکی کردن بەهۆی ئەنجامدانی ئەرکەکانی مسوڵمانەتیی و کارو چالاکی یەکانی ئیسلامەتی یەوە، وێڕای بێ ئەدەبیی کردن لەگەڵ خوادا، بەڵگە و نیشانەی ڕووکەش بوون و بێ کاکڵ بوونی دینداریی و مسوڵمانەتیی ئەو جۆرە کەسانەشە).

بەڵێ بەڕێزان ! هەر کەسێك بە هۆی کار و جێبەجێ کردنی ئەرکێکـــی شەرعیی و ئەنجامدانـــی کار و چالاکی یەکی ئیسلامییەوە لاف و گەزاف لـێ بدات و بەچاوی خەڵکی دا بداتەوە و باسی شان و شەوکەتی خۆی بکات، ئەوە هەروەك چۆن ئەو ڕەفتارەی بێ ئەدەبـی یە لە خزمەت خوادا، بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە ئەو شتەی کردوویەتی شتێکی ڕووکەشیی و ڕواڵەت و بێ ڕووح و بێ جەوهەرە، چونکە ئەگەر کاکڵ و نێوەڕۆکی تێدا بایە ئاوا باسی نەدەکرد و پێی لە خۆی بایی نەدەبوو و بەسەر چاوی خەڵکی دا نەدەدایەوە، هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانەش وەك توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە ئەوەیە کە کاتی خۆی عەرەبە خێڵەکی یەکان (الأعراب) دەهاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و منەتیان بەسەردا دەکرد و دەیانگوت: ئەی (مُحَمَّدْ) ! ئێمە مســــــوڵمانین و مسوڵمان بووین لە کاتێك کە خەڵکی دیکە دژت دەوەستن و شەڕت لەگەڵ دادەکەن ! جا هەڵبەتە بە درێژایی مێژووش خەڵکی لەو بابەتە هەر بوون و دەبن و ئەم ئایەتانەش ترازووی هەڵسەنگاندنیانن.

## (( بنچــینەی یازدەیەم )):

خوای بەرزو مەزن (سبحانە وتعالی) نهێنییەکانی ئاسمان و زەوی دەزانێ و هیچ شتێکی لێ پەنهان و شێرراوە نیە و هەمیشە دەرو دەروونی بەندەکانی و هەست و نەست و کردەوەکانیان دەبینێ: ئەم بنچینەیەش لە ئایەتی ژمارە (18) ی کۆتایی وەردەگیــرێ خوای پەروەردگار دەفەرمــوێ : ﴿ **إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ** ﴾ واتە: بێ گومان خوا نهێنی ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ، وە خوا بینایە بەوەی ئەنجامی دەدەن. پوختەی

چەمك و نێوەڕۆكی ئەم (بنچینە)یەش كە لەم ئایەتە وەردەگیــــرێ ئەوەیە كە هەمیشە ئەو ڕاستییەمان لە بەرچاو بێ كە خوای بەرز و مەزن و پەنهان بین (سبحانە وتعالــی) ورد و درشتی ئەم بوون (وجود)ە سەر لەبەری دەبینـــێ و هیچ شتێكی لــێ شێرراوە و پەنهان نیـــە و دەزانێ هەر كەسێك چی دەكات و چۆنی دەكات و بۆ كێ‌ی دەكات ؟!

كەواتە پێویستە هەموو كاتێك زۆر وریا و بێدار بین لەوەی كە چی دەڵێین و چی دەكەین و دڵنیابین كە خوای بێ وێنە و هاوتا هەمیشـــە و ئاگای لێمانە و دەمانبینێ.

ئەمە (بنچینە)ی كۆتایی پەروەردە بوون و بنیاتنـــــــــانی كۆمەڵ و كۆمەڵگایەكی ئیسلامی یە كە تاكەكانی هەمیشە هەست بە چـــاودێری خوا بكەن، وە ســـوێند بە خوا ئەگەر ئینســان تەنیا ئەم ئایەتە جێبەجێ بكات خەتێ خوار ناكات !، كەسێك بزانێ كە خوا نهێنی یەكانی ئاسمانەكان و زەوی دەزانێ و بە ڕاستیش ئیمانی بەو ڕاســـتییە هەبێ كە خوای پەنها بین هەرچی نهێنی هەیە دەیزانێ، كە یەكێك لە نهێنی یەكانی نهێنی نێو دڵی خۆیەتی، چۆن چۆنی زات دەكات بە جۆرێك هەڵس و كەوت بكات كە مایەی تووڕەیی خوا بێت ؟!

خوای كاربەجێ (سبحانە وتعالــی) لە جێیەكی دیكەدا دەربارەی ئاگادار بوونی لە نهێنی یەكانی دڵان فەرموویەتی:﴿ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴾[341] وشەی (ذات) واتە (صاحب) هاوەڵ، خـاوەن، (ذات الصدور) واتە: هاوەڵی یان خاوەنی سینەكان، دیارە ئەو نهێنی یانەی كە لە دڵەكـــــانـدا هەن ئەوەندە

---

(341) الملـك (13) .

پەنهانن و ئەوەندەش گرنگن وەك هاوەڵی یان خاوەنی دڵەكـان بن وایە، چونكە (صاحب) هەم بە مـانای خاوەن دێت، هەم بە مـانای هاوەڵ و برادەر (رفیق)یش دێ، نهێنییەكانیش هەم زۆر ڕەفیق و هاودەمی دڵەكانن و هەم خاوەنیشیانن، بەڵام خوای پەروەردگار پێیان ئاگادارە، ﴿ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ خوای باڵا دەست بەوەی كە دەیكەن بینایە،نەك هەر بە ڕواڵەتەكەی بەڵكو نیەتەكەشتان دەبینێ و دەزانێ كە چ شتێك پاڵی پێوە ناون ئەو كارە ئەنجام بدەن.

ئینجا لە ڕاستی دا هەر كۆمەڵ و كۆمەڵگایەكی ئیسلامی ئەگەر لەسەر ئەم حەقیقەتە دڵنیایی (یقین)ی بۆ دابمەزرێ و هەمیشە هەست بە چاو دێریی خوا بكات و بزانێ هەموو شتێكی تۆمار دەكرێ لە نیاز و مەبەسـت و قسە و كردەوە بە ورد و درشتەوە و بە ئاشكرا و پەنهانیشەوە، ئەوە بێگومـان چ وەك كۆمەڵ و كۆمەڵگا بە گشتی و، چ تاكە تاكەشیان هەرگیز لانـادەن و خەتێ خوار ناكەن و قسەی خراپ و لار ناكەن و هەڵوێستی نالەبار نانوێنن، چونكە پێش ئەوەی حساب بۆ خەڵكی بكەن، حساب بۆ خوا و چاودێریی خوا دەكەن.

وەك دەڵێن جارێك یەكێك لە زانایان سێ جار پرسیارێكیان ئاڕاستە كرد، بەڵام وەڵامی نەدایەوە، پاشان گوتی: بۆیە وەڵامی ئەو پرسیارەیانم نەدایەوە چونكە وەڵامی هەر پرسیارێكم دابێتەوە لە ژیانم دا ، وەڵامێكیشم بۆ قیامەت ئامادە كـردوە كە بە فلانە بەڵگە و (دلیل)ە وەڵامم داوەتـەوە، بەڵام بۆ ئەم پرسیارەی كە وەڵامم نەدایەوە هیچ وەڵامێكی قیامەتیم پێ نەبوو !!

كۆتایی بەشی یەكەم:

سبحانك اللهم وبحمدك اشهد الا اله الا انت استغفرك واتوب اليك.

دوا پێداچوونەوە: 16/صفر/1427

16/3/2006 هەولێر

# نێـــوەڕۆك

# ئەم کتێبە

لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و فراوانە دەربارەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی
گومانیش لەوەدا نییە کە ئیمان و عەقیدە لە ئیسلامدا وەک بناغە بۆ دیوار و
ڕەگ و ڕیشە بۆ درەخت و هەوێن بۆ ماست و هەناو بۆ ئینسان وایە !
بۆیە هەر کەسێک بیەوێ مسوڵمانەتی و دیندارییەکی ڕاست و ڕەسەن
دەبێ لە ئیمان و عەقیدەوە و بنیاتنانی لە عەقڵ و دڵیدا دەستپێبکات !
وە هەرگەل و میللەتێک بیەوێ ژیان و گوزەرانی خۆی بە پێی شەریعەتی
خوا پاکسازیی و چاکسازیی بکات و ڕێگەی نجاتی پێویستە لە ڕاستکردنەوەو
بژارکردن و چەسپاندنی ئیمان و عەقیدە دەست پێ بکات .
پێشم وایە ئەم کتێبە بە هەر شەش بەرگەکەیەوە هاوکارێکی باش و
جێی متمانە و پشت پێ بەستنە بۆ هەر تاک و کۆمەڵێک بیەوێ
دەست بە گۆڕانکاریی و پاکسازیی و چاکسازییە بکات .

عەلی باپیر





**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پاڵاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice








7000 دینار